ڕەسوول هەمزەتۆڤ

# داغستانی من

کتێبی دووەم

عەزیز گەردی

لە ئینگلیزیەوە کردوویە بەکوردی

رەسووڵ هەمزەتۆڤ

# داغستانی من

کتێبی دووەم

عەزیز گەردی

لە ئینگلیزیەوە کردوویە بەکوردی

بەغدا ـ چاپخانەی ( الحوادث ) ـ ١٩٨٥



# له باتی پێشه‌کی



**شامیل سالی ١٨٤١ گوتوویه‌تی :**
**« گه‌لی بچووك پێویستیان به خه‌نجه‌ری تیژ هه‌یه » .**
**ئه‌بوتالیب سالی ١٩٤١ گوتوویه‌تی :**
**« گه‌لی بچووك پێویستیان به براده‌ری دلسۆز هه‌یه» .**

● ★ ●

باوکم ده‌یگوت : « ده‌شێ کلیلی بچووك سندووقی گه‌وره بکاته‌وه . » دایکیشم چیرۆکی کورتی ده‌گێڕایه‌وه : « ئایا ده‌ریا گه‌وره‌یه؟ به‌ڵێ زۆر گه‌وره‌یه . باشه له‌کوێوه هاتوه ؟ ته‌یرێکی بچووك ده‌نووکی بچووکی له زه‌وی داو کانیه‌کی لێ‌ده‌ربوو ، کانیه‌که هه‌ر هه‌ڵقولاو هه‌ڵقولا تا بوو به‌و ده‌ریا گه‌وره‌یه » .

کاتێ کە گەمەم دەکردو تا سوور هەڵدەگەڕام و شل و شەکەت دەبووم بەم لاو بەو لادا غارم دەدا ، دایکم دەیگوت : « پێویستە بەلانی کەمەوە بە قەد ماوەی هەڵدان و گرتنەوەی تەپلەیەك پشوو بدەی . نەختێ هێمن بە ! »

هەموو کەس دەزانێ کە زەویەکت کێلا ، گرنگ نیە زەویەکە هەر چەند بچووك بێ و پاشان بتەوێ زەویەکیدی بکێڵی دەبێ یەکەمجار لەسەر تخووبەکە نەختێ پشوو بدەی .

ئاخۆ ماوەی نێوان دوو کتێبیش وەکو تخووبی دوو زەوی نیە ؟ هەر بۆیەش لەسەر تخووب ڕاکشام و لێم پاڵدایەوە ، ئەوانەی بەلامەوە تێدەپەڕین دەیانگوت : « جوتیار ماندوو بوە ، خەوتوە ! »

تخووبی من وەکو دۆڵی نێوان دوو گوندی شاخاوی وا بوو ، یا وەکو گوندێکی سەر گردی بەینی دوو شیو وا بوو .

تخووبی من بریتی بوو لە سنووری نێوان داغستان و هەموو بەشەکەیتری دونیا . لەسەر ئەو تخووبە ڕاکشام بەڵام نەنووستم ! وەکو پیرە ڕێویەکی بۆر پاڵم دایەوە کە ڕەوە بارەکەوێکی لە نزیك بلەوەڕێ . چاوێکم نیوەقوچا بوو ، چاوەکەیترم نیوەکرابوەوە . گوێیەکم خستبوە سەر لەپێك و لەپەکەیترم خستبوە سەر گوێیەکەیتر . جاروبار ئەم لەپەی دوەمینم نەختێ بەرز دەکردەوەو گوێم ڕادەدێرا . ئایا کتێبی یەکەمم بە خەڵك گەیشتوە ؟ ئایا خوێندوویانەتەوە ؟ لێی دواون ؟ دەبێ چی دەرهەق بڵێن ؟!

جاڕچی گوند کە لەسەر بانێکی بەرز جاڕ دەدا تا مسۆگەر نەبێ بانگی یەکەمی بیستراوە ، بانگی دوەم ڕانایەڵێ . کە جاییەك بە

کۆلانێدا دەڕوا ئەگەر بینێ میوانێك بە ڕووگرژی لە ماڵێك دێتە دەرەوە ، ئاخۆ قەت سەر بەو ماڵەدا دەکات ؟

لەسەر تخووبی نێوان دوو کتێب ڕاکشام‌و بیستم زۆر کەسی جۆر بە جۆر بە زۆر شێوەی جیاجیا کتێبی یەکەمیان وەرگرتووم •

هەر چۆن بێ ، ئەمە شتێکی ئاساییە • هەیە حەزی لە سێوەو هەیە حەزی لە گوێزە • تۆ سێو سپی دەکەی بەڵام گوێز دەشکێنی ، گندۆرەش تۆوی لێ پاکژ دەکەیتەوە • بەم جۆرەش هەر کتێبەو چەشنە بۆچوونێکی دەوێ • جوان نیە گوێز بە قەڵەمبڕ بشکێنی ، دەبێ گوێزشکێنت هەبێ ، بەڵام‌ناتوانی سێوی تەڕو ناسك بەم گوێزشکێنە قاش بکەی •

هەر کەسێ کتێبێك بخوێنێتەوە عەیبێکی لێ دەگرێ • چ قەیدیە ! نەك کتێبەکەی من ، وەکو پەندەکە دەڵێ : « کچە مەلاش بێ عەیب نابێ ! »

لەگەڵ ئەمەش‌دا ، ماوەی پشوودانم تەواو بوو • وا دەست بە کتێبی دوەم دەکەم • نازانم چەند کەس دەیخوێنێتەوە • ئەندازەی چاپ هیچ نیە • کتێب هەیە سەد هەزار دانەی لێ‌چاپ دەکرێ‌و لە دوکان‌و کتێبخانەکان تۆزی لێ‌دەنیشێ‌و کەس نایخوێنێتەوە • بە پێچەوانەی ئەمەوەش وا دەبێ یەك دانەی کتێبێك دەستاو دەست بڕوات‌و زۆر کەس بیخوێنێتەوە • من هیچێکم لەمانە ناوێ • تەنیا یەك کەس کتێبەکەم بخوێنێتەوە بەسمە • دەمەوێ باسی وولاتە بچووك‌و سادەو سەرفیرازەکەم بۆ ئەو تاکە کەسە بکەم : وولاتەکەم کەوتۆتە کوێ ؟ خەڵکەکەی بە چ زمانێك دەدوێن ؟ باسی چ دەکەن ؟ و چ گۆرانیەك دەڵێن ؟

•

من ناتوانم به تەنێ باسی هەموو شتێك بكەم • پیرەمێردەكان دەڵێن :
« تەنیا به هەموو لایەك هەموو شت باس دەكرێ • هەر كەس باسی شتی خۆی بكا ، هەموو شت باس دەكرێ • هەر كەس خانووی خۆی دروست كردوە ، ئەنجام گوند پەیدا بوە ، هەر كەسە زەوی خۆی كێڵاوە ؛ بەمەوە سەراپای زەوی بۆتە كرتو كێڵ • »

جا ئێستا وا زوو لە خەو هەستاوم • ئەمڕۆ ڕۆژی یەكەم دێرە جووتمە • دێری نوێی زەویەكی بەیار • بە گوێرەی دەستووری كۆن ، ڕۆژی وا ، دەبێ مێزەكەم حەفت شتی بەسەرەوە بێ كە هەموو سەرەتایان یەك دەنگە •• تەماشای سەر مێزەكەم دەكەمو دەیانبینم :

١ ـ كاگەت ( كاغەز ـ سپی تۆخ )
٢ ـ كەرەنداش ( پێنوس ـ ی تیژ )
٣ ـ كارتۆچكا ( وێنە ـ ی دایكم )
٤ ـ كارتا ( نەخشە ـ ی وولاتەكەم )
٥ ـ كۆفی ( قاوە ـ ی ڕەشو گران )
٦ ـ كۆیناك ( ـ ی داغستانی ، پێنج ئەستێرە )
٧ ـ كازبێك ( جگەرە ) •

ئەگەر ئێستا كتێب نەنووسم كەی دەینووسم ؟
ئاگر گەش دەسووتێ : كتلی لەسەر كوڵانە •

لە دەرەوە ڕۆژ لەناو بارانێكی نازداردا دەبریسكێتەوە ، دەڵێن ، ڕۆژی وا ، هەموو گیاندارەكان لە شاخان ، وەكو پاڵەوانی تەنافباز لەسەر پەلكەزێڕینەی حەفت ڕەنگدا دەكەونە هەلەكەسەما • ڕۆژی وا : دایكم دەیگوت تیشكی ڕۆژ دەرزیەو ئاسمان بە داوەباران دەدوورێ •

ئەمڕۆ بەهار هاتۆتە ناو شاخان ــ یەکەم ڕۆژی بەهارە • ئەویش وەکو من دەست بە خەتەجووتێکی نوێ دەکات •

« بەهاری داغستان ! پێم بڵێ ئەو حەفت بەهرانە چین کە تۆ هەتەو هەموو سەرەتایان یەك دەنگە ؟ » بەهار وەڵام دەداتەوە : « ئەو بەهرانەی من هەمە داغستان پێی بەخشیومن • وا من ناویان دێنمو تۆش بە پەنجەکانت بیانژمێرە :

١ ــ تسیا ــ ئاگر • بۆ ژیان ، بۆ ڤینو ئەڤین •
٢ ــ تسیار ــ ئاو • بۆ سەربەرزی ، بۆ نەبەردی ، بۆ ناونانی پیاو •
٣ ــ تسیام ــ خــوێ • تا تام بە ژیان بدا ، نرخ بە ژیان بدا •
٤ ــ تسیڤا ــ ئەستێرە • بۆ هیواو خەباتی پیرۆز ، بۆ ئامانجی بەرزو ڕێگای ڕاست •
٥ ــ تسیوم ــ هەڵۆ • بۆ نموونەو سەرمەشق •
٦ ــ تسیومور ــ زەنگ • بۆ بانگ‌کردنی هەموو لا بۆ یەك شوێن•
٧ ــ تسیالکیو ــ بێژنگ • بۆ لێك‌جوداکردنەوەی گەنمی قەڵــەوو کاوکۆتی بێ‌سوود •

داغستان ! ئــەم حەفت شتە حەفت چلن بە درەختی چەسپاوتەوە • هەموویان بە ڕۆڵەکانی خۆت‌و بە من ببەخشە • من دەمەوێ ببم بە ئاگرو خوێ ، هەڵۆو ئەستێرە ، زەنگ‌و بێژنگ ، دەمــەوێ ناوێکی پیرۆزیشم هــەبێ •

سەر هەڵدەبرم دەبینم ئاسمان لە ڕۆژو باران ، لە ئاگرو ئاو چنراوە• دایکم هەمیشە دەیگوت : داغستان خۆی لە خەوندا لــە ئاگرو ئاو خەلق بوە •



## باوكو دايك
## ئاگرو ئاو

**باوكم دەیگوت : « یاری بە ئاگر مەكە ! »**
**دایكم دەپاڕایەوە : « بەرد مەهاوێ نا ئاو ! »**

هـەر كەسـە بە جۆرێ دایـكی خۆی دێتەوە یاد . دایكی مـن بەیانیو پاش نیوەڕۆو ئێواران چۆن بوو ، من وام دێتەوە یاد .

سبەینان لەسـەر كـانی دەهاتەوەو جەرەئاوێـكی دەهێنا . وەكو شتێـكی زۆر بەنرخ هـەڵیدەگرت . بەسـەر قادرمـەی بەردینـدا سەردەكەوتو جەڕەكـەی لەسـەر زەوی دادەناو ئاگری لە ئاگرداندا دەكردەوە . وەك ئەوەی ئیشێـكی زۆر پیـرۆز بـكا ، ئاوا ئاگری دادەگیرساند ، بە ڕێزو سۆزو خۆشەویستیەوە تێیڕادەما . كـە ئاگرەكە

باش دەسووتا ، لانـکی ڕادەژەند . وەك شتێکی زۆر بەنرخ بـکا ، ئاوا ڕایدەژەند . نیوەڕۆ دوبارە جەڕەی هەڵدەگرتو دەچوە سەر کـانی ، ئاگری دەکردەوە ، لانـکی ڕادەژەند . ئێواری دیسان ئاوی بە جـــەڕە دەهێنا ، لانـکی ڕادەژەند ، ئاگری هەڵدەکرد .

هــەموو ڕۆژێ ئەمە کاری بوو ؛ بەهارو هاوینو پایزو زستان . بەبێ ئەوەی خۆی تەنـگاو بـکا ، بە گرانو سەنگینی ، وەك شـــتێکی بەنرخ ئـەم ئیشانەی دەکرد : دەچـوە سـەراوێ ، لانـکی ڕادەژەند ، ئاگری دەکردەوە . ئاگـــری دەکردەوە ، دەچوە سەراوێ ، لانـــکی ڕادەژەند . لانـکی ڕادەژەند ، ئاگری دەکردەوە ، دەچوە سەراوێ .

من ئاوهـا دایـکم دێتەوە یاد . کە دەچوە سەراوێ پێی دەگوتم : « چاوت لە ئاگر بێ » ، کە ئاگری دەکردەوە ، دەیگوت : « بێ لە جەڕە نەدەی ، ئاوەکە بڕێژی » ، کـە ڕایدەژەندم بخـــەوم ، دەیـــگوت : « باوکی داغستان ئاگرە ، دایکی داغستان ئاوە » .

ڕاستیەکەی چیاکانمان وەکو ئاگری سوور وان . کەواتە با نەختێ باسی ئاگر بکەین :

**بەردێك بە بەردێك دادە ، پرۆشکە ئاگری لێدەبێتەوە .**
**گاشەیەك بە گاشەیەك دادە ، پرۆشکە ئاگری لێدەبێتەوە .**
**ناولەپ لە ناولەپ بخشێنە ، پرۆشکە ئاگری لێدەبێتەوە .**
**ووشە بە ووشە دادە ، پرۆشکە ئاگری لێدەبێتەوە .**
**پەنجە بە ژێی تەنبوور دابێنە ، پرۆشکە ئاگری لێدەبێتەوە .**
**تەماشای چاوی زوڕناژەنو گۆرانیبێژ بکە ، پرۆشکە ئاگری تێـدا دەبینی .**

هەتا تەپڵەش کە کڵاوێکی قووچی کەوڵەمەڕەو چایی لە سەری دەنێن ، وەك ئاگر دەبریقێتەوە ، بە تایبەتی ئەگەر دەستی پێدا بێنی .

کە چایەك بە تەپڵەوە دەچێتە سەر بان بەفری سەر چیاکانی ئەم دەوروبەرە دەکەوێتە توانەوە .

بەفر خۆیشی ئاورێکی لێدەبێتەوە . شاخی بزنەکێوی کە لەگەڵ کازیوەی بەیاندا لەسەر لووتکە شاخێك دەوەستێ وەك ئاگر دەبریسکێتەوە . چیاش دوور بە دووری ، لە کاتی خۆرئاوابووندا ، لەناو ئاگری قورمزیدا دەتوێتەوە .

ئاگر لە ناو پەندو گۆتەی شاخاندا هەیە ، لەناو فرمێسکی ژنە چایاندا هەیە ، لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگدا هەیە ، لەسەر دەمی خەنجەری لە کالان دەرکێشراودا هەیە؛ بەڵام گەرمترین‌و بەسۆزترین ئاگر لە ناو دڵی دایکان‌و لەناو کوچکاگری هەموو کوخێکدایە .

کە چایەك بیەوێ بە خۆیەوە بپەسنێ دەڵێ : « هێشتا بۆ ئاگر نەچوومەتە لای هیچ کەس ! »

کە چایەك بیەوێ زەمی پیاوێکی وا بکا چاکەی لێ نەوەشێتەوە ، دەڵێ : « کادووی دووکەڵکێشیان وەکو کلکە مشك وایە . »

کە دوو پیرەژنی چایی بە شەڕ دێن ، یەکێکیان دەقیژێنێ : « یاخوا قەت ئاگر لە ئاگردانتاندا نەسووتێ . » ئەوەی‌دیش وەڵامی دەداتەوە : « یاخوا ئاگردانتان کوێر بێتەوە ! »

ئەگەر باسی کابرایەکی زۆر ڕەشیدو ئازا بکەن ، دەڵێن : « بڵێسەی ئاگرە . »

باوکم دوای ئەوەی کــە گوێی دایە شیعری ساردو سڕی لاوێك ، گوتی : « دیارە هــەموو شتێکی تێــدایە • بەڵام وا دەبێ تۆ خانوویەکت هەبێ ، خانوەکەت ئاگردانو دارودووو مەنجەڵی تێدا بێ ، مەنجەڵەکـە گۆشتیشی تێــدا بێ بەڵام ئاگری تێــدا نەبێ • خانوەکەت ساردو سڕە : مەنجەڵەکە ناکوڵێ ، گۆشتەکە هەر خاوە • کــە ئاگر نەبێ ژیان نابێ • شیعرەکەی تۆیش ئاگری تێدا نی‌یە • »

جارێــکیان لــــە شامليان پرسی : « ئیمــام ، ئەرێ ئەوە داغستانی نیوەبرسی چۆن توانیویە سەدان ساڵ بەری هێرشی وولاتە گەورەکــان بگرێو لێیان بڕسێتەوە ؟ ئەرێ ئەوە چـــۆن توانی قەیرانی سی ســـاڵ لەگەڵ قڕاڵی بەزەبرو زەنگدا بجەنگێ ؟ »

شامیل وەڵامی دانەوە : « ئەگەر داغستان ئاگری ڕقو خۆشەویستی لــە دڵدا نەبایە ، هــەرگیز ئــەم خەباتە سەختەی پێنەدەکرا • ئەم ئاگرە موعجیزەی نواندوەو زۆر دەسکەوتی گەورەی هێناوەتە کایە • ئەم ئاگرە گیانی داغستانە ، هەر داغستان خۆیەتی • »

شامیل پێدا چوو : « من کێم ؟ کوڕە ڕەزەوانێکی گوندی «گمری»م• نە لە کەس کەڵەگەتترمو نە لە کەس بە شانو شەوکەتترم • بە منــداڵی زۆر چرووكو بێنموود بووم • کــە چاویان بە من دەکــەوت ســەریان بادەدا گوایە بۆ ئەم دونیایە دەست نادەم• یەکــەم جــار ناوم عــەلی بوو ؟ بەڵام کە نەخۆش کــەوتم ناویان گۆڕیمو کردیان بە شامیل بەو ئومێدەی نەخۆشیەکەم لەگــەڵ ناوە کۆنەکەدا بڕوا • لــەم دونیــا گــەورەیەدا هیچم نەدی • لە شار گــەورە نەبووم • چ مولكو سامانم کۆنەکردەوە • لە «مەدرەسە»ی گوند خوێنــدم • دایكو باوکــم خۆخی «گمــری»ی خۆمانیان بۆ لــە کەر بار دەکردمو ڕەوانەی بازاڕی تەمەرخان شورایان

دەکردم بۆ ئەوەی لەوێ ساغی بکەمەوە • ماوەیەکی زۆر بەسەر ڕەوەزە شاخاندا قەرە بـە قەرەی کەرەکـەم دەڕۆیشتم • تا جارێـکیان شتێکم لێ‌قەوما ، کەلەك لەمێژە : بەڵام لـە بیرم نەکردوەو قەت لـــە بیریشی ناکـەم ؛ چونـکە لـەو ساتەدا بوو کـە گیانم یا خـود ئاگرم کلپـەی سەند ، لەو ساتەوە بووم بـەو شامیلەی ئێستا • زۆرم نەمـا بوو بـگەمە تەمەرخان شورا ، لە پەڕگەی گوندێك تاقمە منداڵێکی چەتوون‌و خوێڕیم لێ‌ڕاست هـات‌و شەڕیان پێ‌فرۆشتم‌و تیزیان پێ‌کردم • یەکێ تەپڵەکەی فڕانـدم‌و تێی تەقاند هـەڵات ، کـە بەرمـدا دوای ئەوەوە ئەوانەی‌تر باریان لـە کەرەکەم کردەوەو قەرتاڵەی میوەیان لەبەر یەك هەڵتەکـاند • قاقا پێ‌دەکەنین‌و گاڵتەیان بـە دەمچەفتی‌و بێ‌دەسەلاتی مـن دەهـات ؛ بـەڵام گاڵتـەو قەشمەری ئەوان دەریای تووڕەیی منی هێنایـە جۆش‌و ئاگرێـکی وام تێ‌بەربوو قـــەت شتی وام نەدی بوو • خەنجـــەری دەسك ئێسکی سپیم هەڵکێشاو کەوتمـە شوێن ئەوەی تەپڵەکەی فڕاندم‌و لـە هنـداو دێدا گرتم • پێلەقەیەکم لێ‌داو لە زەندۆڵێکم بردە خـواریێ‌و خەنجەری دەبانم لەســەر گەرووی دانا ، کەوتە پارە پاڕێ • پێم گوت : « باشتر وایە گەمـە بە ئاگر نەکەی ! » لەناو زەندۆڵەکەدا جێم هێشت‌و گەڕامەوە : ئەوانەی خۆخیان لێ بە گوڕێ وەرکردبووم هەر بابایە بۆ لایەك هەڵدەهات • چوومە سەر نزیکترین بان‌و تێم‌ڕاخوڕین :

« هۆ ، منـداڵینە ! ئەگـەر دەتانەوێ وورگتـــان بە خەنجـــەر هەڵنەدڕم چیتان بردوە بیهێننەوە • »

پێویستی بە دووبات کردنەوە نەکرد •

ئەو ڕۆژە لـە بازاڕ گوێم لێ‌بوو ، بەختیارەکان دەیانگوت : « زۆر شتی‌تریش لەم منداڵە دەبیسینەوە • » منیش تەپڵەم هێنایە سەر ناوچەوان‌و

کەرەکەمم دەنگ‌داو بە ڕێـگەی خۆمدا ڕۆیشتم • چما ئەمن حـەزم لـە شـەڕو کووکـە بوو ؟ خێر ! ئەوان گێچـەڵیان پێ کردم‌و ئاگریان تێ‌بەردام •

چـەند ساڵی پێ‌چوو • ڕۆژێ ، سبەینە بوو ، لەناو ڕەزەکەم ئیشم دەکردو قۆڵم لێ‌هەڵکرد بوو لە خوارەوە خۆڵەڕەشی بە پێتم بەسەر شاخ دەخست‌و لـە بن درەختـانم ڕوو دەکرد • خـۆڵم بە تەپڵەیەکی کۆن دەکێشا • ئەو کاتە زۆر جێ برینم لـە لەشـدا بوو • کتب‌و پڕ هـەندێ پیاوم هاتنـە لا ، خەڵـکی گوندە شاخاویەکانی‌دی بوون‌و لـە دوورەوە هاتبوون • داوایان لێ‌کردم ئەسپەکەم زین بکەم‌و چەك لـە خۆم بدەم • بەڵام من حـەزم نەدەکرد دەست بدەمـە چـەك‌و گفتم نەدانێ چونـکە بەروەردە کردنی باخی خـۆم پێ لـە چوونە شـەڕ باشتر بوو • ئینجـا قاسیدەکان گوتیان : « شامیل : ئەسپی بێگانان ئاوی کانیمان دەخۆنەوە ، بێگانە ئاگرمـان دەکوژێننەوە • جا خۆت سواری ئەسپەکەت دەبێ ؟ یان سوارت بکەین ؟ »

کـە ئەمـەم بیست ئاگرم لە هەناوی بەر بوو • وەکو ئاگری ئـەو جـارە وا بوو کـە منـداڵ تیتاڵیان پێ‌کردم ، خۆخیـان لێ بـە گوڕێ وەرکردم ، لەویش گـەرمتر بوو • بەرم بـە باخەکەمەوە نەمـا •• هەر هیچ شتم لە بیر نەما •• نە باو نە باران‌و نە سەرما هیچیان ئەو ئاگرەیان پێ‌ناکوژێتەوە کـە بیست‌و پێنج ساڵەوێڵی سەر ئەو شاخانەی کردووم • گوندەکان مەرێزەیان لێ‌هەڵدەستێ ، دارستانەکان دووکەڵ دەدەمێنن ، لەناو کادووی شەڕگەدا بڵێسە چەخماخـە دەدا ، سەراپای قـەوقاس بڵێسەیە • ئەمەیە ئاگر !!

دەڵێن لـە زەمـانی کۆن ئەگـەر دوژمنێك پێی بنایەتە ئـەم دیو

سنووری داغستان ئاگرێکی وەك بورج بڵندیان لەسەر بەرزترین ترۆپکە شاخ دەکردەوە • کە لە گوندەکانی ئەو ناوە چاویان بەم ئاگرە دەکەوت هەر کەسە لە شوێنی خۆی ئاگری دەکردەوە • ئەم ئاگرە وەکو بانگەواز وا بوو : هەر کەسە کە چاوی پێ دەکەوت سواری ئەسپی هاوار دەبوو ، سوار لە هەموو ماڵێکەوە دەهاتن و لە هەموو گوندێکەوە ڕێچکەیان دەبەست • لەگەڵ بانگەوازی ئاگردا زەلام بە سواری و بە پێ دەهاتن • تا هالاوی ئاگر لەسەر ترۆپکە شاخان بمایە ، ئەو ڕدێن سپی و مندالانەی لە گوندان مابوونەوە دەیانزانی دوژمن هێشتا لەناو سنووری داغستان ماوە • کە ئاگرەکە دەکوژایەوە نیشانەی ئەوە بوو کە مەترسی نەماوەو ئاشتی گەڕاوەتەوە سەر خاکی باوك و باپیران • ئەم چیایانە ، لە مێژووی دێرینی خۆیان ، زۆر جار ئاگری وایان کردۆتەوە • ئەو ئاگرانە نیشانەی فەرمانی شەڕ بوون • بۆ چیایی یەکان ، جێگای تەکنیکی نوێیان پڕ دەکردەوە وەك : ڕادیۆ ، تەلەگراف ، تەلەفۆن • تا ڕۆژی ئەمڕۆش لاشاخەکان هەندێ قانی ڕووت و بێ درەختیان تێدایە دەڵێی گامێشی لەندەهۆر لەسەری پاڵکەوتوون •

**چیاییەکان دەڵێن : باشترین جێگا بۆ خەنجەر کالانە ، بۆ ئاگر ئاگردانە ، بۆ پیاو ماڵی خۆیەتی ؛ بەلام ئەگەر ئاگر لە ئاگرداندا بازی دا دەرێ و لەسەر ترۆپکەی شاخان بلێسەی دا ، ئەو حەلە ئەو خەنجەرەی لەناو کالاندا بمێنێتەوە خەنجەر نیەو ئەو پیاوەی لەبەر ئاگر دابنیشێ پیاو نیە •**

شوانەکانی داغستان ئەرکیان تەواو دیارە • هەندێك بە ڕۆژ چاویان لە مێگەل دەبێ و هەندێکی تر بە شەو پەز لە گورگ پاس دەکەن • بەلام هەمیشە یەکێکی وایان تێدایە کە نە پەیوەندی بە

مەڕانەوە هەیەو نە بە گورگان . ئیشی ئەوەیە چاوی لە ئاگر بێ‌و لێنەگەڕێ بکوژێتەوە ، پاسەوانی ئاگرەو هەر وایشی پێدەڵێن . ئەم پاسەوانی کردنەی ئاگر تایبەتی نیە بە یەك کەس . هەموو ئێواران پێش ئەوەی تاریك دابێ شوانەکان لەناوەخۆیانەوە یەکێك هەڵدەبژێرن‌و ئاگرەکەی پێدەسپێرن . ئەمەشیان کارێکی گرنگەو بگرە هەندێ جار سەختیشە . زۆرشت بە ئاگر دەکرێ ـ چێشت لێنان ، خۆگەرم کردنەوە، شمەك ووشك کردنەوە ، ڕوناکی ، قسەی چاك ، جگەرەکێشان کە هاوڕێیەکی سەرەکی گفتوگۆی بەکاوەخۆی مێردانە .

ئاگر لە کوخی شواناندا نیە . لە دەرەوە ، لە ژێر ئاسمانی کراوەدا دەکرێتەوەو بایەخێکی تایبەتی گەرەکە . بە دەست‌و تەپلەو کەپەنك ئەو ئاگرە لە باران‌و بەفرو زریان دەپارێزن .

بەلام ئاخۆ پیاو ناتوانێ بە مەردی ئازاو شاعیرو گۆرانیبێژو شایەرو سەماکەرو سازندەکانیش بڵێ پاسەوانی ئاگر ؟ ئێمە زۆری وامان هەن ئەو بڵێسە نەمرەیان لەناو دڵدایەو بە خەڵکی‌تری ڕادەگەیەنن : بڵێسەی شیعر ، بڵێسەی ئەفسانەو کەلەپوور ، بڵێسەی خۆشەویستیی خاکی باوك‌و باپیران .

منیش هەست دەکەم کە پرۆشکی ئەو ئاگرەم لە دڵدایەو دەزانم لەسەرمە لێنەگەڕێم بکوژێتەوە . دەبێ باش پەروەردەی بکەم‌و وای لێبکەم گەرمی‌و ڕوناکی بە پێشەوە بدات ، بۆ ئەوەی ئەوانەی پاشان دێن لە منی وەربگرن‌و دوورتری بەن .

پیاو چۆن خۆی لە ئاگری ئاسایی دەرەوە دەپارێزێ ، دەبێ ئاوهاش ئاگری ناو سینگی خۆی بپارێزێ .

لـە ئاهەنگ‌و میهرەجانی گوندی شاخاویدا هەمیشە پاش گۆرانی نوکە دێت‌و دوای سازو هەڵپەڕکێش قسە • ئێمەش دوای ئەوەی نەختێ باسی ئاگرمان کرد با بزانین داخۆ لـە داغستانی خۆماندا چۆن بە دوای «بەفرەپیاو»دا دەگەڕان •

من خـۆم بە زینـدووی چاوان گاڵتەیەکی گـەورەم دی کـە چیایەکانمان بە هەندێ زانایان کرد کە هاتبوون لە بەفرەپیاو دەگەڕان •

ئاڤارەکـان پێیـان‌گوتن : «بڕۆنە ناو دارجینان ، ڕەنـگە ئـەوەی لێی‌دەگەڕێن لەناو ئەواندا بێ • » دارجین ڕەوانەی ناو لەکانیان کردن ، لەك ڕەوانەی ناو لیزجیان کردن ، لیزجی ڕەوانەی ناو کومیکانیان کردن‌و کومیك ڕەوانەی ناو نوگایانیان کردن‌و نوگایی ڕەوانەی ناو تەباساریان کردن ـ بە کورتی سەراپای داغستانیان پێ‌کردن • ئەنجام ، شەکـەت بوون‌و لـە گوندی (کیکونی) وەستان کـە عوسمان عەبدوڕەحمانۆڤی باڵەوانی لێیە ـ ڕەنگە هەندێ خوێنەر لە فلیمی ـ دورگـەی گەنجینەدا دیبیان کـە سێ زەلام پێکەوە دەگرێ‌و لە کەشتی فڕێیان دەدا •

بە ڕێـکەوت تڕومێلی زاناکان لە بەستێکی نزیك کیکونی چەقی • هاتنـە خوارێ ویستیان پاڵی بدەن بەڵام پێیان نەجولایەوە •

عوسمـان لەسـەر بانی خـۆیان دانیشتبوو ، دیتی لـە دەوری تڕومێلەکە دێن‌و دەچن • هاتە خوارێ‌و بە هەنگاوی گەورەو شێنەیی خۆیەوە چوە کنیان • وەکو یەکێ کـە قالۆچە لـە ناو لەگەنێکی چەورو لووس دەربێنێ ئاوهـا تڕومێلەکەی هەڵگرت‌و بڵنـدی کردو بردیە شوێنێکی ووشك •

زاناکان لێیان بوو بە مقۆمقۆ ـ واقیان وڕما ، دەبێ ئەمە بەفرەپیـاو بێ‌و بە هانایانەوە هاتبێ ! عوسمان تێ‌گەیشت ، وەڵامی دانەوە :

« ئێوە خۆڕا وەختی خۆتان دەدۆڕێنن‌و لێرە دەگەڕێن • ئێمــەی جایی لــە بەفر دروست نەکراوین ، لە ئاگر دروست کراوین • ئەگەر مــن ئاگرم تێــدا نەبوایە چۆن دەمتوانی تڕومێلەکەتان هەڵگرم‌و لــەناو قوڕدا دەری بێنم ؟ »

بەکاوەخۆ جگەرەیەکی تێ‌کردو ئەستێ‌و بەردەستێی دەرهێنــا ، قاوەی داگیرساندو جگەرەکەی پێ‌کردو گەواڵە دوکەڵێکی بــە بادا ، لەگەڵ دوکەڵەکەدا گرمەی پێکەنینێکی لە سنــگی پان هــاتە دەرەوە • گرمەکە وەکو گرمەی هەرەس‌هێنانی تەپکە شاخ وا بوو ، وەکو گرمەی گلۆربوونەوەی تاوێرە بــەردی دەم جۆگــای شــاخ وا بوو ، وەکو بوومەلەرزەی شاخهەژێن وا بوو •

ئەبوتالیب کە ئەم چیرۆکەی بیست ، گوتی :

« خەڵك بە دوای شتی وا بڕوبووچدا بگەڕێ چۆن لــە قوڕدا ناچــەقێ ؟ »

لە هیندستان ، چوومە ئاهەنگی ئاگر ، ئــەو جۆرە ئاهەنگە چــەند شتی چاکــە ! لەوێ چرایەکیان دامێ‌و لەو وولاتە دوورەوە وەك سلاو هێنامەوە مــاڵی خۆم لــــە داغستان • ئێمە زۆر جــار دەڵێین : « سلاوی گــەرم ، گەرمترین سلاوم بگەیەنە ! » دەشێ سەردەمی وا هەبووبێ کــە خەڵك لــە باتی ئەوەی بە قسە سلاو بۆ یەکدی بنێرن ئاگریان بۆ یەك ناردبێ ـ ئاگری ئاشتی ، ئاگری شەڕو سووتان نا ، بەڵکو ئاگری خۆگەرم‌کردنەوەو ڕوناکی •

ڕەوشتێکی شاخاویمان ئەوەیە کــە یەکەم ڕۆژی زستان ( و هەندێ جار یەکەم ڕۆژی بەهاریش ) بۆ ئێواری گوندەکان ئاگری سلاو لـــە

سەر تۆپکە شاخان دەکەنەوە • هەر گوندەو ئاگری خۆی • ئەو ئاگرانە لە دوورەوە دیارن • کە زستان یان بەهار دێ گوندەکان لەسەر دۆڵو هەڵدێرو شاخەکان سڵاو لە یەکتر دەکەن • سڵاوی ئاگرین نیشانەی بڵێسەی ئاواتی بەرزە • من خۆم زۆر جار ئاگرم لەسەر شاخی (خەمیرخۆ) کردۆتەوە کە بەسەر گوندی تساداماندا دەڕوانێ •

خۆڕا نەبوو یەکەم کارگەیان لە داغستان ناونا ئاگری داغستان ئێستا زۆر پڕشنگی ڕوناکی خراوەتە سەر ئاگری سەرواڵا •

باڵندە چۆن بە ئاسایی لەسەر درەخت هەڵدەنیشن ئاوهاش لەسەر دارتێلەکانی کارەبا هەڵدەنیشن • کۆترەباریکەش لە گلۆپی کارەبا ناترسن کە لەسەر شاخان دەبریسکێتەوە •

جارێکیان لە نزیك شاری (ئیزبەرباش) قەزوینم دی بەبوو بە بڵێسەو هەفتەیەکی تەواو شەپۆلەکان ئاگریان پێ نەکوژایەوە کە لە ئەنجامدا دامرکایەوە وەکو کەشتیەك وا بوو کە لە دەریادا نقووم بووبێ •

دەریای ئاگر ڕوودەمرێتەوە بەلام ئاگری ناو دڵی داغستان هەرگیز ناکوژێتەوە • ئایا ئاگری دڵی بنیادەم لە ئاو دەترسێ؟ ترسانی چی ؟ خۆی بە دوای ئاودا دەگەڕێ • ئەدی لێو لەبەر ئاگری ناو جرپەی ـ ئاو ئاو !ـ ووشك نابێ و ناقەڵەشێ ؟

بەم جۆرە ئاوو ئاگر بەیەکەوەن •

دایکم هەمیشە دەیگوت : « ئاگردان دڵی ماڵە، بەلام جۆگەلە دڵی دێیە • »

شاخ ئاگری دەوێ بەلام دۆڵ ئاوی دەوێ • داغستان شاخو دۆڵە ؛ ئاگرو ئاوی دەوێ • گۆتەیەکی کۆنە دەڵێ :

یەکێ کە لەماڵەوە دەردەچێو دەڕوا ، یان لە دەرەوە دێتـــەوە ماڵێ : ئەگەر وەك ئاوێنە تەماشای کانی پەڕگـــەی دێ بـــکات ، دیارە خۆشەویستی ئاگری لە دڵدایە .

بەڵام ئاخـــۆ سەراپای داغستان ناڕوانێتـــە ئاوێنەی ڕونی دەریای قەزوین ؟ ئایا داغستان وەکو گەنجێکی کۆكو کەڵەگەت وا نیە کـــە تازە لە ناو ئاو هاتبێتە دەرەوە ؟

داغستانی من خۆی دەسەر قەزوین داهێناوەو وەکو چیاییەك وایە کـــە داهاتبێتەوە سەر کانیو جلی ڕێك بخاتو سمێڵی بابدات .

نەفرەتێکی شاخاویمان هەیە دەڵێ: « یاخوا ئەوەی کانی پیس دەکا، ئەسپی بتۆپێ . »

یەکیکیتر دەڵێ : « یاخوا هەمووکانی دەوری ماڵتان ووشك بێ.»

بەڵام ئەگـــەر چیاییەك بڵێ : « خەڵکی ئەم گوندە پیاوی چـــاکن ، کانیو گۆڕستانیان خاوێنەو باش دەیانپارێزن . » ئەمە مەتحێـــکی زۆر گـــەورەیە .

زۆر کانیو بیرمان لـــە شەرافەتی ئەو مێرانە لێدراوە کـــە مـــەردانە شەهید بوونو هەر بە ناوی ئەوانیشەوە کراون ـ کانی عەلی ، کـــانی عومەر ، بیری حاجی موراد ، کانی مەحموود .

بەیانیو ئێوارە کچ گۆزە لە شان دەچنە سەر کانی گەنجەکانیش دەچن تەماشای کچان دەکەنو دڵخوازێك بۆ خۆیان دەستنیشان دەکەن. زۆر جار خۆشەویستی لە سەرکانی چرۆی داوە : زۆر خێزان لەوێوە سەری هەڵداوە ! مەحموودی شاعیرمان نووسیویە :

**نازانی کێ گۆرانی منی بۆ چڕیوە ؟**
**وەرە سەر کانیو بە چاوی خۆت سەیری کە .**

جارێکیان دەچوومە شاخان : لە ڕێـگادا ، لە نزیك کانی گۆتساتلی ڕاوەستام ، ڕێبوارێکم بینی داهـاتبوەوە سەر کـانیو بە مست ئاوی دەخواردەوەو دەیگوت :

ـ وای چەند خۆشە !

گوتم بە بادی وەخۆ ٠

وەڵامی دامەوە : کە نانیش دەخۆم دەستەوانە لە دەست ناکەم ٠

باوکم دەیگوت : « هیچ مۆسیقایەك لە ترپەی بارانو خوڕەی ڕوبار خۆشتر نیە ، پیـاو هەرگیز لە تەماشاکردنو گوێدانـە ئـاوی ڕەوان ماندوو نابێ ٠ ٠ »

بەهـار کـە بەفری شاخ دەتوایەوە دایکم چـەند ساتێ سـەیری ئەو جۆگەتانەی دەکرد کـە شۆڕ دەبوونەوە دۆڵ ٠ زستان حەوزی بۆ ئاوی باران خۆش دەکردو کە هاوین دادەهات ئاوەکەی بەر دەدایەوە بن مێرگو میرغوزار ٠

من ئەوەم لە هەموو شتێ پێ خۆشتر بوو کە بە پێخواسی بـەناو گۆمی شێلو دەکەوتم ٠ قەت بـە باران سەخڵەت نەدەبووین ٠ بـەری جۆگاکانمان دەگرتو دەمانکردە گۆم ٠

هـەر ئەمن دەزانم ئـەو باڵندەیەی ئاو لە هەرکـەودا دەخواتەوە چەند شادو بەکەیفە !!

شامیل بە پیاوەکانی خـۆی دەگوت : « ئەگـەر دوژمن سـەراپای گوندو هـەموو زەویشمان داگیر بـکا مادام کانیمان بە دەستەوە بێ هەر سەردەکەوین ٠ » کـە دوژمن هێرشی دەهێنا سەرمان ئیمام فەرمـانی توندی پێدەکردین کـە پێش هەموو شتێ بەرگری لە کانی دێ بکەین ٠

کە ئێمەش هێرشمان بۆ دوژمن دەبرد فەرمانی پێدەکردین پێش هەموو شتێ دەست بەسەر کانی دابگرین •

جاران ، ئەگەر ساحێب خوێن بکەیشتبایە دوژمن‌و بیدیایە لە ئاوی ڕوبار دەکەوێ ، هیچ خۆی تێنەدەگەیاند ، ڕادەوەستا تا دوژمنەکەی لە ناو ئاو دەهاتە دەرەوەو چەکی لە خۆی دەدا •

زۆر جار ڕەوشتێکی‌ترم دێتەوە یاد : ئەویش هەر پەیوەندی بە ئاوەوە هەیە • ئەم ڕەوشتە پێی‌دەگوترێ «کەری باران» یان « کەری بارانی » •

بەلاش نەگوتراوە : « بە قرچەی نیوەڕۆ لە دۆلی داغستان • » • « قرچەی نیوەڕۆ » بەلای ئێمەوە سەختەو هەموو شتێ ووشك دەکا • زەوی دەقەلشێ‌و بەرد وەك سۆبەی گەش گەرمایی لێ‌هەلدەستێ • درەخت پووچ دەبێ‌و زەوی‌وزار ووشك • هەموو شتێ تامەزرۆی ئاوی ئاسمان ، تامەزرۆی باران دەبێ ـ گیاوگۆل ، چۆلەکە ، مەڕو مالات هەلبەتە خەلکیش • ئەو حەلە مندالێکی بچووکی دێ دێنن‌و لە گیای ووشك‌بووەوەی بەر ڕۆژ بەرگێکی وەکو بەرگی هیندیانی لەبەر دەکەن‌و پێی دەلێن « کەری باران » • مندالی ئاوقەرانی خۆی جلەوی ڕادەکێشن‌و لەناو گوند دەیگێڕن‌و پێکەوە گۆرانی دەلێن ، کە وەکو دوعاو پاڕانەوە وایە ، :

**خوایە ، خوایە ، بارانمان بۆ بنێرە ،**
**با ئاو لە ئاسمانەوە برژێتە سەر زەوی ،**
**با کانیەکانمان بکەونە قولپەقولپ •**
**خوایە : بارانمان بۆ ببارێنە •**
**ئەی باران ، وەك ڕوبار بەسەرماندا ببارە ،**

**زەوی پیرۆزمان زاخ دەوە ،**
**زەویو کێلگامان سەوز کەوە .**

ئینجا گەورەکانی دێ لە کۆلانێ غار دەدەنە ( کەری باران ) و ئاوی پێ دادەکەن : هەندێ بە جەڕەو هەندێ بە ترار . بە دەم گۆرانی منداڵانیشەوە دەڵێن : « ئامین ، ئامین » .

منیش جارێکیان دەوری ئەم «کەری باران»ەم بینی . ئەو کاتە بە قەد نیوەی ئەو بارانەی بە تەمای بوون ئاویان پێداکردم .

بەڵام کەم وا دەبوو ئاسمان گوێ بە گۆرانیو دوعاکانمان بدا . ڕۆژ هەر دەیجۆشاند ، دونیای دەسووتاندو وەك ئوتووی گەرم داغستانەکەمانی دەپەستا .

ڕۆژ خەمی دەهێنا . ناومان نابوو ــ ڕۆژی غەمبار . زەوی سەدان هەزار ساڵ لەبەر ئەم ڕۆژە غەمبارەدا باڵی دایەوە . ئەگەر هەموو ئەوروپا وەربگری «گونیب»ی گوندی داغستانی لە هەموو شوێنێ هەتاوی زیاترە . تسادای گوندی منیش هێندە لە دوای ئەوەوە نیە . هەروەها ئەوانیکەیش . هۆیەکەی لە گوینەکە پێیان دەگوترێ « تینوو » .

ڕوخساری شەکەتی دایکم لە بیرە کە دەهاتەوەو جەڕاوێکی لەسەر شان بوو ، جەڕاوێکیشی بە دەستەوە بوو . سێ کیلۆمەتر لەولای گوندەکەمانەوە ئاویان دەهێنا .

ڕوخساری گەشی دایکم لە بیرە کە باران دەبارىو زەوی تەڕ دەبووو ئاو بە ناو بۆڕیدا دەقوڵیو دەچوە ناو گۆمەکانی ژێر زێرابو گۆمەکان پڕ دەبوونو لەسەریان دەڕژایەوە .

پیرەژنێکم لـە یادە ناوی حـەبیبە بوو . هـەموو سبەینان کوڵنـــگی دەخستە سـەر شانو لـە دێ دەردەچوو ، ملی لەبەر زەوی هەڵـکەندن دەنا . شەیدای دۆزینەوەی ئاو بوو ، هەمیشە بە دوای ئاوەوە وێڵ بوو .

هەموو کـەس دەیزانی پیرەژن هەوڵی بێ هوودەیە بەڵام کـەس بە بەر ڕووی هەڵنەدەهێنا . تا ڕۆژێکیان منی منداڵی بێمێشك هـاوارم کرد : « هـەوڵت سوودی نیە . ئیش‌کردنت کەلکی نیە . هیچ ئاو لـەم ناوەدا نیە . »

باوکم زۆر لێم‌تووڕە بوو .

« ئاخر ، ڕاستە ـ هیچ ئاو لێرە نیە . »

« وا دەبێ خەڵك هیچ نانی نەبێ بەڵام ئایا ئەمـە هی ئەوەیە پێیـان بێ‌بکەنین ؟ کوڕم لـە بیرت نەچێ : قەت گاڵتە بەو کەســانە مەکە کە بە دوای نانو ئاودا دەگەڕێن ! »

« دەنا تۆ خۆت تیزت بەوە کردوە کـە خەڵـکی ـ ئینکفاچولین ـ هەوڵیان داوە پردەکە گەورەتر بکەن تا ئاویان پتر بێ ! »

« ئەویان پێکەنینی ناو فرمێسکان بوو . گەنج لە شتی وا ناگـەن . تۆ هێشتا نازانی ئاو بۆ داغستان مانای چیە ؟ حەبیبە دەبێ چ خـــەونو ئاواتێکی گەورەی هـەبێ وای لێ بـکا لـــە شوێنی بێ‌ئاودا لـــە ئاو بگەڕێ ! چاکتر وایە بێ دەنگ بی ، وا باران هات ! »

ڕاست بوو ، بارانێکی نازدار دەیچرپاند .

**ـ تەیرینە : بۆچی لە بەیانیەوە بێ دەنگن ؟**

**+ باران دەبارێو ئێمەش گوێمان گرتوە .**

**ـ شاعیرینە ، بۆچی ئەو بەیانیە بێ‌دەنگن ؟**

**+ باران دەبارێو ئێمەش گوێمان گرتوە .**

باوكم هەمیشە دەیگوت كـە خۆشترین ڕۆژی ژیانی ئەو ڕۆژە بوە كـە ئاو لە شاخی دورەوە بە بۆڕیێ هاتۆتە ناو دێ ؛ بەڵام پێش ئـەو ڕۆژە ، هـەموو ڕۆژێ لەگـەڵ خەڵكیتر كوڵنگی دەوەشاندو بۆڕی دادەمەزراند • ئەو ڕۆژەم زۆر چاك لـە بیرە كە ئاو گەیشتە جێ • كە لـە بۆڕیەوە هەڵڕژا باوكم نەیهێشت گوڵیشی تێبهاوێین •

چاییەكان شەرەفی پڕ كردنی یەكەم جەڕەیان دایە پیرەژنێكی سەد ساڵی • ئەویش كە پڕی كرد یەكەم گۆڵماوی دایە باوكم •

باوكم كـە زۆر خەڵاتو پاداشتی وەرگرتبوو دەیگوت هـەرگیز پاداشتی لـەو گۆلمـە ئاوە بەنرختترم وەرنەگرتوە • هـــەر ئەو ڕۆژە شیعرێكی لە بارەی ئاوەوە دانا • لە شیعرەكەدا بە باڵندانی گوتبوو چیتر ناتوانن شانازی بە خۆیانەوە بـكەن چونكە ئێمەی چاییش وەكو ئـەوان ئاومـان بە ئاسانی بۆ دێ • گوتبووی لە هیچ زەماوەندو ئاهەنگێكدا هیچ ئاوازم نەبیستوە لـە بلقەبلقی ئاو خۆشتر بێ • سوێندی خوارد بوو هیچ ماینوجوانوەك لەنجـەو لاری ئـەو ئافرەتانەیان نیـە كـە ئێستا دەچنـە سەراوێ • سوپاسی كوڵنگو بێڵو بۆڕیو شۆڕشی كـرد بوو • باسی ئەو ڕۆژانـــەی كرد بوو كـە چـــۆن زستان بەفریان لەســەر ئاگر دەتواندەوەو دەیانكردەوە ئاو ، چۆن ئافرەت لـە ژێر جەڕەی گران زوو پشتیان كووڕ دەبوەوە بەڵێ باوكم ئەو ڕۆژەی زۆر پێگەورە بوو !!

گـەرمـای گـــەلاوێژی مەحـەـج قەڵام لە یادە • باوكم تووشی نەخۆشیەكی گران هات ، دەوروبەری پڕ دختۆرو دەرمان بوو ، گوتی :

« شرم ، زۆر شرم • دەیان گاز لە هەموو لایەكەوە دەمپچڕنەوە »

هیچ دەرمـانی نەدەخوارد ، لـەو بڕوایەدا بوو لێی پیر كردوەو كـار لـە كـار ترازاوە • لێ‌نەدەگەڕا بالیفیشی بۆ ڕێك بخەین ، بـــە

لایەوە بێ سوود بوو • بەڵام کە تەواو شێ بوو بانگی کردم :

«یەك دەرمان هەیە پێی چاك دەبمەوە ! »

« ئەو دەرمانە چیە ؟ »

« لە دۆڵی (بوتسراپ) بیرێکی بچووك ، کانیەك هەیە ، خۆم دۆزیومەتەوە ، چوڕە ئاوێکی ئەو کانیەم بگەیەنێ • »

ڕۆژی پاشی زنە چایەك جەڕەئاوێکی لەو کانیە هێنا ، باوکم خواردیەوەو چاوی نوقاند :

« سوپاس ، دختۆرەکەم ! »

لێمان نەپرسێ داخۆ سوپاسی کێ دەکا ـ ئاوەکە ، ئافرەتەکە ، کانی دۆڵەکە ، یان وڵاتەکەی کە ئەو ئاوەی لێ‌هەڵقوڵاوە •

دایکم دەیگوت : « هەر کەسە دەبێ کانی پیرۆزی خۆی هەبێ • »

هەروەها دەیگوت : « ئەگەر کانیەکی فێنك لە نزیك پەرێزێ هەبێ سەبان قەت ماندوو نابێ • »

ئێستاش دەگێڕنەوە کە شامیل هێشتا گەنج بوو ، جارێکیان ، لە دۆڵی گمری ، لە قەڵایەکی سەخت ، دوژمن دەوری خۆیو قازی محەمەدی مامۆستایان گرت • شامیل لەسەر ڕا بازی دایە سەر نووکەڕمی دوژمنانو بە زەبری خەنجەر ڕێی خۆی کردەوە • لە یازدە جێ بریندار بوو • لەگەڵ ئەوەش دەرباز بووو پەنای بردە بەر شاخان • چایی وایان زانی شامیل تێ‌چوە • کە هاتەوە دێ دایکی تازیەی بۆ دانا بوو • دایکی کە چاوی پێ‌کەوت ، بە خۆشیو سەرسامی‌یەوە لێی پرسی :

- شامیل ، کوڕم ، چۆن بە زیندوویی قوتار بووی ؟ شامیل وەڵامی دایەوە :

- کانیەکم لە شاخان دۆزیەوە •

کە چیاییەکان زانیان پیرە شامیلی ئیمامیان لـە حوشتر بەربۆتەوەو عەمری خـــوای کردوە ، لــە دێدا لەبەر کۆسپەی دەرگا دانیشتبوون ، دەیانگوت :

- چ کانی داغستانی لە کن نەبوە !

لە «نوخا» چوومە سەر گۆڕی حاجی موراد • تەماشای کێلەکەیم کرد ، لەسەری نووسرا بوو :

« شێری داغستان لێرە ڕاکشاوە • »

سەری بەڕیوی ئەم شێرەیشم بینی :

- سەرە ، چۆن لە لەش جودا بوویتەوە ؟

- وێڵ بووم ، دەچوومەوە داغستان ، دەچوومەوە نیشتمانەکەم ، دەچوومە سەر کانیەك ، وێڵ بووم •

گوندی من لەبەر پێی شاخدا قیت بۆتەوە • دەشتێکی پانی لەبـەر دەمدا ڕاکشاوەو لە دوورەوە قەڵای (خونزاخ)ی لێ دیارە ، دەوروبەری هـەموو گوندەو خۆیشی - قەڵاکە - ڕووی گرژو مۆنی لـــە هـەموو لایەك کردوەو لە کونو مەتەریزانەوە دەڕوانێتە دەرەوە - سـایەدە ، هەڕو گیف دەکا ، خەڵك بەندو یەخسیر دەکا •

زەمانی خـــۆی گوللـەی چیاییان لـەو مەتەریزانەوە بۆ چـەتەو یاخیەکان دەچووو لەگەڵ تەقەی گوللەدا ڕەوە کۆتر لە شەقەی باڵیان دەداو بەســەر گوندی تسادامادا دەسووڕانـەوە • چیایی دەیانپرسی :

« کێ ئادگاری لە هەموو شتێ ترسناکترو دەنگی لە هەموو شتێ بەهاڕزنترە ؟ »

ـ قەڵای خونزاخ .

بەڵام لەسەر دەمی من ترس‌و هەڕەشەی خونزاخ ببوو بە چیرۆك‌و ئەفسانەو هیچی‌تر . کە قوتابی بووین لە مەتەرێزەکانەوە سێوو تۆپە بەفرمان دەهاویشتە یەکتر ، تووڕتووڕەی دیدەوانیمان لێ‌دەداو کۆتری سەر ئەم شاخە نزیکانە لە شەققەی باڵیان دەداو بە هێمنی دەسووڕانەوە . خونزاخ ببوو بە قوتابخانە . من حەفت ساڵ لەم قوتابخانەیەدا خوێندم .

ئێستا بۆ هەر کوێ سەفەر بکەم ، لە هەر شوێنێ بم ، لە سیمفۆنیای سیحراوی‌و لە ئاوازی سەماو هەڵپەڕکێ ، مۆسیقای زیوینی دەوری منداڵیم دێتەوە بەر گوێ ، زرنگەی زەنگی قوتابخانەم دێتە بەرگوێ ـ چەند خۆش بوو کە مژدەی تەواوبوونی دەرزی پێ‌دەداین . ئێستاش گوێم لێیە بەڵام زەنگی پشوودان‌و چوونە بەر هەیوان‌و سەر شەقام نیە ، بە پێچەوانەوە زەنگی چوونە ناو قوتابخانەو پۆل‌و بەشی ناوخۆیە .

ئێمە سێ کەسی هاوزێ یەك بووین . هەر یەکەمان مانگێ ڕۆژێك لە خوێندن عاف دەکراودەبوو بە ئاوکێش . وایش دەبوو کە یەکێ سزا بدرێ‌و ڕۆژێکی زیادە ئاوکێشی بکات . بە ڕێکەوت ، بێ سزادانیش ، من مانگێ دوو ڕۆژ ئاوم دەهێنا ؛ چونکە عەبدولغەفور یوسفۆفی برادەرم کە یەکسەر لە دوای من بوو کە نۆرەی دەهات تووشی نەخۆشی دەبوو . لە بیرمە هەموو مانگێ ڕۆژی حەفتەم‌و هەشتەم بەر من دەکەوت .

کانی لـەو دیو شوورەی قـەڵا بوو • چوون ئاسان بوو ـ دەولك بەتاڵو ڕێـگا نشێو بوو ، بەڵام گەڕانەوەسەخت بوو • سەرەڕای ئەمەش حەشامەتی منداڵانی قوتابخانە دەست بـە فافۆن لەسەر توولە ڕێی باریك چاوەڕێیان دەکرد • تینوو بوون • ڕایاندەماشتە دەولکەکەم • هەندێکیان لێ هەڵدێنجاو زۆریان لێ دەڕشت •

دڕدانو دوورخستنەوەیان ئاسان نەبوو ـ دەبوایە ئاوەکەش هـەر بگەیەنمە قوتابخانە !

زۆر ئەفسانە لەبارەی ئەو کانیەوە هەیە • ئەمە یەکێکیانە وەکـو چۆن لە باوکم بیستوە :

دیوارەکانی قەڵا بە گوللە قنجاون • لە کاتی شەڕی نیشتمانیدا قەڵا زۆر جـار ئەم دەست ئەو دەست بووو بە نۆرە ئاڵای سەوزو سووری لەسـەر دەشەکایەوە • سپیەکـان دەستیان بەسـەر داگرت ، پاشـان سوورەکـان لەبەر دەستیان دەرهێنان • جـارێ لە دەست گۆتسینسکی دابوو ، ئاوێ لـە ژێر دەسەڵاتی پارتیزانەکـانی موسـلم عـەتایف • پارتیزانەکان شەش مانگ بەرگریان کرد • هەموو ڕۆژێ سـەعات دوو تەقە دەوەستا ، ئەویش ئەو کاتەی ئافرەتەکانی قەڵا لە شوورەی قـەڵا دەردەچوونو دەچوونە سەراوێ • جارێکیان کۆلۆنێل عەلیخانۆف بـە کۆلۆنێل جەعفەرۆفی گوت : « وەرە لێ نەگـەڕێین ژن ئاو بـبـەن • با پیاوەکانی عەتایف لـە تینوان بخنـکێن • » بەڵام کۆلۆنێل جەعفـەرۆف وەڵامی دایەوە : « ئەگەر تەقە لـەو ژنانە بکەین کە دەچنە سەراوێ ، سەراپای داغستان لێمان دەبێتە دوژمن • »

بەم جۆرە تا ژن دەچوونە سـەر کانیو دەهاتـنـەوە هـەر دوو لا تەقەیان ڕادەگرت •

دایـکم زۆر نەخۆش بوو ، خەبەریان دایە کـە من یاداشتی لینینم وەرگرتوە • هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی : « خەبەرێکی خۆشە ! بەڵام لەوەش خۆشتر ئەوەیە پێم بـگاتەوە کوڕەکـەم یاریدەی هـەزارێك یان هەتیوێکی داوە • با بەو پارەیە ئاو بۆ گوندێکی تینوو ببا ، خەڵك سوپاسی دەکـا • وەختێ خۆی کە باوکی پارەتی مـیـری وەرگرت هــەموو پارەکەی لـە دۆزینەوەی کـانی نوێ خەرج کرد • لە هەر کوێ کانی هـەبێ هـاتو چۆی چیایی بەسـەرەوە دەبێ ، هــەر شوێنێـکیش هاتو چۆی پێدا بـکرێ دەبێتە ڕێ ، ڕێـگاش بۆ هــەموو کــەس پێویستە • بە بێ ڕێگا پیاو بە ماڵی خۆی ناکەوێتەوە ، لــە هەڵەتێـکدا هەڵدەدێرێ • »

باوکم هەمیشە دەیگوت : من ئەوێ ساڵێ لە دایك بووم کـە یەکەم جۆگـە لـە داغستان لێدرا • جۆگاکە لـە «سولاك»ەوە دەچوە مەحەچ قەلا • ئەوانەی جۆگاکەیان لێ دەدا ئـەم دروشمەیان لـە شەپکە دارێك نووسی بوو : « ژیان بە بێ ئاو نابێ • »

ئاو ! ئاو لە تیوەڕە شاخان دەچۆڕێتەوەو دەڵێی دەستێکی گەورە چیا ڕادەکوشێ • جۆگەت لە شاخەوە دەڕژێتـە خوارێ ، بەسەر گەوراندا باز دەدا ، خـۆی لـە بن شاخـان دەکوتێ ، لە شوێنی تەنگەبەردا وەك جانەوەری بریندار دەگرمێنێو لـە ڕاستانی ســەوزدا وەك کــاوڕ گەمـە دەکـا •

داغستان چوار پشتێنی زیوی بەستاوە ـ چوار قۆیسووی قووڵ ، سولاكو سامور وەکو خوشکان دەست دەکەنە ملی یەكو ئینجا هــەموو ڕووبارەکانی داغستان دەچن خۆیان بە باوەشی دەریا دادەدەن •

ئاگرو ئاو ـ چارەنووسی گـەلانن ، ئاگرو ئاو ـ باوكو دایــکی

داغستانن ، ئاگــــرو ئاو ــ دوو خورجینەن هەموو کــەرەستەو سامانی ئەمەیان تێـــدایە •

لــە داغستانی خۆماندا ، کوڕو کچ دەچنە لای پیرو ڕەبەنەکــانو لــە حەوشــەو کێلگە یارمەتیان دەدەن • ئەمانە یەکەم جار چ دەکــەن ؟ داری قەلاشکەری بۆ ئاگر دێنن و ئاو بە جەڕە دێنن • قەلەڕەشکە هــەر بە غەریزە ئەو خانووانە دەناسن کــە ئاگریان تێدا کوژاوەتەوە ، یەکسەر لەسەریان هەڵدەنیشن و دەکەنە قەقەقەق •

ئاگرو ئاو ، دوو نیشانەن ، دوو مۆرن ، کــەسێتی داغستان دەست نیشان دەکەن •

نیوەی ئەفسانەکانی داغستان لەبارەی گەنجێکی ئازایە کە عەزیای کوشتوەو ئاگری هێناوەو گوندی بێ گـــەرمو ڕوناك کـــردۆتەوە • نیوەکەی تریش لە بارەی کچێکی مـــەکرۆیە کــە بە ئۆین لایلایەی بۆ عەزیا گوتوە تا خـــەوی لێ کــەوتوە ، ئینجا ئاوی هێناوەو دەرخـــواردی خەڵــکی داوەو زەوی بێ ئاو داوە •

ئەو عەزیایانەی کوڕە ئازاو کچە مەکرۆکە کوشتوویانن بوونەتــە شاخ ، بوونەتە ترۆپکی بەردینی قاوەیی •

« داغ » یانی چیاو « ستان » یانی وولات • داغستان واتــە وولاتی شاخان • وولاتی سەرفیرازی داغستان •

وەك منداڵێ تازە فێری جینجەیی بوو بێ
قەت لە گوتنەوەی ووشەی :
دا ــ غ ــ ستان ، دا ــ غ ــ ستان ،
وەڕس نابم

کێ ؟ چی ؟ داغستان .
بۆ کێ ؟ هەر بۆ وی .
داغستان ؟
داغستان .

ئەم گەلە بچووکە بۆ ئەوەی ئاگرو ئاویان دەست بکەوێ دەبوایە سەری زۆر عەزیا پان بکەنەوە . ئەمڕۆ ڕووبارەکان ڕوناکی دەبەخشن‌و ئاو دەبێتە ئاگر . هەر دوو ڕەمزی بنجی لەناو یەکدا تواونەتەوە .

ئاگردان‌و کانی ـ ئەم دوو ووشەیە خۆشترین ووشەن بەلای چیاییانەوە . بە پیاوی ئازا دەڵێن : «کڵپەیە نەك زەلام . » بە پیاوی چرووك‌و بێ‌کەڵك دەڵێن : « چرای کوژاوەیە . » کە یەکێ تەواو خراپ بێ دەڵێن : « هی وا لێی دێ تف لە کانیش بکا . »

ئێمە کە بادەی مەی هەڵدەدەین دەڵێین :

**سەر بەرزی بۆ ئەو کەسەی زۆر چاك**
**بە ئاگردان‌و کانیدا هەڵدەڵێ .**
**سێ قات سەربەرزی بۆ ئەوەی**
**دارێك دادەگیرسێنێ ، بۆ ئەوەی ئاو هەڵدەقوڵێنێ .**

چیاییەکی پیر لە گەنجێکی پرسی :

« لە ژیانتا ئاگرت دیوە ؟ بە ناویدا چووی ؟ »

ـ « وەك ئاو خۆم تێدا نقووم کردوە ! » .

« زانیوتە ئاوی تەزی چیە ؟ خۆت پێداداوە ؟ »

ـ « وەك ئاگر خۆم هاوێشتۆتە ناوێ » .

کەواتە تۆ چایەکی تەواو پێ گەیشتووی ، ئەمبەکەت زین کە ، بچینە ناو شاخان .

کە دوو چایی بەشەڕ دێن . یەکێکیان بەوەی‌تر دەڵێ : « چما کادووی سەربانی من لە هی تۆ کزترە ؟ قەت چوویم ئاو لە خەڵك بخوازمەوە ؟ ئەگەر وام تێدەگەی ، فەرموو بچینە پەنا ئەم بەردە زلە ، ڕوو بە ڕوو ساغی بکەینەوە . »

دیومە لەسەر دەرگا نووسراوە :

ئاگر لە کوچکاگردا دەسووتێ ، فەرموو وەرە ژووریّ ، بەخێر بێی میوان ! »

بە داخەوە داغستان دەرگای وای نیە لەسەری بنووسرێ : «ئاگردان ئاگری تێدایە ، فەرموو . »

بە ڕاستی ئاگرمان هەیە . کە دەعوەتتان دەکەین هەر قسەی خۆش‌و نوکتە نیە . شەرم مەکەن ، وەرن ، ئاگر لە کوچکاگردا دەسووتێ‌و ئاوی کانی دەبریسکێتەوە . فەرموون ، بەخێر بێن .



# مــاڵ

**دایکم دەیگوت : ( دەشێ دەمی بچووک قسەی گەورە بکات ) •**

**باوکــم دەیگوت : ( درەختی بچووکیش باخچەی گــەورەی پێ دەڕازێنێتەوە ) •**

**شامیل دەیگوت : ( گوللەی بچووک کەشتی گەورە کون دەکات ) •**

**خۆیشــم گوتوومە : ( دەشێ دڵی بچــووک دونیــای گەورەو خۆشەویستیی گەورەی تێدا بێ ) •**



★ ★ ★

ووشەی « ڕیگ ـ Rig »ی ئاڤاری دوو مانای هەیە : « تەمەن »و «ماڵ» • بەلای منــەوە ئەم دوو ووشــەیە لەناو یەکــدا دەتوێنــەوە • تەمەن ـ ماڵ • کــە دەگەیتە تەمەنێکی تایبــەتی دەبێ ماڵی خۆت هەبێ • ئەگــەر ئــەم قسەیە بــکەیتە ئاڤاری «قسەی وایشمـــان هەیە» ئەوا

ووشەبازیەکت دەست دەکـەوێ کـە وەرگێڕانی بۆ نیە «ڕیگ ـ ڕیگ» ، ئەمەن ـ ماڵ •

داغستان لـە مێژە پێ‌گەیشتوەو شوێنی پتـەوو یاسایی خۆی لەبەر ڕۆژدا گرتوە •

زۆر جـار لە دایـکم دەپرسی : «داغستان لە کوێیە ؟» دایـکی ژیرم وەڵامی دەدامەوە : « لەناو لانکی تۆدایە • » لە ئاندیەکیان پرسی : « داغستانی تۆ لە کوێیە ؟ » کابرا بە سەرسامی سەیری دەوروبەری خۆی کـرد •

ئەو گردە داغستانە ، ئەو گیایە داغستانە ، ئەو ڕووبارە ، ئەو بەفرەی سەرشاخان ـ هەمووی هـەر داغستانە ، ئەو هەورەی سەرەوە ، ئـەدی ئەویش داغستان نیە ؟

کـابرای ئاندی وەڵامی دایەوە : داغستانی مـن لە هـەموو شوێنێکدایە • •

ساڵی ۱۹۲۱ ، دوای شەڕی نیشتمانی گوندەکانمان خاپوور بوون‌و خەڵك برسی • نەیاندەزانی چی بکەن • وەفدێك لە شاخانەوە چوە لای لینین • لـە مەکتـەبی لینین ، قاسیدەکان بێ ئەوەی ورتەیان لـە دەم بێتـە دەرەوە نەخشەیەکی گەورەی جیهانیان پان کردەوە •

لینین بە سەرسامیەوە گوتی : « ئەوەتان بۆچی هێناوە ؟ »

« تۆ بیر لە زۆر گـەل دەکەیتەوە • لە بیرت نامێنێ کێ لـە کوێ دەژی • دەمانەوێ پێت نیشان بدەین کە داغستان کەوتۆتە کوێ ؟

بەڵام ئەوەندەی گـەڕان ، بە ووڵاتی خۆیان نەکەوتن ، لەسـەر نەخشە گەورەکە ڕێیـان لەبەر بزر بوو ، ئەو پارچـە زەویەیان پێ

نەدۆزرایەوە • ئەو کاتە لینین بە دڵنیایی لەسەر نەخشەکە ئەو شوێنەی پێ نیشان دان کە بە دوایدا دەگەڕان ، ئینجا پێ کەنی و بەشادیەوە گوتی : «ئەوەتا داغستانەکەتان • »

داغستانیەکان تێ گەیشتن کە لینین پیاوێکی ژیرە و بۆیان گێڕایەوە چۆن چوونە لای قومیساری گەل و لێی پرسین داخۆ داغستان کەوتۆتە کوێ • خەڵکەکەی ئەوێش هەر یەکە ڕەمڵێکی هاویشتبوو : یەکێ گوتبووی لە جۆرجیایە ، یەکێ گوتبووی لە تورکستانە ، یەکێ پێی داگرتبوو کە داغستان لەگەڵ بسماچینەکان بەشەڕ هاتوە ، ئەمانە تاقمێکی دژ بە شۆڕش بوون و ساڵی ١٩١٨ – ١٩٢٤ ئاسیای ناوەڕاستیان تالان کرد •

لینین زیاتر پێدا چووو پێ کەنی : « لە کوێ ؟ لە کوێ ؟ لە تورکستان ؟ سەیرە ! ئەقڵ نایگرێ ! »

تەلەفۆنی هەڵگرت و بە قومیسارەکەی گوت تورکستان لە کوێیەو داغستان لە کوێیە ؟ ، بسماچیەکان لە کوێ بوون و مریدەکان لە کوێ •

تا ئەمڕۆش نەخشەیەکی گەورەی قەوقاس لە ژووری لینین ، لە کرملین ، هەڵواسراوە •

ئێستا داغستان کۆمارە ، گرنگ نیە داخۆ گەورەیە یان بچووکە • ئەوەیە کەهەیە • ئەمڕۆ کەس لە وولاتەکەمان ناڵێ داغستان لە تورکستانە ، بەڵام لە وولاتەکانی تر هەندێ جار ناچار دەبووم شت ڕوون بکەمەوە :

« خەڵکی کوێی ؟ »

« داغستان • »

« داغستان ؟!» داغستان ... کەوتۆتە کوێ ؟ »
« لەقەوقاسە . »
« ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا ؟ »
« لەسەر دەریای قەزوینە . »
« ئێ ، ئێ ... باکۆ ! »
« نەء ، باکۆ نا ، هەورازتر . »
« سنوورەکانی چ کۆمارێکە ؟ »
« ڕوسیاو جۆرجیاو ئازەربێجان . »

« ئەدی ئەو شوێنە شوێنی چەرکەسان نیە ؟ ئێمە وای تێگەیشتووین . »

« چەرکەس لە چەرکەسیا دەژین و داغستانیش لە داغستان . »
« ئەو شوێنەی ئەلبورزی لێیە ؟ »

« ئەلبورز لە ( کەبەردینۆ ـ بەلکاریا ) یە . کەزبەك لە جۆرجیان. ئێمەش گوندی «گونیب»مان هەیە ... گوندی (تسادا)مان هەیە .

بەم جۆرە ، هەندێ جار ناچار دەبووم لە هەندەران تووشی ئەم گفتوگۆیە دەبووم . کابرا گۆتەنی : « بووکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێت لێ بێ . » تا ئێستاش هی وامان تێدا هەیە وا دەزانن چەرکەس لە داغستان دەژین ، یان ڕاستر بڵێین هیچ نازانن .

زۆر جار بۆ بەشداری کۆنگرەو کۆنفراس و کۆبوونەوە گەشتی دوورم کردوە . خەڵك لە هەموو کیشوەرەکانەوە دەهاتن ـ لە ئاسیاو ئەوروپاو ئەفریقیاو ئەمەریکاو ئوسترالیا . لەوێش کە هەر یەکە خۆی دەداتە پاڵ کیشوەرێکەوە من هەر دەڵێم داغستانیم .

لێم دەپرسن : « تۆ نوێنەری ئاسیای یان ئەوڕوپا ؟ داغستانەکەت کەوتۆتە کام کیشوەر ؟ »

« داغستانی من پێیەکی لە ئاسیایە ، پێیەکی لە ئەوڕوپایە . وا دەبێ دوو کەس پێکەوە لەم لاو لەو لاوە دەست باوێنە سەر ملی یەك ئەسپ . هەر بەم جۆرەش دووکیشوەر لەم لاو لەولا دەستیان خستۆتە سەر زنجیرە چیای داغستانو لەسەر خاکی ئێمەدا دەستیان دەگاتە یەکترو منیش زۆر پێشادو بەختەوەرم . »

مەلو ڕووبار ، بزنەکێویو ڕێویو هەموو گیاندارەکانیتری ئاسیاو ئەوڕوپا لە داغستان هەن . دەڵێی لیژنەی یەکێتی ئەوڕوپاو ئاسیایان پێك هێناوە . چەند خۆشە منیش بە خۆمو بە شیعرەکانمەوە ببم بە ئەندامێکی ئەم لیژنەیە .

هەر چۆنێك بێ ، هەندێ کەس بۆ ئەوەی سەخڵەتم بکەن دەڵێن : « چیت لەگەڵ دەکرێ ، ئاسیایی ! » یان بە پێچەوانەوە لە قوولایی ئاسیاوە دەڵێن : « چیت لێ ڕەچاو بکەین ، ئەوروپایی !؟ »

درۆ لە هیچێکیان سپی ناکەمەوە ، هەر دوو لا ڕاست دەکەن .

وا دەبێ کە باسی خۆشەویستی بۆ ئافرەتێ دەکەم سەری بادەدا : « وای لەم ڕۆژهەلاتیە فێڵبازە ! » وایش دەبێ لە داغستانەوە میوانم دێ ، خوو ڕەوشتی من سەرنجیان ڕادەکێشێو سەریان با دەدەن : « وای لەم ڕەوشتە ئەوڕوپاییانە ! »

چ دەکرێ ؟ داغستان ڕۆژهەلاتی خۆش دەوێ ، بەلام ڕۆژئاواش بێگانە نیە . داغستان وەکو درەختێك وایە ڕەگی لە خاکی دوو کیشوەر داکوتاوە .

لـه کوبا کەبەنکێکی لیادی داغستانیم بـە دیاری پێشکەش فیـدل کاسترۆ کـرد . کاسترۆ بە سەرسامیەوە پرسی : « ئەوە بۆ قۆپچـەی پێوە نیە ؟ »

« بۆ ئەوەی لە تەنگانە زوو فڕێی دەی‌و شیر هەڵکێشی . »

کاسترۆ گوتی : « بە ڕاستی کەبەنکێکی چەتانەیە . »

هیچ ماقووڵ نیـە داغستان لەگەڵ هیچ وولاتێکی‌تر بەراورد بکەی. داغستان لـە شوێنی خۆیەوە بەنرخە . بانی دڵۆپە ناکـا ، دیوارەکـانی دەرەزی نەبردوە ، دەرگای سیرەسیرِی نایە ، پەنجـەرەکانی هـــەوا نادەن . دەشێ گەلیـەکانی تەنگ بن بەڵام دڵی گەورەو فراوانە .

کابرایەکی (ئاندی) وەڵامی کابرایەکی دایەوە ، گوتی :

« تۆ دەڵێی گوایە وولاتی من بچووکـەو وولاتی تۆ گـەورەیە . کـەواتە با بزانین زووتر دەتوانین سـەراپای کامـە وولات بـگەڕێین ، وولاتی تۆ یان وولاتی من . با بزانین تۆ چۆن بەسەر هەورازەکانماندا هەڵدەگەڕێی ، بە چنگەچرێ بـە شاخەکانمان هەڵدەزنێی ، چـۆن بەناو دۆڵەکانماندا دەخشێی‌و لە تەلانەکانمان گلۆر دەبیتەوە . »

مـن بەســەر بەرزترین ترۆپکی داغستاندا هەڵگەڕاوم ، تەماشای دەوروبەری خۆم دەکەم ، ڕێ بە هەموو لایەکـدا دەڕوا ، گلۆپ لـــە دوورەوە دەبریسکێتەوە ، لـە دوورەوە دەنگی زەنـــگ دێ‌و زەوی کەوتۆتە ناو تەمێکی شین . خۆشە کـە هەست بکەم پێم لەســـەر خاکی خۆمـەو ئینجا سەیری دونیا بکەم .

پیـاو کـە لـە دایك دەبێ ، خۆی وولات بۆ خۆی هەڵنابژێرێ ، چی بـە نسیب بێ ئەو دەبێ . منیش هەرگیز پرسم پێ‌نەکراوە داخـــۆ

دەمەویٚ ببم بە داغستانی یان نە؟ لەوانە بوو لە شوێنێکی‌تری ئەم دونیایەو لە دایك‌و باوکێکی‌تر بوومایە؟ ئەو کاتە هیچ شوێنێکم بە قەد ئەو وولاتە خۆش نەدەویست کە لێی ببووم. من پرسم پێ‌نەکراوە، بەلاٚم ئەگەر ئەمڕۆ پرسم پێ‌بکەن داخۆ وەلاٚمم چ دەبێ؟

لە دورەوە ئاوازی پەندوورم دێتە بەر گوێ. ئاوازەکەو ووشەکان خۆیین:

**جۆگا هەمیشە خەو بە دەریاوە دەبینێ.**
**دەریاش لە خەوندا شەیدای جۆگایە.**
**دلێك بە فەراحی جێگەی لەناو یەك دەستدا دەبێتەوە**
**سەراپای دونیا قەت لەناو یەك دڵ جێی نابێتەوە.**
**هەموو وولاتێك جوانە،**
**بەلاٚم داغستانم لە هەموویان خۆشتر دەوێ.**

ئەمە تەنبوورژەن نەبوو، داغستان بوو بە زمانی تەنبوورژەنەوە دەدوا:

**ئەوەی بمبینێ و پێم ڕازی نەبێ**
**با بچێتەوە ماڵی خۆی.**

ڕەوشتێکی دێرینمان ئەوەیە کە لاوەکان شەوی درێژی زستان لە ماڵی گەورەیەك بە یاری جۆراوجۆر دەبەنە سەر. بۆ نموونە، کوڕێك لەسەر کورسیەك دادەنێن، کچێك لە دەورەی دەسووڕێ‌و گۆرانی دەڵێ. پاشان کچەکە لەسەر کورسی دادەنیشێ‌و کوڕە بە دەورەیدا دەسووڕێ‌و گۆرانی دەچڕێ. ئەم گۆرانیانە هەر چەندە نیشانەی بەستەی میللیان پێوە دیارە بەلاٚم بە تایبەتی بەستەی میللی نین. لە شێوەی گفتوگۆدان. ووشەی ژیرانە لە پیاوی ژیرەوە دێ،

پرسیاری زیرانە وەلامی زیرانەی دەوێ • ئەوەی بیاتەوە بادە شەڕابێکی خـەڵات دەکەن •

ئەم جۆرە یاریە لە ماڵی ئێمە ، لەســەر عـەرد دەکرا • زۆر جۆرە گفتوگۆ بە گۆرانی دەکرا • من بچووك بووم و بەشداری یاریم نەدەکرد، تەنیا گوێم ڕادەگرت ، لەبیرمە ئارەقی سەر بە کەف سجووقی خۆمـانە لەبەر ئاگر دادەندرا • مێزێکی سێ پێچکەیان لە ژووری دادەنا ، کوڕو کچ بە نۆرە دەوریان دەگێرا ، زۆر جۆرە گۆرانیان دەچڕی ؛ بەڵام لـە ئەنجامدا گفتوگۆ دەکەڕایەوە سەر داغستان و ئەو حەلە نەوانەی لـەوێ بوون بە کۆڕس وەڵامی پرسیارەکانیان دەدایەوە :

**« تۆ لە کوێی داغستان ؟ »**

**« لەسەر شاخێکی بەرزم ، لە دەم ڕووباری قۆیسوم • »**

**« تۆ چ دەکەی ، داغستان ؟ »**

**« سمێڵەکانم با دەدەم • »**

**« تۆ لە کوێی ، داغستان ؟ »**

**« لە شیوان بۆم بگەڕێ • »**

**« تۆ چ دەکەی ، داغستان ؟ »**

**« وەك پنجە جۆ ڕەپ ڕاوەستاوم • »**

**« تۆ کێی ، داغستان ؟ »**

**« گۆشتم و خەنجەر لەتی کردووم • »**

**« تۆ کێی ، داغستان ؟ »**

**« خەنجەرم و گۆشت لەت دەکەم • »**

**« تۆ کێی ، داغستان ؟ »**

**« مامزم و ئاوی ڕەوان دەخۆمەوە • »**

**« تۆ کێی ، داغستان ؟ »**

**« ڕوبارەو مامز دەمخواتەوە • »**

**« تۆ چیت داغستان ؟ »**

**« کچکەلێکم لەناو یەك دەست جێم دەبێتەوە • »**

**« بۆ کوێ دەچی ، داغستان ؟ »**

**« دەمەوێ شتێکی گەورەتر بدۆزمەوە • »**

بەم جۆرە لاوەکان گۆرانیان دەگوت‌و وەڵامی یەکتریان دەدایەوە • هەندێ جار وا هەست دەکەم کتێبەکانی منیش هەمان پرسیارو وەڵامیان تێدایە • بەڵام هیچ کچ لەسەر کورسی نیە بە دەوریدا بسووڕێمەوە • دەبێ خۆم پرسیارەکان دابنێم‌و هەر خۆیشم وەڵام بدەمەوە ، ئەگەر وەڵامەکەشم ڕاست بێ کەس نیە بادە شەڕابێکم خەڵات بکات •

« تۆ لە کوێی ، داغستان ؟ »

« لەو شوێنەم کە چیایەکانی منی تێدایە • »

« چیایەکانت لە کوێن ، داغستان ؟ »

« ئێستا کوێ هەیە چیایی منی لێ نەبێ • »

« دونیا لەگەڵێکی گەورەیەو تۆش تەنیا کەوچکێکی بچووکیت‌و بەس ، ئایا کەوچکەکە لە قەدەر ئەو لەگەنە گەورەیە زۆر بچووك نیە؟»

بەڵام دایکم دەیگوت : «دەشێ دەمی بچووك قسەی گەورە بکات • »

باوکم دەیگوت : « درەختی بچووکیش باخچەی گەورەی پێ دەڕازێتەوە • »

شامیل دەیگوت : « گوللەی بچووك کەشتی گەورە کون دەکات ».
من خۆیشم لە شیعرێکدا گوتوومە :

« دەشێ دڵی بچووك دونیای گەورەو خۆشەویستی گەورەی تێدا بێ . »

« بۆچی کە یێك هەڵدەدەی دەڵێی : لە چاوی چاکەخوازانەوە ؟ »

« چونکە من خۆم بە دوای چاکەدا دەگەڕێم . »

« بۆچی خانوو لەسەر تاوێرو شاخی بەرز دروست دەکەی ؟ »

« چونکە سووم لە خاکی بە پیتو بەرەکەت دەبێتەوە . دەتوانم نەختێ گەنمی لێ بچێنم . تا لەسەر بانی خانووش گەنم دەچێنم . خۆڵ دەبەمە سەر تەبکە شاخانو گەنمی لێ دەچێنم . ئەو نانەی دەیخۆم ئاوها دەستم دەکەوێ .



# سێ گەنجینەکەی داغستان

**من هەمیشە بە خەڵك دەڵێم :**

**« قەت بچووك مەبن با ژمارەشتان کەم بێ . »**

**وەسیەتنامەی شامیل :**

**« چیاییەکانم ! شاخە ڕووتو سەختەکانی خۆتان خۆش بوێ . شاخەکان کەمیان سامان پێبەخشیون ؛ بەڵام ئەم شاخانە نەبن وولاتەکەمان بۆ خۆمان نابێ . بەبێ وولاتیش چیایی بێکەس سەربەستیان نابێ . بۆیان بجەنگن . بیانپارێزن ... با شریقەی شیرتان لە گۆڕدا خەونی شیرینم پێببەخشێ » .**

چیایی گەڕیدەی بەردەوامن ، هەندێ چووینو بە دوای ساماندا دەگەڕێن ، هەندێ بە دوای ناوبانگدا دەگەڕێنو هەندێکیدیش بە دوای ڕاستیو دادەبەروەری .

ئەوانەی بە شوێن ساماندا چوو بوون ، پەیدایان کردو هاتنـەوەو ئێستا بەری گەشتەکەیان دەخۆن •

ئەوانەی بە شوێن ناوبانگدا چووبوون پەیدایان کردو ئێستا بـەو باوەڕە دەژین کـە گەشتەکـــە هیچ ناهێنێو تەقـــەلایان بێ هـوودە ڕۆیـوە •

بەڵام ئەوانەی بە شوێن ڕاستیو دادپەروەریدا چووبوون ئەوانـە ڕێـگایان زۆر دوورو بێ کۆتایی بوو ؛چونـکە خۆیان دەقەبەر گەڕانێکی هەمیشەیی کردبوو •

کـاتێ چیاییەك دەچێتە سەفەرێك ، بێ گومان کـەرێك لەگـــەڵ خۆی دەبات ، سێ شت لـە پشتی کـــەرە دڵسۆزەکەی باردەکـــات : خوارێـکی گەورەو جەوەندەیەکی بچووكو جەڕەیەك •

ســەدان ساڵە چیاییەکە دەگەڕێو لـە گوندێـــکەوە دەچێتــە گوندێـکیدیو لـە ناوچەیەکەوە دەچێتە ناوچەیەکی دی ؛ کەرەکەی بە پێشە خۆی داوەو خوارو جەوەندەو جەڕەی لەسەر پشتە •

لە وولاتێکی دەوڵەمەندا ، کاتێ کە چیاییەکە ساتێك کەرەکەی بـە تەنێ بە جێ هێشت هەرچیو پەرچییەکـان کەوتنـــە ئازاردانی کـەرە بەستەزمانەکەی ، دڕكو زەختەی تیژیان نیوەزەند بۆ ئەوەی لووشـــکان باوێ ، بێ حەشرو نەشرەکان گاڵتەیان پێدەهاتو دەیانگوت ، کەرەکـە سەماو هەڵپەڕکێ دەکات •

کابرای چیایی کـە بینی وا دۆستە دڵسۆزەکـــەی ئازار دەدەن ، خەنجەری هەڵکێشاو گوتی :

« تیز بە وورچ بکەن باشترە نەك بە چیایی • »

بەڵام ( بەکەلك چ نەهاتوو )ەکان ترسیان لێ نیشت و تەوازۆ یان بۆ خواستەوەو بە قسەی خۆش چیایەکەیان ڕازی کرد خەنجەری بخاتەوە کالان • کە هێور بوونەوەو هاتەوە سەرخۆ دەستیان بە پرسیاران کرد :

« باری کەرەکەت چیە ؟ بمانفرۆشێ ! »

« هێندە زێڕو زیوتان نیە کە پێتان بکڕێ • • »

« تۆ نرخەکەی بڵێ ، بزانین چۆن دەبێ • • »

« ئەمە نرخی تەواو نابێ • • »

« بۆچی ئەوە چیە پێتە کە نایەتە کڕین • • »

« وولاتەکەمە ، داغستانە ! »

گەنجەکان دایانە قاقای پێکەنین : « وولاتەکەت لە ماکەرێك بار کردوە ، دە وەرە ، ئێستا وولاتەکەی خۆتمان پێشان بدە • • »

چیایەکە خرارەکەی کردەوە مشتە خۆڵێکی ئاسایی تێدا بوو ، نەخێر خۆڵەکە تەواو نائاسایی بوو ، سێ چارەکی بەرد بوو •

« هەمووی ئەوەندیە ؟ ئەوە گەنجینەکەتە ؟ »

« بەڵێ شاخەکانمە ، یەکەم ویردی باوکمە ، یەکەم فرمێسکی دایکمە ، یەکەم سوێندی خۆمە ، دوا میراتی باپیرەمە بۆ من و دوامیراتی منیشە بۆ نەوەکانم • • »

« ئەدی چیترت پێیە ؟ »

« جارێ لێم گەڕێن خرارەکە ببەستمەوە • • »

کە خرارەکەی بەستەوەو هاویشتیەوە سەر پشتی کەرەکەی ، جەوەندەکەی کردەوە ، دیتیان ئاوی دەشتێی تێدا بوو ، بەڵام ئاوەکە تامی سوێر بوو •

« ئاوێکت پێیە ناخورێتەوە ! »

ئەمە ئاوی دەریای قەزوینە . داغستان وەك نەینۆك بــە ســەریدا دەڕوانێ . . »

« باشە ، ئەدی جەڕەکە ؟ »

« داغستان سێ پارچەیە ، یەکەم زەویە ، دوەم دەریایە ، سێیەمیش ئەوەیدی هەموە . . »

« کەوابوو ئەوەی دی هەمووی لەناو جەڕەکەتدایە » .

« بەڵێ ، وایە . . »

« باشە ئەدی بۆچی ئەم هەموو بارە لەگەڵ خۆت دەگێڕی ؟ »

« بۆ ئەوەی ووڵاتەکەم هەمیشە لەگەڵمدا بێ ، ئەگەر لــە ڕێگادا مردم ، خۆڵەکــە بەسەر گۆڕمدا بــکەنو کێڵەکــەم بە ئاوی دەریا بشۆن . . »

چیاییەکە پتە خۆڵێکی دەرهێنا ، لە پەنجەکانی خۆی هەڵسویو بە ئاوی جەوەندەکە شووشتیەوە .

« ئەمە بۆ وا دەکەی ؟ »

« ئەو دەستانەی بە دەستی هەرچیو پەرچیان کەوتوون تەنیا بەم جۆرە شوشتنە پاك دەبنەوە . . »

چیاییەکە ملی ڕێــگای خۆی گرت . هێشتا هەر لەگەڕاندایە .

بەم جۆرە داغستان سێ گەنجینەی هــەیە : چیاکــان ، دەریا ، ئەوەیدی هەمووی.چیاییش سێ گۆرانی هەیە ، دەروێشیش سێ دوعا، ڕێبواریش سێ ئامانج : سامانو ناوبانگو ڕاستی .

کە منداڵ بووم دایکم پێی دەگوتم : « داغستان باڵندەیەکە سێ شاپەڕی بە نرخی لە باڵدا هەیە • »

باوکم دەیگوت : « وەستاکان داغستانی ئێمەیان لە سێ کەرستەی بە نرخ دروست کردوە ••• »

بێ‌گومان ، لە ڕاستیدا ئەو کەرستانەی داغستان پێك دێنن گەلێ لەوە زۆرترن • من ئەمەم لە تاقی‌کردنەوەی تاڵەوە بۆ دەرکەوتوە •

پێش بیست ساڵ داوایان لێ‌کردم دەورێك بۆ فیلمێك لە بارەی داغستانەوە بنووسم ، نووسیم • ئینجا بوو بە گفتوگۆ لەسەر نووسینەکەی من‌و زۆر شت گوترا •

یەکێ گوتی گوڵی تەواو تێدا نیە ، یەکێکی‌دی گوتی هەنگی تێدا نیە ، سێیەم گوتی درەختی تێدا نیە • هەر کەسە ڕەخنەی خۆی پێشکەش کرد • بەلای هەندێکەوە باسی ڕابردووی کەم تێدا بوو ، بەلای هەندێکی‌دیکەشەوە باسی ئێستای کەم تێدا بوو • لە ئەنجامدا دەرکەوت کە هیچ کەری بە جاشکی تێدا نیە • جا داغستان بێ ئەمە چۆن دەبێ ؟ •

ئەگەر هەر چی ئەوان گوتیان لە فیلمەکەدا هەبایە فیلمەکە تا ئێستاش تەواو نەدەبوو •

لەگەڵ ئەمەشدا ، داغستان لە سێ بەش پێك دێ : چیاکان (زەوی)، دەریا (قەزوین) ، ئەوەی‌دی هەمووی •

بەڵێ ، زەوی : ئەمەیان شاخە ، دۆڵە ، زنجیرە شاخە ، تۆقەڵە چیایە ، ئەو خاکەی ئێمەیە کە بە ئارەقەو خوێنی باوك‌و باپیران ئاو دراوە • کەس نازانێ کامەیان پترە : ئارەقە یان خوێن • شەڕی

درێژخایەن ، پێکدادانی خێرا ، دوژمنیخوێن ، سەدان ساڵ بوو خەنجەر بۆ جوانی هەڵنەدەگیرا .

گۆرانیەکی میللی دەڵێ :

**لە کوێ ڕبە دەغلێکیان چاند :**
**خوێنی دەشۆڕە سواری لێڕژا**
**لە کوێ قەسناغە گەنمێکیان چاند ،**
**تا سەد شۆڕە سوار کەوتە گۆڕێ .**

باوکیشم لـە یادی زەوی خۆمانەوە نووسیویە :

**زۆر مردوو لێرە نێژراون**
**بەڵام ئەوانەی کوژراون**
**لەوانە زیاترن کە بە مەرگی خۆیان مردوون .**

کتێبە جوگرافیەکان بە کورتی دەڵێن سێیەکی وولاتەکەمان بەردی ووشـکە .

منیش نووسیومە :

**لێرە دۆڵ سیس بووین ،**
**لێرە درەخت وەك شاخ ڕووتن ،**
**لێرە چیای بەرز وەك پشتی حوشترو**
**لێواری سێلاوی شاخان وان .**
**لێرە شەپۆلی ڕووباری هەڵچوو ،**
**وەك گورگی چەنگ لەسەر شانی ڕان توورەیە .**
**لێرە کەفی تافگە وەك کەفی بەربەست وایە ،**
**کانی وەك چاوی چۆلەکە وان .**

**لێرە ڕێی ناو بەردی نەسبی زەوی**
**دەڵێی لەناو بەردان دێتە دەرێ •**
**لێرە گۆرانی لەو دیوی گرد هەڵدەستێو**
**پێش هەموو کەس دەگاتە دوور دوور**

سەر لە بەیانی ڕادیۆ بڵاوی دەکاتەوە کە لە خونزاخ بەفرە ، لە ئاختی بارانە ، کەچی لە دەربەندا گوڵە قەیسی دەپشکوونو لە کوموخ گەرمایەکی سووتێنەرە •

زستان ، پایز ، بەهار ، هاوین ، پێکەوە لە داغستانی بچکۆلەدا هەن !! چیای سەختو کپو لرمەدار ـ کە هێلانەی هەڵۆیانە ، ئەم کەژانە لێك جودا دەکاتەوە •

وشەی (مێـر)ی ئاڤاری دوو مانای هەیە : شاخ ، لووت • باوکم حەزی لە نوکتەو وشە بازی بوو :

« شاخەکان دونیاو هەموو ڕووداوێکو هەموو گۆڕانێکی ئاوو هەوا بۆن دەکەن • »

حاجی موراد دەیگوت : «دەشت هەستایەوە سەر پەنجەی پێ بۆ ئەوەی بزانێ کێ دێو بە مەوەش شاخ بەرز بوەوە • »

دایکم دەیچرپاندە سەر لانکێ : « بەژنت بە قەد چیاکان بڵند بێ •»

**ئەی ئاوی ڕوباری کەودەنی شاخاوی ،**
**تۆ نەبی بەرد شەق دەبا •**
**بۆچ تەنگاوی بۆ ئەو شوێنەی**
**بە بێ تۆش ئاوی زۆرە •**
**ئەی دڵ ، ئەی دڵەکەم !**
**دەردی من ئەوەیە :**
**تۆ ئەوانەت خۆش ناوێ کە تۆیان خۆش دەوێ •**
**کەواتە بۆ شەیدای ئەوەی**
**کە پێویستی بە ئێمە مانان نیە ؟**

دایکم که دەیدی بەلـکارەکان هـەوڕو هیرباری گڵینەی وەکو : جەڕەو جەلەو گۆزەو شـەربە دەفرۆشن ، دەیـگوت : ئەرێ ئەوانـە چۆن دڵیان دێ ئەوەندە خاکـە سـەرف بـکەن ؟ چـاوم بەرایی نادا تەماشای ئەوان کەسان بکەم کە خاك دەفرۆشن • »

بێ گومان بەلکارەکان وەستای دەستڕەنگینن ، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆڵ لـە شاخان زۆر دەگمەنە ، ئێمە هەمیشە وا هەست دەکەین خۆڵەکە خۆی گەلێ لەو هیربارانە بەنرخترە •

لە ڕۆژگاری کۆندا جارێکیان قاسیدێك بە هەشتاوی خۆی کوتایە ناو دێیەکـەوە • پیـاوەکـان هـەموو بۆ نوێژ چووبوونە مزگـەفت • سوارەکە بە پێڵاوەوە چوە ناو مزگەفت • مـەلا هـاواری کرد : کورە هـەی مسقۆف ، بێ مێشك ، نازانی دەبێ پێڵاوت داکەنی ئینجا بێیتە ناو مزگەفت ؟! »

ـ « تۆزی پێڵاوم خـاکی شیوو دۆڵی خۆمە ، گەلێ لە مافوورەکانی ئێوە بەنرخترە • ئێستاکە کەوتۆتە بەر هێرشی دوژمنێکەوە •

چاییەکان هـەموو لـە مزگەفتێ دەربەڕینو خۆیان هەڵدا سـەر ئەسپەکانیان •

ئەبوتالیب مەراقی بوو دەیگوت : « میوانی دوورە ڕێ خۆشەویسترە کـە لـە دوورەوە بێ دیارە یان خـەبەرێـکی زۆر خۆشی پێیـە ، یان خەبەرێـکی زۆر ناخۆش • یەکێ ئیشێکی گرنـگی نەبێ لە دوورەوە نایـە • »

ڕەوشتمان وایە ئەگـەر میوانێ لە ماڵەکەتدا حەز لە شتێ بـکاو پێی هەڵبڵێ ـ ئەگـەر سەختیش بێ دەبێ پێی بەخشیت • بـگرە دەڵێن

گەنجێ وازی لە ژنی خۆی هێنا بۆ میوانێك کە لەسەر کانی حەزی لێ کرد بوو ، بەڵام دەبێ ئەمە چاپیەکی بێ وێنە بێ •

میوانی ناکەس بەچە دەتوانێ ئەم ڕەوشتە دێرینەمان بە هەل وەربگرێ ؟ بەڵام چاپیش کەمۆتر بووین • وا ناکەن میوان چاوی بە هەموو شتێکی جوان بکەوێ •

زۆر لە مێژە میوانێکی خەڵکی (کوموخ) هاتە گوندو دەستی پێ کرد هەر چی کەوتە بەر چاوی پێی هەڵگوتو هەرچی کەوتە بەر چاوی دایانێ ؟ بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێش ئەوەی بڕوا پێڵاوەکانیان بێ داوەشاندو خۆڵو تۆزەکەیان لێ تەکاندو گوتیان :

« خۆڵ ناکرێتە دیاری ، خۆڵ نابێ ببرێتە دەرێ ، خۆڵمان کەمە ئەگەر خەڵکی هەمووی بە پێلاوەکانیان بەن ئەدی گەنممان چۆن دابچێنین • »

بێگانەیەك بە وولاتەکەمانی گوتوە : « توورەکە بەرد • » بەڵێ وولاتەکەمان نەرمەڵانی کەمە ، پیاو بە دەگمەن لە شاخان درەختی دەکەوێتە بەر چاو •

چیاکان خۆشیان لە سەری تاشراوی مریدانو لە پشتی لووسو چەماوەی کەران دەکەن • خۆڵ کەمەو دەرامەتی کەمترە •

جاران دەیانگوت : « ئەم بەستەزمانە ئەوەندەی دەغڵ نیە کونە کەپووی دراوسێکەی پێ پڕ بێ • »

ڕاستی کەپووی چیایان گەورەو زلە • لە دوورەوە ، کە دوژمن گوێیان لە برخو هۆڕی چیایان دەبوو دەیانزانی نووستوونو زۆر جار کتوپڕ بەسەریان دادەدان •

ئەبوتالیب دەم‌و چـاوی بە خوریکەی کابرایەکی بینی ، گوتی :
« هەموو دەغڵ‌و دانی زەوی باوکم لە دەم‌و چاوی ئەم کلۆڵە چـــەقیوەو نیشانەی هەر پێوە دیارە » .

لـە شاخاندا زەوی زۆر بچکۆڵەو بێ‌پێتە . چیرۆکێك لەم بارەیەوە هـەیە . ڕەنـگە بیستبتان چونـکە چیرۆکی وا بـە دونیادا دەگـەڕێ ، لەســەر بانێـکەوە دەپەڕێتەوە ســەر بانێکی‌دی ؛ بەڵام من دەمەوێ هەر بیگێڕمەوە . با ئەوانەی بیستوویانە لۆمەم بکەن .

جیایێك ویستی زەویەکەی بکێڵێ ، زەویەکەی ماوەیەکی زۆر لە گوندەوە دوور بوو ؛ بۆیە لە تێوارەوە بە ڕێ کەوت بۆ ئەوەی سەر لە بەیانی زوو دەست بە ئیش بکات.چوە شوێنەکەو کەپەنکەکەی ڕاخست‌و پاڵی دایەوە . بەیانی لە خەو هەستا دەست بە کێڵانی زەویەکەی بـکا ؛ بەڵام هیچ زەوی دیار نەبوو . ئـــەم لای پشکنی ، ئەو لای پشـــکنی ، نەیدۆزیەوە . دەشێ تاوانێـکی بووبێ‌و لـــە سزای ئەو تاوانە خـــوا زەویەکەی لێ سەندبێتەوە ؟ بۆیشی هـەیە شـەیتان لێی شاردبێتەوە تا پیاوێـکی چـاك‌و خێرەومـەند تەفرە بدا . کـابرا چ بـکا ؟ بڕیاری دا بگەڕێتەوە ماڵێ . کەپەنکەکەی هەڵگرت‌و ـ وای خوایە ـ وای کـرد زەویەکەی لە بن کەپەنکەکەدا بوو .

ئێستاش باسێکی‌ترتان بۆ دەگێڕمەوە . چیرۆك نیـە ، ڕوداوێـکی ڕاستەقینەیە .

کـە خـەریك بوون کولخۆز لـە جیاکان بکەنەوە وەکو هـــەموو شوێنێـکی‌دی وولات دوودڵی‌و گومـــان‌و مشت‌و مـــڕو بیـروباوەڕی جۆراوجۆر پەیدا بوو . زۆر ماڵاتیـــان کردە قوربانی ، زمانی حـــاڵی خاوەنەکەیان دەیگوت : « خۆمان بیخۆین باشترە ، نەك بیدەینـــە ئـەم

کولخۆزه کەس نەناسە • »

پیلەکەو لاملی چیایان لە گوندە دوورەکاندا زۆر توندو تیژ بوو :

« هی خۆم بۆ خۆم هی خۆت بۆ خۆت ، چیتان لە ئیمە دەویٚ ، ئەوەی هی خۆمانە ببیٚ بە هی ئیوە ؟! »

دوو سەد لیرسراوی دەسەلاتدار هاتنە گوندیکی بچووکو هەمووشیان بە دەست بە تالی گەرانەوە • هەندیك هەر خۆیان پیشانی خەلك نەدا • هەندیکیدی مشتو مریکی زۆریان لەگەل خەلك کرد • چیایەکان دەیانگوت :

« بۆچی شتی هاوبەش لەم سەرزەمینەدا هیندە کەمە ؟! ئاسمان هاوبەشە ، رۆژ هاوبەشە ، باران ، بەفر ، زیٚ ، ریٚ ، گۆرستان ، ئەو هەموو شتە هاوبەشەمان بەسە • ئەوەیدی با هەر کەس شتی خۆی هەبیٚ • »

کە بە چیاییان گوت : کولخۆز مەکینەتان دەداتیٚ • سەریان باداو گوتیان مەسەلەی ریوییە :

ریوییەك بە دۆلیکدا دەرۆیشت • دونگە مەریکی قەلەوی دی لە چەقی ریگا کەوتبوو ، وای تیستا نەی خۆی ! ریوی نەختیٚ بیری کردەوە : « نەخیر دونگە مەڕ خۆڕا لەو گۆرە ناکەویٚ • ئەم ماستە موویەکی تیدایە • »

بە چیاییەکانیان گوت کولخۆز لە دەشتی خواریٚ زۆرتان پاوان دەداتیٚ • لەو کاتەدا پیرەمیردیك هەستاوەو خۆی بەسەر گۆچانەکەی داداو گوتی : هیلانەی شاخاوی‌و پارچە زەوییە بچووك‌و تەلانە ڕکەکانمان

بــه هــەموو دەشتی دونیا نادەین لێرە ، زەوی زەوی خۆمانە • ســەدان ساڵە وەك منــداڵی نەخۆش بەخێوی دەکەین ، خۆڵی بۆ سەر دەخەین و بەردەکان ژێر گڵ دەکەین ، ئاویان بۆ ڕادەکێشین • گەنممان کەمە بەڵام هــەر دنکێکی هێنــدە بە نرخە نایەتە کڕین • هەر بۆیەشە لێرە سوێنــد بە پەلکە نان دەخوێن •

لەگەڵ ئەمە شدا کولخۆز لــەم گوندە ســەر ڕەقە کرایەوە • باشە چیایە کۆڵەوارەکانیان چۆن ڕازی کرد ؟

ئــەوە بوو دوا جار زانیــان زەوی هــەموو هــەر بۆ کولخۆز نابێ یەکــەو هەندێــکی بۆ دەمێنێتەوە بــە کــەیفی خۆی دەناوی بێنێ و ســەر بە ماڵی خــۆی بێ •

ـ چیایەکان پرسیان : باشە ئەو پارچەی بۆمان دەمێنێتەوە زۆرە ؟
ـ بە پێی یاسای کۆمەڵەی کشتوکاڵی ، سەرو (٢٥) سوتکایە •
ـ سوتــکا چیە ؟ پێمان بڵێ !

کــە لێپرسراوی دەسەڵاتدار بۆی باس کردن سوتکا چیە چیایەکان بە یەك دەنگ گوتیان :

ـ دە کەواتە ناومان لە کولخۆز بنووسە ؛ قسەمان نەما •

دەرکەوت هــەر چیایەك زەوی خۆی لەو پارچەیە کەمترە کــە بۆ هــەر ئەندامێکی کولخۆز داندراوە •

ئەگەرچی ئــەم وڵاتە شاخاویە پڕ بەردەو ژیانی تێــدا سەختو ناخۆشە ؛ بەڵام چیایی زۆریان بە لاوە ئازیزە • ڕێبوار سەریان ســـوڕ دەمێنێ کــە تەماشای زەوی بڵند بڵند دەکەن بە قەد شاخانەوە نووساون ، یان پەڕیونەتە ســەر تۆپکە شاخان ، یان کــە ڕەزی ناو بەردەڵانان دەبینن

یان کـه مەڕ دەبینن بەسەرهەڵدێرو تیشە شاخاندا ڕێچکە دەبەستن‌و وەك پاڵەوانی سەر تەناف بە مەعلانی دێن‌و دەچن •

ئەم هەموو شتە زاخاوی چاوەو بۆ زمانی شاعیران دروست بوە بەڵام کارو زیانی تێـدا سەختە •

سەرەڕای ئەمەش ئەگـەر پێشنیار بۆ چیایەك بکەی کە لە دۆڵـدا بژی ئەمەت بە ئیهانەت‌و سووکی لێ‌وەردەگرێ •

دەڵێن کوڕێك لـە شـار هاتەوەو باوکی هان دا بۆ ئەوەی لە شاخ بار بـکا • پیرەباب وەڵامی دایەوە :

« بە خەنجەرەکەت وورگم هەڵدڕە باشترە ، نەك بەم قسانە شەق‌و پیلم بـکەی • »

گیروگرفتێك سـەری هەڵدا بوو • گیروگرفتێکی دژوار • چـەند ساڵ بوو ئەم دروشمە لە گوندان هەڵواسرا بوو :

« با تورەکـە بەرد بـە جێ بێلین‌و لەسـەر مافووری گوڵ‌گوڵی نیشتەجێ بین • »

ئەم دروشمە گەیشتە ئەو گوندە سـەر ڕەقـەی کـە دوو سـەد لێرسراوی دەسەڵاتداری بۆ چووبوو تا کولخۆزی لێ بکەنەوە ، بـەڵام ئـەو کاتەی کولخۆزی لێ‌دەکرایەوە وەکو ئێستا بە هەراو هۆریا نـەبوو کـە دروشمی بارکردنیان بیستبوو • هـەر گوندەو قسەی خۆی لـەم بارەیەوە هەبوو •

هـەر چیایەك جۆرە وەڵامێکی ئەم پرسیارەی دابوەوە • ئەمـانە کەمێکیانن :

« ئەگەر بە زنجیریش ڕامبکێشن ناچمە پێدەشت » .

« وەك بزماری لەو شاخانە کوترا بێ ئاوها لە شوێن خۆم دەچەقم و هیچ کەسێك ئەو مافەی نیە لە هێلانەکەم دەرمکێشێ » .

« کوڕی باب و باپیران دەم بەش دەکەنەوە ئەگەر جێیان بێلین و بچین لە شوێنێکی تردا بژین » .

« لە هیچ شوێنێك سەرم وەکو سەر بالیفی خۆم ناحەسێتەوە » .

« نووستنی سەر بەردی خۆت لە نووستنی سەر بالیفی بێگانان شیرینترە » .

« لەوێ بەردم لە کوێ دەست دەکەوێ دەسەگانی بگرم ؟ »

« بەر ئاگری بە تەپ و دووکەڵی شاخان لەبەر سۆبەی نایابی خواری باشترە » .

« ئەوەی لە خەمی وورگی خۆی دایە با بچێ ، ئەوەی خەمی دڵی لەبەر بێ لێرە دەمێنێتەوە » .

« ئێمە کەسمان نەکوشتوە ، چ ماڵمان نەسووتاندوە ، بۆ دەرمان دەکەن ؟» « مەکینە لێرەش ئیش دەکا » « لێرەش گڵۆپی کارەبایی بە دارەوە دەکرێ » .

« بروسکە دەگاتە ئێرەش » « ئێمە بۆیە نەهاتووینەتە دونیا تا ببین بە خۆراکی کێچ و مێش » « دوکەڵی زبڵ لە بۆنی پاشەڕۆکی سوتەمەنی پیشەسازی باشترە » .

« گوڵەشاخ گەشترن » .

« ئاوی کانی لە ئاوی بۆڕی سازگارترە » .

« ئێرە جێ ناهێلین و ناچینە هیچ شوێنێ‌دی » .

بەم جۆرە هەر یەکە جۆرە وەڵامێکی ئەم دروشمەی دابووەوە :

« با تورەکە بەرد بە جێ بێلین و لەسەر مافووری گوڵ گوڵی نیشتە جێ بین ... »

چیایەکان پرسیان بە باوکیشم کرد : ئاخۆ بار بکەین یان بمێنینەوە ؟ باوکم نەوێرا وەڵامێکی ڕاست و دروستیان بداتەوە : « ئەگەر بڵێم بمێننەوە

ڕەنگە پاشان پێیان بگاتەوە کە زیانی خواریێ خۆشترەو جوێنم پێبدەن •
ئەگەر بڵێم بار بکەن‌و پاشان زیانی ئەولای سوودی نەبێ دیسان جوێنم پێدەدەن • »

جا هەمزە تساداسا پێی گوتن : « ئێوه خۆتان بیری لێبکەنەوە • »
ڕۆژگار دەگۆڕێ‌و زیان لەگەڵ خۆیدا دەگۆڕێ • نەك تەنیا سەرپۆش گۆڕاوە ، تەپڵە بۆتە شەپقە ـ بگرە مێشکی ژێر سەرپۆشی لاوانیش گۆڕاوە •

خوێن تێکەڵ دەبێ • خوێنی خێڵ‌و گەلەکان تێکەڵ دەبێ ، گۆڕی کوڕەکانمان لە گوندی باوکیان دوور دوور دەکەوێتەوە •

بەرد ، تات ، گاشە ، چەگڵ ،کەلابەرد ، تیشە بەرد ، بۆ داچاندنی شتێ لەسەر ئەم خاکە بەردەڵانە دەبوایە بە سەبەتان خۆڵ سەر بخەن •
زستان‌و پایز ئاگر لە گیای تەلانان بەردەدرا تا گیای باشتر لێ شین بێ •
ئەو ئاگرانەی سەر شاخانم لە بیرە • ئاهەنگی یەکەم خەتە جووتم لە بیرە • بە هاران پیرەمێرد کەستەکیان دەهاویشتە یەك •

گەلەکەمان بە پیاوی ئیشکەر دەڵێن : « گەلێ چیاو تۆقەڵە شاخی بڕیوە • »

بە پیاوی زەغەلیش دەڵێن : « هیچ جارێ لە بەردێك نەنەویوە • »
باشترین ئاواتە خواز ئەوەیە : « تەبارەت پڕ گوڵەگەنم بێ »
گەورەترین جوێنیش ئەوەیە : « زەویت ووشك بێ‌و بمرێ • »
پیرۆزترین سوێندیش ئەوەیە : « سوێندم بەم خاکە • »

ئەگەر کەر بچووبایە ناو دەغڵ‌و شینایی خەڵك دەیانکوشت‌و لە کیس ساحێبی دەما •• جاییەك هاواری کرد : « وریا بن ئەگەر کەری حاجی موورادیش بێتە ناو دەغڵی من هەر یەکە ! »

هـەر گوندەو یاسای خۆی هـەیە ؛ بەڵام لە هەموو شوێنێ ئـەو کـەسەی زەوی‌و خـاك تێك بدا توندترین سـزا دەدرێ • هـەر لەبەر ئەمەشە کە مێژووی شاخەکانمان سەبارەت کاولکاری گرانترین سزایان داوەتە داغستان خۆی •

من شتێکم لە یادە کە دایکم پێی گووتوم :

« کاتێ لەشکری نادر شا شـکاو هـات هـەڵو مەرجی ئاشتی بێتـە کایەوە ، چیاییەکانمان پیرەمێردێکی پووخەڵەی ، پیسکەی نابووت‌و گیڕو وێڕیان سواری ئێسترێکی کەترە کردو ناردیانە لای شا • »

« ئافارەکان کەسی بە مەرتەبەترو بە سەرو سیماتریان نەدۆزیـەوە بینێرنە لام ؟ »

پیرەمێرد وەڵامی دایەوە :

« هەزارەهای لە من بە مەرتەبەترو بەسەرو سیماتر هەن ؛ بـەڵام پیاوی گرنگ بە ئیشی گرنگترەوە خەریکن بڕیاریاندا ئەگەر یەکێـکی وەکو من بنێرنە لای یەکێکی وەکو تۆ سەرو بەر دەردەچێ • »

شا ویستی گاڵتەی پێ بکا :

« ئێسترەکەت تەمەنی چەندە ؟ »

« قڕساندنی تەمەنی ئێسترو پاشایان کارێکی زەحمەتە • » داگیرکەر لێی پرسی :

« لە شەڕدا کێتان سەرکردەیە ؟ »

پیرەمێرد بە هێمنی وەڵامی دایەوە :

« سەرکردەکانمان لێرەن دەستی بۆ چیاو تەپـکە شاخ ، بۆ زەوی‌و گۆڕستانەکان درێژ کرد : « ئەمانەن پێشەوامان • »

« مەرجتان ؟ »

« تەنیا یەك مەرج هەیە : وولاتی چیایان بۆ چیاییان بەجێ بێلەو زۆرمان پێخۆشترە پشتمان تێبکەی نەك ڕوو • »

بەم جۆرە شا ناچار بوو بکشێتەوە ئێران •

پێیان گوت : « بۆیە خۆتو سەربازەکانت بە زیندوویی بەر دەدەین تا باسی سەرکەوتنمان بکەن • بۆیە بەرەلاتان دەکەین تا بینە قاسید ـ وا باوە دەڵێن جارێکی تر قڕاتان بۆ دێنین • »

لە ئابی ١٨٥٩ ئیمام شامیل لەسەر شاخی گونیب لە ئەسپەکەی دابەزی‌و وەك دیلێکی گەورە لەبەر دەم میر باریاتینسکی ڕاوەستا • پێی چەپی بۆ پێشەوە هاویشتو خستیە سەر بەردێك • دەستی ڕاستەی خستە سەر قەفتەی خەنجەرەکەی‌و بە چاوی تەڕەوە سەیری شاخەکانی دەورو بەری خۆی کردو گوتی :

«سەردار ! ئەوە بیستو پێنج ساڵە بۆ سەرفرازی ئەم شاخانەو بۆ خاوەنەکانیان دەجەنگم ، نۆزدە برینم لە لەشدا دەکولێتەوەو سارێژ نابن • ئێستا وا بۆت دادێنم‌و وولاتی خۆمت تەسلیم دەکەم • »

« هەر خەفەتی پێ‌دەوێ ! وولاتەکەتان زۆر خۆشە ، شاخ‌و بەردە ! »

« سەردار ! پێم بڵێ لەم شەڕەدا هەق بە لای کامماندا بوو : ئێمە کە بۆ وولاتێك دەمردین‌و بڕوامان بە جوانی هەبوو یان ئێوە کە بۆی دەمردن‌و بڕواتان بە ناخۆشی هەبوو • »

شامیلی یەخسیر مانگێکی خایاند تا گەیشتە سانت پترسبۆرگ • لەوێ قڕاڵ لێی پرسی : « لەم گەشتەدا چ شتێ سەرنجی ڕاکێشای ؟ »

« وولاتێکی گەورە ، وولاتێکی زۆر گەورە ! »

« ئیمام پێم بڵێ ئەگەر بتزانیایە ڕووسیا هێندە گەورەو بەهێزە ئەو ماوە درێژە شەڕت دەکرد ، یان وەکو پیاوێکی ژیر دەمو دەست چەکت دادەنا ؟ » .

« تۆ دەتزانی وولاتەکەمان بچووکو بێهێزە بۆیە ئەو ماوە درێژە لەگەڵمان جەنگای . »

باوکم نامەیەکی هەڵگرتوە کە شامیل نووسیویە یان بڵێین وەسیەتنامەی شامیلە ، ئەویش ئەمەیە :

« چیایەکانم ! شاخە ڕووتو سەختەکانی خۆتان خۆش بوێ . شاخەکان کەمیان سامان پێبەخشیون ؟ بەڵام ئەم شاخانە نەبن وولاتەکەمان بۆ خۆمان نابێ . بە بێ وولاتیش ، چیایی بێ کەس سەربەستیان نابێ . بۆیان بجەنگن ، بیانپارێزن با شریقەی شیرتان لە گۆڕدا خەونی شیرینم پێ ببەخشێ . »

ئەگەرچی چیایی لە پێناوی شتێکی‌تردا دەجەنگان بەڵام شامیل زۆر شریقەی شیری کەوتە بەر گوێ .

وولاتی داغستانیان فراوان بوە . گۆڕیان بەسەر کێڵگە دوورەکانی ئوکراناو بیلۆڕوسیاو هەرێمی مۆسکۆو هونگاریاوپۆلەنداو چیکۆسلۆفاکیاو بەناو کارپانیو بالکانو دەوروبەری بەرلیندا وەر بوە .

بەڵێ ناوی ئەندامەکانی کۆمۆنەی ڕوسیاو هەنگاریاو ئەو سەربازانەی کە لە زۆر لاوە هاتنو لە پێناوی ئازادی چیایەکانمان خۆیان بەخت کرد ، لە شاخە بەرزەکانی داغستان هەڵکەندراون . گۆرانی هەر یەکێکیان بۆتە گۆرانی ئێمە ، گۆرانی هاوبەشی ئێمەش بۆتە گۆرانی

ئـــەوان ٠

**« لە ڕۆژگاری دێرینندا خەڵـکی گوندێك لە ســەر چی بەشـــەڕ دەهاتن » ؟**

**« لەسەر قولانجە (نینجــە) خاکێـکی نێوان زەوی دوو چیـایی ، لەسەر تەلانێکی بچووك ، لەسەر یەك بەرد » ٠**

**« خەڵـکی گوندە دراوسێکان لەسەر چی بەشەڕ دەهاتن ؟ »**
**« لەسەر قولانجە خاکێکی نێوان زەوی گوندەکان ٠ »**
**« داغستان لەسەر چی لەگەڵ گەلەکانی دیدا بەشەڕ دەهات ؟ »**
**« لەسەر قولانجە خاکێکی سەر سنووری داغستان ، خۆی ٠ »**
**« پاشان داغستان لەسەر چی بەشەڕ دەهات ؟ »**
**« لەسەر قولانجە خاکێکی سەر سنووری یەکێتی سۆڤیێتی مەزن ٠»**
**« ئەدی ئێستا داغستان بۆچی تێدەکۆشێ ؟ »**
**« بۆ ئاشتی سەرانسەری جیهان ٠ »**

کـە شامیل بە دیل گیرا دوو کوڕی خۆی لەگەڵ گیران ٠ هـەر یەکـە بە جۆرێك ژیانی بردە سەر : ئـەوەی بچووکـتریێ ـ محـەمەد شافی ـ لە سوپای قڕاڵدا بوو بە جەنڕال ٠ ئەوەی گەورەتریێ ـ قـازی محەمەد ـ کەوتە تورکیا ٠ ٠

ڕۆژێکیان پیرەژنێـکی سەر سپی هاتە لام جلی تورکی لەبەر بووەژنە خۆی جۆرجی بوو ٠ بە عازەبی مێردی بە تورکێك کردبوو ٠ چل سـاڵ لـە ئەستەنبۆڵ ژیابوو ٠ پاشان کـە مێردەکـەی مردو بە تەنێ مـــایەوە گەڕایەوە جۆرجیـا ٠ ئێستا هاتبوە لای من هۆی هاتنیشی ئەوە بوو لــە ئەستەنبۆڵ بە هۆی کوڕەبچووکەکەیەوە ببوە برادەری نەوەکانی شامیل ٠

لێم پرسی : گوزەرانیان چۆنە ؟ »

« شرن !! »

« بۆ ؟ »

« چونکە داغستانیان لـە دەست چوە • بریا بتزانیایە چـەند بـە حـەزرەت داغستانن • جـار جارە فەرمانبەرەکان پەستیان دەکـەن ، هـەرەشەیان لێدەکـەن کـە ملکیان لێبسێننەوە • نەوەکانی ئیمامیش دەڵێن : بیانبـەن ! ئێمـە داغستانمان لە دەست چـوە تازە هـەموو خاکێکی‌ترمان بە لاوە بێ‌نرخە • »

پیرەژن پێـدا چـوو ، گوتی : « کە زانیان دێمەوە مـاڵێ داوایان لێ‌کردم سەردانێکی داغستان بـکەم‌و بچمە گوندەکەی شامیل‌و ئـەو شاخانەی شەڕی لێ‌کردوون ، بێمـە لای تۆ • ئەم دەسرۆکە یان دامـێ بۆ تۆ تا هـەندێ خۆڵی داغستانی تێ‌بکەی‌و بۆیان بنێری •

دەسرۆکەکەم کردەوە ووشەی «شامیل»ی بە پیتی عارەبی لەسـەر نەخشا بوو •

چیرۆکی پیرەژنەکە بزواندمی • پەیمانم دا خۆڵەکە بنێرم بـەڵام پرسم بە پیرەمێردان کرد •

پیرەمێردەکان وەڵامیان دامەوە :

« خۆڵ نابێ بۆ خەڵـکی دی بنێردرێ بەڵام بۆ نەوەکانی شـامیل قەیدی نیە • »

یـەکێ مستە خۆڵێـکی لە گوندەکـەی شامیل بۆ هێنام‌و لـە دەسروکەکەمان پێچا •

کـابرا گوتی : « خۆڵی ئێمەیان بۆ بنێرە بەڵام پێیان بڵێ :

هـەر تۆزقاڵێکی ئەوەندە بە نرخـە نایەتە کڕین ، بۆشیان بنووسە کـە ژیانی ووڵاتەکەمان گۆڕاوە ، سەردەمێـکی نوێ هاتۆتـە پێشەوە • هەموو شتێکیان پێ بڵێ ، با بزانن • »

بەڵام پێویستی بەو نامــە نووسینە نەکرد ، خۆم ڕێم کەوتە تورکیا. بریاسکە بەنرخەکەم لەگەڵ خۆم برد .

بە دوای نەوەکانی شامیلدا گەڕام . هیچێکیانم نەدۆزیەوە . پێیان گوتم کوڕی نەوەی ئیمام ســـەفەری کردوەو چــۆتە شوێنێ ، ڕەنــگە مەکــکە بێ .

(نەجابەت) و (نەجیە)ی کچە زای شامیلیش لێم نەهاتنە دەرێ . پێیان گوتم : یەکێ ژانە سەریەتیو ئەوەیدیکە دڵەکروزێ .

جا خۆڵەکە بدەمە کێ ؟ ئاڤاریدیش لەوێ هــەبوون بەڵام ئــەوان بە کەیفی دڵی خۆیان داغستانیان بە جێ هێشتبوو .

تێگەیشتم کە شامیلی منو شامیلی ئەوان جودایە . !

بەم جۆرە ، لەوێ لــە تورکیــا بووم . مستە خۆڵێکی داغستانم بە دەستەوە بوو . لەم مستە خۆڵەدا گوندەکانی خۆمانم دەدی : گونیب ، جیرکی ، ئاختی ، کوموخ خونزاخ ، تسادا ، تسوتتا ، چــەرەدا ، ئەمــە وولاتی منە . زۆرم لەبارە نووسیوە . هێشتاش دەنووسم . ئێستا هەرگیز وەکو چیایە بەدبەختەکەی نوکتە کۆنەکە بە کەبەنکێك پێت داناپۆشرێ. دووەم گەنجینەی داغستان دەریایە .

گفتوگۆیەکی تەلەفۆنیە لە نێوان مۆسکۆو گونیب :

« هەلۆ ! هەلۆ ! گونیبە ! عومەر ، ئــەوە تۆی . گوێت لێمـــە ؟ ڕۆژەکەی چۆنە ؟ میزاجت چۆنە ؟ »

« گوێم لێتە . لێرە ڕۆژەکەی خۆشـــە . لە بەیانیــەوە دەریامان لێدیارە . . »

یا ڕەنگە بەمَ جۆرە بێ :

« هەلۆ ! گونیبە ! فاتم ، ئەتۆی ؟ وەزع چۆنە ؟ باشی ؟ »
«وا وایە • تەمە • دەریا دیار نیە • • »
جەمالەدینی کوڕی شامیل بە باوکی گوت :
« بابە ، دەریا نابینم • • »

جەمالەدین مەرونە بوو لای قڕاڵو لە کۆلێژی سەربازی خوێنـد بوویو کـــە گەڕایەوە نیشتمان بە شتێکی پووچ لە خـــەباتی باوکیو چیایەکان دەگەیشت دژی قڕال •

شامیل وەڵامی دایەوە :
ـ دەبینی کوڕم ، دە تۆ بە چاوی من سەیری کە !

دەریا سەدو پەنجا کیلۆمەتر لـە چیـای گونیب دوورە • ئەگـەر یەکێ بڵێ دەریام لێ دیارە دەبێ ڕۆژ چـەند ساف بێو دەریا چـــەند شینو بێو چـاوەکە چـەند تیژ بێو چیاکە چەند بەرز بێ !!

لـە گوندی واشـدا کـە دەریا دیار نەبێ ، ئەگەر لە خەڵـکەکە بپرسی داخۆ چۆنن • هەیە وەڵامت دەداتەوە :

« باشم • دەڵێی دەریام لەبەر چاوە • • »
کێ ، کێ دەڕازێنێتەوە ؟ ـ دەریای قەزوین داغستان دەڕازێنێتەوە ؟ یان داغستان دەریای قـەزوین ؟ کـــێ دەبـــێ شانازی بە کێوە بـکا ؟ چیایەکان بە دەریا ! یان دەریا بە چیایەکان ؟

کە تەماشای دەریا دەکەم تەماشای هـەموو دونیا دەکـەم • کـــە دەریا هەڵدەچێ دەڵێن لە هەموو دونیا گەرداوە ، کە دەریا دەنیشێتەوە هێمنی باڵ بەسەر هەموو شوێنێکدا دەکێشێ •

کە تەماشای دەریا دەکەم تەماشای هەموو دونیا دەکەم •

هێشتا منـــداڵ بووم کـە بـە تولــە ڕێی پێچاو پێچی شاخاندا شۆڕبوومــەوەو هاتمــە کن دەریا • لــەو کاتەوە پەنجەرەکانی ماڵەوەم بەســەر دەریادا کراونەتەوە • پەنجەرەکانی داغستان خۆیشی بەســەر دەریادا دەڕوانن •

کـە دەنـگی دەریام نەگاتە گوێ گران خەوم لێدەکەوێ • «ئەدی ئەتۆ ، داغستان ، تۆ بۆ ناخەوی ؟ »

« دەریا کپە • خەوم نایە • »

دەرهەق ڕەنـگی گەش دەڵێن : « وەکو دەریایە » • دەرهــەق دەنـگی بــە تین : وەکو دەریایە • دەرهەق کێڵگەی فراوانی جـاودار وەکو دەریایە • دەرهەق قووڵیی گیانو ژیری : وەکو دەریایە ، هــەتا لەبارەی ئاسمانی ساماڵیشەوە دەڵێن : وەکو دەریایە •

کاتێ مانگاکەمان زۆری شیر دەدا دایکم پێی دەگوت : «دەریاکەم»• دایـکم لە بیرە لەسەر بالکۆن مەنجەڵۆکە ماستێکی سەربەسەرتووی بە دەستەوە بوو • کــەرەی لێدەگرتو دەرخواردی ئێمەی دەدا • کـــە منداڵ بووینو بە دەوریدا یاریمان دەکرد • لێواری مەنجەڵەکەی بە خەناوکەی لەپکەو مرواری دەریا ڕازابووەوە •

دایکم دەیگوت : «ئەمــە بۆ ئەوەیە کەرەکـەم بە بەرەکەت بێ »و دەیگوت ئەو مروارییانە بۆ چاوزار باشنو لــە چاوی پیسی دەپارێزن •

گەردەنی بەردینی داغستانیش بە ملوانکەی مرواری دەریا ، بـــە ملوانکەی چەو ، بە ملوانکەی شەپۆلی کـەفاوی ڕازاوەتەوە •

داغستان لە دەنـگی شەپۆلەکانی قەزوین ڕاهاتوە ، لە بێدەنـگیدا خراپ خــەوی لێدەکەوێ • ئەگەر دەریای لێ قەدەغـە بـکرێ قــەت خەوی لێناکەوێ •

ئەی شەپۆلی وەك بەفر سپی‌ی دەریا ،
پێم بلێ بە چ زمانێ دەمدوێنی ؟
تۆ لەبەر پێی چیاکانەوە لرمەت دێ ،
دەڵێی گوندی چیاییمانی بازاڕی تێدا کراوەتەوە ؛
چونکە خۆیشی لەو چیاییانە ناگا
کە بە چل زمان دەدوێن .
ڕۆژ دێو دەڕوا هیچ دەنگ نیە .
دە وەك گیای دەشت خششەت بێ .
ڕەنگە هەڵبچی‌و کەف بکەی
وەك دایکێ بۆ جگەرگۆشەی کوژراوی بگری ،
وەك پیرەمێردێ بۆ ڕۆڵەکەی بناڵێنێ .
وەك ئەسپێ نسکۆی هێنابێ‌و لە لافاودا بخنکێ .
ئەی دەریا ، تۆ بە زمانی خۆت دەدوێی .
جارێ نەرم‌و هێمنی‌و تاوێ توندو تووڕەی .
بەڵام دڵم لە ناخت ڕاهاتووەو
من لە هەموو گۆرانیەکانت دەگەم .
ئەدی دڵیشم جاروبار ناکوڵێ‌و
شەپۆل لەسەر کەناری کەودەن ناشکێتەوە ؟
پاشان لە خاو بوونەوەی هێمن‌و نزم
قەدی لێوار دەلێسێتەوە .
ئەدی ناخ چ نهێنی ناپارێزێ ؟
ئەی دەریا ، ئێمە خەم‌و شادیمان
بەلاوە یەکە .
بەڵام من باسی ئازاری خۆم دەکەم .
پەرۆشم تینوێتیم بە ئاوەکەی بشکێنم .
بەڵام ناکرێ . ئاوەکە سوێرە .

شەمەندەفەری مۆسکۆ لەگەڵ گەردی بەیانی دەگاتە مەحەج قەڵا ئەو شـەوە لە هەموو شـەوان بێ‌تۆقرەترم . نیوەشەو لە خەو ڕادەبم‌و لـە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوە دەکەم . هەر دەشتەو لێك‌دەکشێتەوە . شەمەندەفەر لرمـەی دێ‌و (با) لە تەنیشت فارگۆنەکانەوە وورشەی دێ .

جـاری دووەم لـە خـەو ڕادەبم‌و لـە پەنجەرەوە تەماشای دەرێ دەکەم . دەشتە . ئینجا لە کۆتاییدا ، بۆ جاری سێیەم دەریا دەردەکەوێ .

کە وا بوو ئێستا ئەمەیە داغستانی من •

سوپاست دەکەم دەریای شین • پانتایی ئاوی بێ پەی‌و سنوور !!
تۆ یەکەم کەسی کە مزگێنی گەیشتنە ماڵەوەم پێ دەدەی !

باوکم دەیگوت : «ئەوەی دەریای هەبێ هەرگیز بێ‌میوان نابێ» •

ئەبوتالیب لێی وەردەگرتەوە : «ئەوەی دەریای هەبێ زیانێکی بە پیت‌و بەخشندەی دەبێ • •

ڕەنگە چیا زۆر لە دەریا جوانتر بن ؛ بەڵام ئێمە ئەوانیشمان هەن •

ئەو دوو پیرەمێردە ـ ئەبوتالیب‌و باوکم ـ کە تووشی یەکتر دەبوون زۆر جار بە بێ ئەوەی ورتەیان لە دەم بێتە دەرێ وەردەسووڕانەوەو بەرەو دەریا دەچوون • دەچوونە سەر گردێك ئەو هەموو کەشتیانە یان لێ‌دیار بوو کە دەهاتە بەندەرەوە • بۆنی خوێ‌و ماسیان بۆ دەهات • چەند ساتێك بە کپی دادەنیشتن • ماوەی قسەکردنیان دەدایە دەریا •

**با دەریا بدوێ ؛ بەڵام تۆ ووس بە**
**نە خەم دەربڕەو نە خۆشی**
**دانتی مەزن شەو هەستی ڕادەگرت**
**کە دەریا لەبەر پێیەوە کەفی دەکرد •**
**ڕووبار پڕ خەڵك بێ یان چۆڵ**
**لێ‌گەڕێ با دەریا گۆرانی بڵێ**
**زایەڵەی شەپۆلەکان دووبارە مەکەوە •**

پوشکین ـ ئەو پیاوە مەزنەی کە زێڕی لە دەم دەباری ـ کە دەریا گۆرانی دەگوت ، بێ‌دەنگ دەبوو •

باوکم دەیگوت : «گوێ لە دەریا بگرە ، فێر بە تێبگەی چ دەڵێ • دەریا زۆری دیوە • زۆریش دەزانێ • •

— ئەی دەریا ، پێم بڵێ بۆ سوێری ؟
— شەپۆلەکانم پڕ فرمێسکی مرۆڤن •
— ئەی دەریا ، پێم بڵێ بۆ ڕەنگاوڕەنگی ؟
— ناخەوەم پڕ مەرجانە •
— ئەی دەریا ، پێم بڵێ بۆ پەشۆکاوی ؟
— زۆر بوێرو ئازا لە ناو شەپۆلەکانم فۆتاون : هەندێ وایان دەزانی سوێر نیمو هەندێکیش خۆیان تێدا نقوم کردمو مەرجانیان دەویست •

دوو چیایی سەرو ڕیش ماشو برنج ، دوو شاعیر ، وەکو دوو بیرە هەڵۆ لەسەر گردێك دادەنیشن بە بێ دەنگی دادەنیشنو هەستو خوست لە خۆیان دەبڕنو گوێ لە دەریا دەگرن • دەریا دەگرمێنێ ، بیری ژیانێکی وەکو خۆی دێنێو هەرچی جۆرە هەوایەکی بێ بە سەر دەریادا تێ دەپەڕێو لەم کەنارەوە دەچێتە سەر ئەو کەنار ؛ بەڵام بە پێچەوانەی دەریاوە ژیان بەندەری ئاسوودەی نیە ، شۆستەی نیە تێدا بگیرسێتەوە • حەز بکەیو حەز نەکەی دەبێ بکەویە ناویەوە • تەنیا یەك بەندەر هەیە، یەك شۆستە هەیە ئەویش ئەنجامە •

قەزوین دەگرمێنێو دەنەڕێنێ • دەریای خفالین دەنەڕێنێ ڕووبارەکان تێی دەکەنەوە : لە لایەکەوە ڤولگاو ئورال ، لە لاکەیترەوە کوارو تەرەك سولاك • هەموو تێکەڵ دەبنو ئێستا پیاو نایانناسێتەوە • ئەوانیش دەریا دوا بەندەریانە • لەگەڵ ئەمەشدا ئاوەکەیان لە ناو ناچێو نامرێ • هەر دەڕواو بە شەپۆلی شین بەرز دەبێتەوەو لە هەموو لایەکی دونیاوە کەشتی گەورە سواریان دەبێ •

چیایینە ، ڕۆلەکانی داغستان ، ئەرێ چارەنووسی ئێوەش وەکو هی

ڕووبارەکان وا نیە ؟ ئێوەش یەکتان گرتوەو لەناو یەك دەریای گەورەی برایەتیدا تواونەتەوە .

قەزوین دەگرمێنێو دەنەڕێنێ . دوو پیرەمێـردی سـەرو ڕیش ماش‌و برنج بە کپی وەستابوون . منیش لەگەڵیاندابووم‌ەهێشتا گەنج‌بووم؛ بەڵام پاشان کە بەرەو ماڵ بوینەوە ئەبوتالیب ڕووی کردە باوکم :

« کوڕەکەت وا گەورە دەبێ . ئەمڕۆ هەستی بە سۆزێکی گەورە کردوە » باوکم وەڵامی دایەوە : «کەس ناتوانێ لەو شوێنەدا بچووك بێ کە ئێمەی لێ وەستابووین . »

ئێستا کە دەچمە کەناری دەریا هـەمیشە وا هەست دەکـەم لـە تەنیشت باوکم ڕاوەستاوم .

دەڵێن ساڵ بە ساڵ قەزوین تەنکاوتر دەبێ . ئەو شوێنەی جـاران شـەپۆلی لێ‌دەشکایەوە دەبێتە شـارو خـانووی تێدا قیت دەکرێتـەوە . لەوانەیە ڕاست بێ . بەڵام قەت بڕواناکەم دەریایەك لە کورتی بدا دەریا بێ ڕەنـگە تەنکتر بێ بەڵام بچووکتر نابێ .

من هەمیشـە بە خـەڵك دەڵێم : «قەت بچووك مەبن با ژمـارەشتان کـەم بێ . »

**دونیا سەری ڕادەهەژێنێ**
**شاعیر غەمبارەو نووسەر پەست .**
**چونکە قەزوین ڕۆژ بە ڕۆژ**
**دەکشێتەوەو تەنك دەبێ .**
**وا بزانم ئەمە ورێنەیە .**
**ئاخر پیرە قەزوین چۆن کەم دەکا ؟**
**کەم بوونی هەندێ کەس .**
**لەوەش ناخۆشترو سەختترە .**

(مەحەچ)یش باسی دەریای کردوە • مەحەچ یەکەم قومیسەری شۆڕشگێڕانە بوو لە داغستان • ئێستا پێتەختی کۆمارەکەمان ناوی ئەوی لێە • پێشان ناوی پۆرت پترۆفسك بوو • لە شەڕی نیشتمانیدا مەحەچ کردی بە قەڵایەکی پۆڵایین •

مەحەچ لە بارەی دەریاوە گوتوویە : « دوژمنمان هەر چەندە زۆر بێ فڕێیان دەدەینە ناو دەریا • دەریا قووڵەو لە بنەوە جێگەی هەموویان دەبێتەوە • »

کاتێ چایبەکانمان لە تەنیشت مزگەفت یان لە ژێر پیرە درەختێکدا کۆ دەبنەوەو باسی ئەمو ئەو دەکەن ئێمە بەم کۆبوونەوەیە دەڵێین (گۆدەکان) • جارێکیان لە گۆدەکاندا پرسیار کرا :

« خۆشترین دەنگت لەبەر گوێدا کامەیە ؟ »

زەلامەکان بیریان کردەوەو یەك یەك وەڵامیان دایەوە :

« زرنگەی زیو • »

« حیلەی کەحێل • »

« چرتەی سمی ئەسپ لەسەر بەردی دۆڵ • »

« دەنگی دڵبەر • »

« پێکەنینی منداڵ • »

« لایلایەی دایك • »

« خوڕەی ئاو • »

بەڵام چایبەك گوتی : « دەنگی دەریا چونکە دەریا ئەو هەموو دەنگانەی تێدایە کە ئێوە گوتتان • »

جارێکیدی پرسیان : جوانترین ڕەنگ کامەیە کە بکەوێتە بەر دڵەوە ؟ دیسان بیریان کردەوەو وەڵامیان دایەوە :

« ئاسمانی ساف • »

« ترۆپکی بەفرینی شاخ • »

« چاوی دایك • »

« برجی کوڕ • »

« دارخۆخ لە گوڵ دەرکردندا بێ • »

« دارچناری پایزان • »

« ئاوی کانی • »

بەڵام چیاییەك گوتی : «ڕەنگی دەریا چونکە دەریا ئەو هەموو ڕەنگانەی تێدایە کە ئێوە گوتتان • »

لە گۆدەکاندا ، ئەگەر یەکێ پرسیار لە بارەی دیمەنێك یا تامی خواردنەوەیەك ، یا هەر شتێکی‌تر بکات هەمیشە وەڵامەکەی دەریایە •

ئەفسانەی جوان لە بارەی دەریاوە هەن • گەنجەکەو کچە پاشای بەحری یا باڵندەی لازوەردی کە دەنووکی لە هەر کوێ بدابایە کانی لێ‌دەردەبوو •

بێ‌گومان لە گۆدەکاندا هەر کەسە بە ئەسپی خۆی هەڵدەلێ • ئەدی منیش وا ناکەم کە گۆرانی بە دەریای قەزوینەوە هەڵدەلێم ؟! جارو بار هەندێ کەس پێم دەڵێن : « بە ڕاست قەزوین هەر دەریا نیە گۆلێکی گەورەیەو هیچی‌تر • دەریای ڕەش دەریای ڕاستەقینەیە ، ئا !! »

ڕاستە قەزوین بە قەد دەریای ڕەش یا ئەدریاتیك یا دەریای ئایۆنی گەورەو فرەوان نیە ؛ بەڵام خەڵکی بۆ حەسانەوەو مەلەو ڕابواردن دەچنە سەر ئەوان کەچی وەك دەستوورێك تەنیا بۆ ئیش دەچنە

سەر قەزوین • قەزوین دەریای ماسیگرانە ، هەی نەفتەوانانە ، هەی کەسێکە کە ئیشی سەخت بکا • بۆیە خۆی لەوان بەهێزترە • چار چیە ، هەر گایەك شێوازی خۆی هەیە ، هەر پیاوێك کەسێتی خۆی هەیەو هەر دەریایەك ڕووی خۆی ، شێوازی خۆی •• هەیە • بێجگە لەمەش ئەدی چیاکانی داغستان شێوەیان لە چیاکانی جۆرجیاو ئەبخازیاو هەر یەکێکیتر جودا نیە ؟

هەر چۆنێك بێ دەبێ بێ لیبنێم کە بەلای منەوە هەموو دەریاکان لە یەك دەکەن • کە دەچمە ناو دەریای ڕەش دەریای قەزوینم دێتەوە یاد • کە لە ناو دەریای قەزوینیش بم هەمیشە ئۆقیانووسم دێتەوە بیر • دەریاکەمان بە هیچ جۆرێ هیچی لەوانیدی کەمتر نیە • کە خەڵکی لێرە دەڕۆن بۆ یادیگار پارە دەقنجێنن بەو مرازەی کە جارێکیدی بێنەوە • هەر وەکو لەگەڵ هیدیش وایان کردوە •

باوکم دەیگوت : « ئەگەر یەکێك هیچ جوانی لە دەریادا نەبینێ ، دیارە خۆی جوانی تێدا نیە • »

جارێکیان یەکێك بە ئەبوتالیبی گوت : « دەریا ئەمڕۆ دەنگی زۆر خۆش نیە • »

« بە گوێی من هەستی لێڕاگرە • »

« کەوابو بە چاوی داغستان سەیری قەزوین بکەنو دەبینن جوانە • »

کوشتارە مەردانە بێهاوتاکەی کابتن (محەمەد حاجیف) غەواسی گوندی «گونیب»ی داغستانی لە هەموو دەریاوانێك دیارە • لە دەریای بەلتیكو دەریای باکوورو دەریای بارینتس جەنگی • توربیدەکانی ،

ئەلێ کەشتی نازیان ڕەوانەی گۆڕی سارد کرد • غەواسەکەی ئـــەو یەکەم شت بوو کە کەشتیگەلی نازیانی خستە ژێر دەستی خۆیەوە ••• دەستورێـکی هەبوو : تەنیـا پاش نقـــووم کردنی کەشتیەکی دوژمن ، سمێلی بادەدا •

جارێـــکیان محەمەد حاجیفم دی • لـــە بویناکدا ، لە کۆلێجی ئەباشیلۆف/ی ڕاهێنانی مامۆستایان دەمخوێنـدو محەمەد حاجیف لەسەر ڕۆیشتن بوو کە داوامان کرد قسەمان بۆ بکات •

یەکێك پرسی : « تۆ لەناو بەردان گەورە بووی چۆن بووی بـــە کەشتیوان ؟ »

« کە منداڵ بووم ، لەســەر ترۆپـکی شاخێـکەوە قەزوینم بینی ، بانـگی کردم ـ منیش چووم ـ نەمتوانی گوێ بە بانگەکەی نەدەم • »

محــەمەد حاجیفی چیـــایی قارەمانی یەکێتی سۆڤێت لـە دەریای بارینتسدا فەوتا • کۆتەلەکەی لە مەحەچ قەڵادا ، بەرامبەر ئەو کارگەیەی بــە ناوی ئــەوەوە کـــراوە دەڕوانێتە دەریای قەزوین • لـــە شاری (سیڤیرۆمسك)دا قوتابخانەیەکی بە ناو کراوە •

ئەوەی ئازا بێ ئەو دەچێتە ناو دەریا ؟ بەڵام هەموویان ناگەڕێنەوە هــەر بۆیەشە چیاییەکان یەکەم گوڵی بەهــار دەهاوێژنە ناو دەریا ـ ڕیزو حورمەتە بۆ هەموو مردوەکـــانی • زۆر جـــار گوڵی منیش بەســـەر شەپۆلاندا ڕۆیشتوون •

لەو شوێنەی کە حاجیفـو کەشتیڕانەکەی لـە دەریای بارینتسدا فۆتان هەموو جارێ کەشتیەکان لە شەرافەتی ئەوەوە کەمێك دەوەستن •

ڕەوشت وایە ، لە دەریای قەزوینیشدا بۆ ماوەی سێ دەقیقە لە یادی

شەهیدەکانیدا بە بێ دەنگی دەوەستن •

شاری مەحەج قەڵامان وەکو کەشتی کەنار وەستاوە • لە مارین پارکەوە پوشکین دەڕوانێتە دەریا ، لە نزیک ئەویشەوە سلێمان ستالسکی ڕاست بۆتەوە •

باوکیشم لە ڕاستە شەقامەوە بەسەر قەزویندا دەڕوانێ •

دەڵێن ئەو شوێنەی ئێستا دەریای لێ هەڵدەچێ کاتی خۆی بیابانی ڕووتو سامناك بوە چاوی بە شاخان کەوتوەو لە خەنی خۆشیان شینایی خۆی بە بەر پێ وەر کردوون •

دەڵێن وەختی خۆی چیاکان عەزیا بوونو هەمیشە لەگەڵ یەکدی بە شەڕ دەهاتن • کە چاویان بە دەریا کەوت لە سەرسامیان هەستیان لێ بڕاو بوونە بەرد •

دایکم لایلایەی بۆ دەگوتم :
**ڕۆڵە ، گەورەبیو**
**بەژنت بە بەژنی چیا بێ**
**ڕۆڵە گەورە بیو**
**وەك دەریا فراوان بی •**

کچیش بە شۆڕەسواری خۆی هەڵدەگوت :

**دیارە لە شاخی سەرکەش لە دایك بووی**
**بە مەردی تەپڵەت داگرتو**
**هەر تەماشایشت نەکردین •**
**دەعیەت گەورە بوە ، ها !!**

شۆڕەسواری گەنجیش بە نازداری چیایی خۆی هەڵدەگوت :

**خۆ لە بنی دەریاوە**
**بۆمان نەهاتووی ؟**



## جوانی وام
## پێشتر نەدیوە ؟

ئەم قسەیەم لە کۆبوونەوەیەکدا بیست :

ـ ئەوە چیە ؟ قسە نەمـا هەر باسی دەریاو چیا ، چیاو دەریا بکەین • چیـاو دەریای دیمان هـەیە باسیان بـکەین ـ دەریایەك باخی لیزجیو دەریایەك مێگەلو چیایەك خوریمان هەیە •

ڕاستە دەڵێن : « خۆت هـەر سێ گۆرانی مەڵێ • یەکی بۆ ئێمـە لێگەڕێ • خۆت هـەر سێ نوێژ مەکـە • یەکی بۆ ئێمە لێگەڕێ • »

باسی ئـەو دوو بەشە سەرەکیەم کرد کـە داغستان پێك دێنن • بەشی سێـەم ئەوەیتر هەمووە • چما ئەویش هێنـدە کـەمە ـ ڕێـگەو ڕووبارە ، درەختو گیایە ، سەراپای تەمەنم بەشی ئەوە ناکا باسیان بکەم•

گۆرانیش هەمـان شتە • تەنیـا سێ گورانی لە دونیادا هـەیە • یەکـەم گۆرانی دایـکە ، دوەم گۆرانی دایـکەو سێیەمیش ئەوەی‌دی هـەمووە •

کـە چیـایی داوەت بـکەن بچێتـە میوانداریان ، دەڵێن : « وەرە کنمـان چیاکانمان ، دەریاکانمان ، دڵەکانمـان هی خۆتن • وولاتمان وولاتە ، ماڵمان مـاڵە ، ئەسپمان ئەسپی ڕاستەقینەیەو پیاومان پیـاوە • سێیەمیان لە نێودا نیە •



# پیـاو

نووسینی سەر کێلی گۆڕێك :

**ئەمە زانایەکی ناودار نیە ،**
**ئەمە پالەوانی گەل نیە ؛**
**بەلآم ڕێزی بگرە چونکە**
**پیاو بوو ، ئازاد بوو .**

نووسینی سەر خەنجەرێك :

**لە ڕێـگادا تووشی هەر کەس هاتی ،**
**دۆست بێ یان دوژمن**
**کە خەنجەرت پێیە ، لە بیرت نەچێ**
**ئەویش وەکو تۆ پیاوە .**

لە زمانی ئافاریدا ، یەك ووشە بۆ «پیاو» و « ئازادی » بـە کاردێ «ئوزدەن» یانی «پیاو» و «ئوزدەنلی» یانی «ئازادی» جا ئەگەر یەکێ بیـر

---

(١) ( Man ) دوومانا هەلدەگرێ پیاو وئادەمیزاد .

سە ئوزدەن ـ پیاو ـ بکاتەوە بە « ئوزدەنلی ـ ئازاد »ی دەبینێ •

چاپیەك باش بزربووتێکی زۆر گەڕایەوە نیشتمان •

لێیان پرسی :

ـ لەوێ چ باسە ؟ خاکیان چ خاکە ؟ چ ڕژیمیان هەیە ؟

چاپیەکە وەڵامی دانەوە :

ـ پیاویان هەیە •

کە حاجی مورادو شامیل بوو بە دەمەقاڵیان • هەندێ کەس کەوتنە زەمکردنی شامیل بۆ ئەوەی نایب ڕازی بکەن •

بەڵام نایب بە توندی لە دەمی دانەوەو گوتی : « قسەی وا نەکەن ، شامیل پیاوە • دەمەقاڵیەکمان بوە خۆمان پێك دێین • »

هەر چەندە حاجی موراد لە شامیل دابڕا ، بەڵام شامیل لەدوا شەڕدا کە لە چیای گونیب بوو ، نەبەردیو ئازایەتی نایبی هاتەوە یاد ، گوتی :

ـ مانەندی نیە ، پیاو بوو •

سەدان ساڵ بوو پیاو لە شاخان دەژیان ؟ دەبوایە هەمیشە هەر پیاوی ڕاستەقینە بن ، وا نەبوایە ژیان نەدەبوو •

چاپیەك دەڵێ : « بە پیاوی بوویمو بە پیاویش دەمرم • »

دەستوورێکی چاپیە : « زەویو ئەسپ بفرۆشە ، هەرچی هەتە بیچوێنە ، بەڵام هەرگیز پیاوی ناوەوەت مەفرۆشەو هەترەی مەکە • »

نەفرەتێکی چاپی : «یاخوا بەرەبابتان پیاوو ئەسپی تێدا نەمێنێ • »

کـه باس بێته سـەر باسی کابرایەکی نابوت‌و پووخەڵە و تڕوهات چاپیەکان لە کورتی دەیبڕنەوە :«قسەی لێ‌خەسار مەکە» پیاو نیە • »

کاتێ کـە یەکێك باسی ئیشێکی کرێت یان کـەم‌و کورتیەك بـکا چاپیەکان قسەی بێ دەبڕن : « پیاوە ، ئەمەی لێ‌ناگیرێ • »

خەڵکی کـە باسی گوندێکی شڕو ناکۆك‌و ئاڵۆزو شەڕاوی‌و بـە کەلك‌چنەهاتوو بـکەن دەڵێن : « پیاوی تێدا نیە » کـە باسی گوندێك بـکەن ئاشتی‌و تەباو تفاقی باڵی بەسەردا کێشا بێ دەڵێن : «ئەوانە پیاون!»

پیـاو یەکـەم پێویستی‌و بایەخ‌و موعجیزەیە • پیاو کـەی هاتۆتە داغستان ؟ سـەرەتا لە کوێ بوو ؟ ڕەگی تاقە خێڵی چاپیەکان لە کوێوە هاتوە ؟ زۆر چیرۆك‌و ئەفسانە هەن • من بە منداڵی ئەمەم بیستوە :

مەڵ‌و دڕندە لە دونیادا هەبوون • شوونیان بە زەویەوە دیار بوو ، بەڵام هیچ شوونی پیاو (بنیادەم) دیار نەبوو • زۆر دەنـگ دەهات بەڵام دەنـگی ئادەمیزاد نەبوو • زەوی بە بێ پیاو وەکو زاری بێ زمـانو سنگی بێ دڵ وا بوو •

هـەڵۆ کـە باڵندەی ئازاو بەهێزن ، لەسـەر ئـەم زەویەدا بـە ئاسمانەوە دەسووڕانەوە • ئەو ڕۆژەی کـە باسی دەکـەم بەفر دەباری ، بەفرێـکی ئەوەندە خـەست بوو دەتگوت هـەموو باڵندەکان پەڕو باڵیان کێشراوەو دراوەتە دەم با • هـەور گوێی دەعەردی نابوو • بەفر زەوی داپۆشی بوو • هـەموو شت تێـکەڵ ببوو • ئاسمـانو زەوی لێك نەدەکرانەوە • هەڵۆیەك بە ناو ئـەم هەموو شتەدا دەگەڕایەوە لانەکەی • هەڵۆیەك بوو باڵی وەکو شیرو دەنووکی وەکو خـەنجەر • ئایا ئـەو بەرزایی لـە بیر نەما بوویان بەرزایی ئەوی لـە یاد نەمابوو ؟ بەڵام هەر

چۆنێك بێ خۆی به بەردێکی ڕەق دادا • ئافار دەڵێن ئەمە لـــە چیـای گونیب بوە • لەك دەڵێن لـە تورجیــداغ بوە • لیزجیان دەڵێن لـــە شاخداغ بوە ، بەڵام لـە هــەر کوێ بووبێ شاخ هەر شاخەو هەڵۆ هەر هەڵۆیە • خۆڕا نیە کە گوتراوە : « بەردێك بە باڵندەیەك دابدە باڵندەکە دەمرێ ، باڵندەیەك بە بەردێك دابدە دیسان هەر باڵندەکە دەمرێ • »

ڕەنــگە ئەمــە یەکــەم هەڵۆ نەبێ کە لە شاخان پەڕەم بــە پەڕەم دەبێ ، بەڵام ئەمــەیان کــە باڵی وەکو شمشێرو دەنووکی وەکو خەنجەر وا بوو نەمرد ، باڵەکــانی شــکان بەڵام دڵی هــەر لێی دەدا • دەنووکی تیژی نەشکاو چرنۆکە ئاسنینەکانی ساغ دەرچوون • »

« ئێستا هەڵۆکە دەبوو لـە پێناوی ژیانیدا تێبکۆشێ • بە بێ باڵ پەیداکردنی خواردن زەحمەت بوو ؟ بە بێ باڵ زەحمەت بوو دوژمـن لـە خۆی پاس بـکا • ڕۆژ بە ڕۆژ لـە شاخێکەوەبۆ شاخێکی دی پێدا هەڵزناو هەڵکشا تا گەیشتە ئەو بەردەی حــەزی دەکرد لەسەری بنیشێو ســەیری شاخەکانی دەوروبەری خۆی بــکا •

بە بێ باڵ زەحمــەت بوو بتوانێ خۆراك پەیدا بـکات ، بەرگری لە خۆی بـکات ، بەسەر بەرزاییەکـاندا هەڵبگەڕێ ، هێلانەیەك دروست بـکات • لــەم هــەوڵو تەکانە سەختو ناخۆشانەدا ماسوولکەکانی هەڵۆ گۆڕان • دیمەنیشی گۆڕا • کــــە لـــە ئەنجامدا هێلانەی دروست کرد هێلانەکە کوخێکی چایی بووو هەڵۆی بێباڵیش ببوە چایی • »

« هەڵۆ هەستایەوە ســەر پێیانو باڵەکانی بوو بە قۆڵ • لەتێـــکی دەنووکی بوو بە کەپوویەکی ڕاستەقینەو نەختێ گەورە،لەتەکەی تریشی بوو بــە خــەنجەرێك کــە لەبەر پشتێنی چاییاندایە • تەنیا دڵی نەگۆڕا هەر دڵی هەڵۆ بوو • »

دایکم گوتی : « کوڕم ! بەم جۆرە دەبینی هەڵۆکە چەند تەگەرەو ناخۆشی دی تا بوو بە چیایی • دەبێ ئەمە بزانیو بە هەندی هەڵبگری •»

من ناتوانم بڵێم ئەمە هەمووی ڕاستە ، بەڵام شتێکی مسۆگەر هەیە : چیایی هەڵۆیان زۆر خۆش دەوێ • بە پیاوی ئازاو کۆك دەڵێن هەڵۆ • کە کوڕێك دێتە دونیاوە ، باوکی بە شانازییەوە دەڵێ : هەڵۆیەکم بوە • ئەگەر کچێك بە لەز لە شوێنێك بێتەوە دایکی دەڵێ : هەڵۆکەم فڕیەوە ماڵێ •

لە کاتی شەڕدا کتێبێك لە بارەی قارەمانانی داغستان نووسرابوو ناوی : «هەڵۆی شاخان» بوو •

دروشمی لە ئاسن دەرهێنراوی هەڵۆ زۆر جار لە سەر دەرگەی خانووی کۆن ، لەسەر بێشکان ، لەسەر خەنجەران دەبینرێ • بێ گومان ئەفسانەی تریش هەن •

کاتێ کە بیر لە گۆڕانی ژیانی ئەم دونیایە دەکەینەوە ، کاتێ باوك کوڕی لە دوورەوڵات کوژراویان دێتەوە یاد ، یان کوڕ باوکی مردوویان دێتەوە بیر دەڵێن چیاییەکان لە هەڵۆ نەکەوتوونەتەوە بەڵکو هەڵۆکان لە چیایان کەوتوونەتەوە •

**ئەی هەڵۆینە ، کە بەسەر ڕووبارو تەلاندا دەفڕن ،**
**ئێوە لە کوێ هاتونو چ خوێنێکتان لە دەمار دایە ؟**

**— زۆر جگەرگۆشە شەهیدکراون**
**ئێمە دڵی ئەوانین • دڵیان باڵی لێ ڕواوە •**

**— ئەی ئەستێرەی درەوشاوەی ئاسمانی تاریك ،**
**ئێوە کێن ؟**

**— زۆر گەنجی چیایی شەهید بوون**
**ئێمە چاوی ئەو کەسانەین کە بۆ شەهیدان دەگرین •**

هەر بۆیەشە ئێمەی چیایی هەمیشە بە هیواو خۆشەویستیەوە چاو دەبڕینە ئاسمان • سەیری ئەو باڵندانە دەکەین کە دێن و دەڕۆن • چیایی ئاسمانی شینیان خۆش دەوێ •

١٩٤٢م لە بیرە هێزەکانی مارشال کلیست هەندێ چیای قەوقاسی گرتبوو • فڕۆکەکانیان چاڵە نەوتی «گرۆزنی»یان بۆمباباران دەکرد • لە چیاکانی داغستانی خۆمانەوە دووکەڵەکەمان دەدی •

لەوان ڕۆژاندا نوێنەری لاوانی گەلەکانی قەوقاس لە گرۆزنی یەکدیگر ببوون • منیش یەکێك بووم لەوان •

ڤالنتین ئەمیرۆفی پاڵەوانی یەکێتی سۆڤێت ، کە فڕۆکەوانێکی ناوداری لیزجیان بوو ، وتارێکی دا • هەرگیز دوانەکەیم لە بیر ناچێ • ئەو دوو سێ قسەم لە بیر ناچێ کە پاش کۆبوونەوەکە لەگەڵی کردین • کە ڕۆیشت سەرنجێکی سووکی لە ئاسمان دا :

« بەلەم بچمە ئەوێ • لەوێ پێویسترم تا لە سەر زەوی • »

دوای دوو حەفتە لەناو چوو • ئەم کوڕە قۆزەی داغستان ئاگری تێبەر بوو ، کلوکۆی دامردەوە • بەڵام هەر کاتێ هەڵۆیەك ببینم بە ئاسمانەوە بە سەر سەرماندا بفڕێ وا دەزانم دڵی ئاگرینی ڤالنتین ئەمیرۆفی تێدا لێدەدا •

١٩٤٥ • مۆسکۆ • ئێمەی قوتابی هەموو ڕۆژێ دەچووینە دایەرەی نوێنەری داغستان و دەنگ و باسی داغستانمان وەردەگرت • کۆمارەکەمان خۆی بۆ ئاهەنگی یادی بیست و پێنج ساڵەی دامەزراندنیەوە ئامادە دەکرد • جارێکیان لەوێ تووشی (نەبی ئەمینتایف) بووم کەس نیە لە داغستان ئەو لەکە ، ئەو گەنجە بێنازە ، ئەو شۆڕەسوارەی

ئاسمانان نەناسیٚ کـە زۆر جـــار بە پەڕەشووت خـــۆی فڕیٚ دابوە ناو جەرگـەی دوژمن‌و هـەموو جاریٚش بە ساغ‌و سەلامەتی گەڕابوەوە • گوتم ، ئیٚستا ئەوە شەڕ کۆتایی هات • جا بگەڕیٚوە داغستان •

- ئاسمان هەر ماوە •

پاش چەند ڕۆژیٚ ڕافدا ویٚنەکەی لەگەڵ ئەم ڕون کردنەوەیەدا بلاوکردەوە :

« نەبی ئەمینتایف ، کە خودانی ڕیـکۆردی جیهانیە لـە بازدانی پەڕەشووت ، ڕیکۆردەکەی پیٚشکەشی داغستان کردوە • »

دوای چەند ڕۆژیٚ تووشی (نەبی) بوومەوە :

« لەگەڵم وەرە بچینەوە داغستان • »

« ئاسمان چاوەڕیٚیە بە بیٚ ئەو هەڵناکەم • »

عـەمر دریٚژ نەبوو • ڕۆژیٚـکیان پەڕەشووتەکـەی نەبوەوە وەك هەڵۆیەکی باڵشکاو ورشەی هات‌و بە عەردی کـەوت • لەو ساوە چەند ساڵی بەســەردا تیٚپەڕیوە بەلاٚم ئیٚستاش هـەر کاتیٚ لە ئاسمانەوە قیڕەی هەڵۆیەکم دیٚتە بەر گویٚ وا دەزانم ئەوە دڵی خوربەداری (نەبی)یە لـە ناو سنگی ئەو هەڵۆیەدا لیٚدەدا •

(ڕەزەدا)ی نازدارم لە بیرە لە ئاسمانی داغستانەوە بازی دایە سەر شاخی گونیب • ڕۆژی خۆی گەلیٚ پەندوری لە ژیٚر پەنجەرەدا لیٚدراو شاعیرو لاو نەمـا شیعری بۆ نەڵیٚ • زۆر کەس چاوی بڕیبوە پەنجەرەی خـانو کەرپووچە بچکۆلاٚنەکەی (بویناکسك) • لـــە خونزاخ ، لـە گونیب ، لـە کوموخ ، پیـاو ئەسپیان زین کرد • بـە تەمـا بوون ئـەو خاتوونە نازدارە کەزی‌شۆڕە بفڕیٚنن ، بەلاٚم ڕۆژیٚ یەکیٚك لە لینینگرادەوە

هـات • (ڕەزەدا) کەمانی خستە ناو فڕۆکەیەکو بردی • کچە لـە ئاسمانەوە دەستی لـە داخوازی کەرەکانی هەڵوەشاند کە لەسەر زەوی بوونو شاعیرە دەمبەش بوەکانمان هـەر هێندەیان پێ‌ما تێی‌ڕابمێنن‌و شیعر بەو کۆترە باریکەیە هەڵبڵێن کـە هەڵۆیەك فڕاندی •

کـە شەڕ داگیرسا (ڕەزەدا) لە لینینگراد بوو • نووسیویە :

« لەم شارەدا ئیتر شەوی سپی نەماوە بگرە ڕۆژیش هەر ڕەشە • لینینگراد کلْپەی دێ • منیش بوومەتە بڵێسە • لەناو دووکەڵو مەرێزەدا تەماشـای ئاسمان دەکـەم • بەڵام لە ئاسمانیشدا هـەر شەڕە • سـەیدی مێردم زۆر جـار چۆتـە پشتەوەی دوژمن • تا ئێستا سێ جار ئاگادار کراوم کـە مردووە • دختۆر بووو لـە تیپی بەرەشووتدا کاری دەکرد • ئـەو کەسـانەم دێنە لا کـە ئەو ڕزگاری کردوون • »

(ڕەزەدا) گـەڕایەوە داغستانو کـە گوێی لە هەڵۆیەك دەبێ لـە ئاسمانەوە دەقیڕێنێ وا دەزانێ دڵی سەیدی لە ناو سنگی ئـەم هەڵۆیەدا لێ‌دەدات •

ئەخیلچی برام ••• تۆ لـە خاکیترین کۆلێژدا دەتخوێند • لـە ئامۆژگـەی کرت‌وکێڵدا دەتخوێند • بەڵام لـە شـەڕدا ئاسمـانت هەڵبژاردو بوویە فڕۆکەوان • لەسـەر دەریای ڕەش ڕەش بوویتەوە • بیست‌و دوو ساڵان بووی • دەزانم قەت تازە نایەیتەوە ماڵێ • بەڵام هەر گـاوێ هەڵۆیەك بەسـەر سەرمەوە بقیڕێنێ وا تێ‌دەگەم کـە ئەوە دڵی ئەخیلچیەو سڵاوی برایانەم بۆ ڕەوانە دەکات •

هەڵۆ بە ئاسمانی داغستاندا دەسووڕێنەوە • گەڵێ زۆرن • بـەڵام زۆر پیاوی ڕەشیدیش هـەن کـە گیانیـان لـە پێناوی وولاتەکەیانەوە

بەخشیوە • هەر قیرەیەکی هەڵۆیەک باسی دەسکەوتێکی ئازایانە دەکات• هەر قیرەیەك گۆرانیەکی جەنگە •

دەزانم ئەمە هەمووی فەنتازیە ، خەڵك دەیانەوێ وا بێ • بەڵام ئەمن دەزانم کابرایەکی ئاندی چی بەو پیاوە گوت کە بە لووت بەرزی دەسووڕایەوە :

« هەتا هەڵۆش ناچار بوون دابەزنە سەر زەوی بۆ ئەوەی بنە بنیادەم ؟ دەبێ تۆش لەبەرزاییخۆت دابەزیە خوارێ • »

هەموو کەس لێرە لەسەر زەوی لە دایك بوە • چاییی بۆیە چاییە چونکە پیاوی شاخانە ، پیاوی سەرزەویە بلا خەڵکی لە گۆرانیو ئەفسانانەدا بفڕن • ئێمە زۆرمان مەراق ئەم ووشەیەیە : «فڕین» • کە سوار ئەسپێك غار دەدات دەڵێن : «فڕی» • گۆرانی دەفڕێ ، زۆربەی گۆرانیەکانمان لە بارەی هەڵۆیانن •

زۆر ڕەخنەم لێ گیراوە کە لە شیعرەکانمدا گەلێك باسی هەڵۆ دەکەم ، بەڵام چ بکەم ئەگەر ئەو باڵندەیەم لەوانەیدی هەموو خۆشتر بوێ ؟! هەڵۆ دوورترو بەرزتر دەفڕن ، کەچی باڵندەکانیتر بەسەر ئەبارەدا زیقەو هەرایانە • دەنگی هەڵۆ سافو گەورەیە • باڵندەکانیدی تەنیا کزەبایەکی بێ داغستان بەجێ دێڵنو دەفڕنە وولاتی بێگانان ، بەڵام هەڵۆ وا نین • هەر چەندە هەوای تووش بێ ، هەر چەندە ئەقەیان لێبکرێ شوێنی خۆیان قەت بەجێ ناهێڵن • هەواری پشوودانیان نیە • باڵندەکانی دی لەسەر زەوی دەخشێن ، لە بانێکەوە بۆ بانێکیدی ، لە دووکەڵکێشێکەوە بۆ دووکەڵکێشێکیتر لە زەویەکەوە بۆ زەویەکیتر قوونە فڕە دەکەن • بە دۆڵی بچکۆلە دەڵێن دۆڵی چۆلەکان بەڵام بە شاخی گەورە دەڵێن شاخی هەڵۆ •

# هەڵۆی شاخان

نیشتمانم هێزو مەزناتی لەسەر دەڕژێتەوە ٠
پڕ باڵندەی دەنگ‌خۆشە
وەك خواکـــان ،
هەڵۆی نەبەردی بەســەردا دەفڕی

هەمیشە هەڵۆ بە ئاسمانەوە دەبینین ٠
ڕۆژی تووش‌و ڕەشەبا ، هێلانەی خۆی دەپارێزێ ٠
هێلانە لـە شــاخی
هەڵەموت‌و ترسناك دەکا ٠

وا دەبێ هەڵۆیەك دەفڕێ‌و
بە سەربە رزی تەم‌و تومان بە باڵەکانی شەق دەکا
دەردەپەڕێ ، دەڵێی لە ئەشکەوتایە
شەپۆلی زەریای شین شەق دەکا ٠

هەڵۆ زۆر بەرز دەفڕێ ٠
وەك نۆبەتداری هۆشیار وایە ٠
کە قەل گوێیان لە دەنگی دەبێ ٠
بە ڕەوە لە بەری هەڵدێن ٠

حەز دەکەم دانیشم‌و
ماوەیەکی زۆر وەك دەوری منداڵی
چاو لە ترۆپکی سپی زەق کەمەوە ،
سەیری سوڕانەوەی هەڵۆی مەزن بکەم ٠

وا دەبێ وەك دەوریە لە سەر چیا دەوەستن
یان لە دەشت دەبزوون
نیشتمانی من بە پیاوی هەرە ئازا دەڵێ :
« هەڵۆی شاخان » ٠

مەرج نیــە هــەر پیاوێکی لــە دایك بوو پیاوێکی ڕاستەقینە بێ • مەرجیش نیــە هــەر باڵندەیەکی بفڕێ هەڵۆ بێ •

بەلای ژاپۆنەکانەوە خۆشەویسترین باڵندە قورنگە • دەڵێن ئەگەر نەخۆش هــەزار قورینگ لــە کاغــەز ببڕێ چــاك دەبێتەوە • هــەمیشە بیری خــەمو خۆشی ، پێك گــەیشتنەوەو لێك جودابوونەوە ، خــەونو یادی شیرین بە قورینگی هەڵفڕیو دەبەستنەوە • بە تایبــەتی ئەوانەی کــە بەسەر (فوجی‌یاما)دا دەفڕن •

منیش قورینگم خۆش دەوێ ، بەڵام کاتێ کــە برادەرێکی ژاپۆنی لێی پرسیم ، داخۆ چ باڵندەیەکم لــە هــەموویان خۆشتر دەوێ گوتــم : هەڵۆ • پێی خۆش نەبوو • دوای ئەمــە هەندەی پێ‌نەچوو لە پێشبڕکێی تۆکیۆدا قارەمانەکەمان پاڵەوانیەتی جیهانی بردەوە • ئــەو حــەلە برادەرە ژاپۆنیەکەم گوتی : « هەڵۆکانی ئێوەش باشن ! باڵندەی جوانن ! »

کاتێ کــە باسی شەڕێــکی نێوان هەڵۆو لەقلەقانی ئاسمانی تورکیام بۆ چیاییەکانمان کردو ناچــار بووم بێ لێ‌بنێم هـــەڵۆ دۆڕاندوویانــە گوێکرەکانم تاسانو تووڕەش‌بوون ؟ نەیاندەویست پێم بڕوا بکەن ، بەڵام ڕاستی راستیە •

لە ئەنجامـــدا یەکێ گوتی : ڕاست ناکــەی ڕەسووڵ هـــەڵۆکان نەبەزیون • دڵنیام ـ هەموو کوژراون ـ بەڵام ئەمەش شتێکی‌ترە • •

برادەرێکی بــە ناوبانگم هــەبوو • ئەحمەدخان سولتان • دوو جار پاڵەوانێتی یەکێتی سۆڤێتی وەرگرت بوو • باوکی داغستانی بوو ، دایکی تەتەر بوو • ماڵی لــە مۆسکۆ بوو • داغستانی بە پاڵەوانی خۆیان دادەناو تەتەریش بە هی خۆیان •

جارێکیان لێیم پرسی «پاڵەوانی کامەیانی ؟ »

ئەحمەد خـان وەڵامی دامەوە : «من نە تەتەرم ، نە لەکم • مـن پاڵەوانی یەکێتی سۆڤێتم • بەڵام کوڕی کێم ؟ کوڕی دایك و باوکی خۆمم • چۆن دەتوانی لێکیان جودا بکەیتەوە ؟ من پیاوم • »

جارێکیان شامیل لە محەمەد تاهیرولکەرخی سکرتێری خۆی پرسی :

— داغستان چەند پیاوی تێدایە ؟

محەمەد تاهیر تۆماری کردەوەو ژمارەکەی دایە •

شامیل تووڕە بوو ، گوتی :

— پرسیاری پیاوی ڕاستەقینەم لێ کردووی ؟!

— ئاخر شتی وام تۆمار نەکردوە •

ئیمام ئەمری پێ کرد :

لە بیر نەکەی ئەمجارە یەکەم جەنگ بوو تۆماریان بکە •

چیایەکانمان دەڵێن : بۆ ئەوەی نرخی ڕاستەقینەی پیاوێك بزانی دەبێ لەبارەی ئەم شتانەوە بپرسی :

١ ـ بەدبەختی
٢ ـ شادی
٣ ـ ژن
٤ ـ شمشیرەکەی
٥ ـ زیو
٦ ـ بوتل
٧ ـ خۆی •

بەڵێ پیـاوو ئازادی ، پیاوو سەربەرزی ، پیاوو نەبەردی ، هەموویان لەناو یەك بیردا دەتوێنـەوە • جیـایی هـەڵو بـە دوو ڕوو نابینن • دوو

ڕوویی دەدەنە پاڵ قەڵەڕەشکە • پیاو تەنیا ناو نیە • بانگ کردنە • بانگ کردنێکی بلندیشە ، بە ئاسانی نایەتە دەست • بەر لە ماوەیەك لە بوتلیخ گوێم لە ئافرەتێ بوو ، گۆرانی بە کابرایەکی خوێڕی هەڵدەگوت :

لە ئەسپ نەختێکت تێدایە :
لە مەڕ نەختێکت تێدایە ،
لە کلاوکوڕە نەختێکت تێدایە •
لە ڕێوی نەختێکت تێدایە ،
لە ماسی نەختێکت تێدایە ،
بەلام ، بەلام کوا پیاوەتی ؟
کوا ، کوا ، سەربەرزی ؟!

گۆرانیەکیترم هەر لەوەوە گوێ لێبوو لە بارەی کابرایەکەوە کە دەرکەوتبوو درۆزنە :

وام دەزانی پیاوی
نهێنی خۆم بۆ درکاندی •
گوێزەکە پووچ دەرچوو ،
وا لە ڕێگادا تەنیا مامەوە •

سووچی خۆمە ، بە داخەوە ،
تا درەنگ نەمناسیت •
تۆ بەرگێکی بێ لەشی ،
تۆ تەپلەیەکی بێسەری •

کچێك بە دوای زاوایەکدا دەگەڕا ، گازاندەی دەکرد :

— ئەگەر لە تەپڵەبەسەرێك بگەڕابامایە لە مێژ بوو دۆزیبوومەوە •
ئەگەر لە خاوەن جووتێ سمێڵ بگەڕابامایە لە مێژبوو دۆزیبوومەوە،
بەڵام من لە پیلوێك دەگەڕێم ، پیاو •

لە شاخان کە یەکێ مەڕێك دەکڕێ تەماشای دوونگی قەڵەوی ، خوریەکەی ، نەرمو لووسیەکەی دەکات • کە ئەسپێك دەکڕێ تەماشای

سنكوڕكی ، لاقی ، سەراپای دیمەنی دەكات • بەلاّم ئەدی چۆن دەتوانیّ پیـــاویّك هەلّسەنگیّنیّ ؟ سـەیری كیّندەڕنی دەكـــا ؟ ســـەیری ناوو كردەوەكانی دەكات • بە ڕیّـكەوت لـە زمانی ئاڤاریدا ووشـەی ( ناو ) دوو مـانای هــەیە : یەكـەم ئەو ناوەی كـە هــەیە • دوەم كردەوەو لیّهاتن و بە جەرگی • كـە كوڕیّك لـە دایك دەبیّ دەلّیّن : « تسـیار بوكەب ، تسیار بە تەگی» واتە یاخوا سەربەرزی ناوی خۆی دەقـەبەر بـكات» ناویّك كردەوەی تیّدا نەبیّ دەنگیّكی بۆشەو هیچی‌تر •

دایكم دەرزی داوم :

« هیچ یاداشتیّك لە ناوی پیاوو هیچ گەنجینەیەك لە زیان گەورەتر نیە • بیانپاریّزە ! »

نووسینی سەر كەلەشاخیّك :

**ڕیّـگای بەرەو مرۆڤ**
**كورت نەبوو •**
**بەلاّم سەرخۆش ڕیّی پیّچەوانەی گرتو**
**بە سەعاتیّك بوو بە ئاژەل •**

كاتیّ كـە شامیل بەنای بردە بەر شویّنیّكی سەختو عاسیّ لەسەر چیـــای گونیب ، ڕیّـگەی دیل بوونی نەبوو ، بـەلاّم خائینیّك ڕەوەزە نهیّنیەكـــەی پیّشانی دوژمـــن دا • مارشال میـــر باریاتینسكی بەزیّڕ خـەلاّتی كرد •

پاشـان كـە شامیل برایە (كالوگە) خاینەكە گەڕایەوە مالّی باوكی بەلاّم باوكی گوتی : «تۆ خاینی ، تۆ جیایی نی ، تۆ پیـاو نی ، حاشـــا تۆ كوڕی من نی • »

بەدەم ئەم قسانەوە كوڕەی كوشتو سەركی لیّ‌كردەوەو لەگـەلّ

زێڕەکەدا لەسەر شاخێك گلۆری کردەوە ناو ڕووبار • باوکە خۆیشی چیدی ڕووی هەڵنەهێنا لەو گوندە بمێنێتەوە • چاوو ڕووی نەبوو تەماشای دۆستو دراوسێکانی بکات • ئیدی سەری هەڵگرتو ڕۆیشت • ئەوساو ئێستاش کەس نەیزانی چی بەسەر هات •

لەو ساوە تا ئەمڕۆش هەر جایەك بەو شوێنەدا ڕەت بێ کە سەری خاینەکەی لێ گلۆر کرایەوە بەردی تێدەگرێو ڕەجمی دەکا • دەڵێن هەتا ئەو باڵندانەش کە بەسەر شاخەکەدا دەفڕن هاوار دەکەن : «خاین ! خاین !»

جارێکیان ، مەحەج دەخەدایف بۆ سەرباز کۆکردنەوە چووە گوندێکی چایی • لە گوندەکەدا دوو پیاوی دی یاریان بە کاغەز دەکرد •

« السلام علیکم ! پیاوتان لە کوێن • بانگیان کەنە ئێرە • »
« بێجگە لە ئێمە گوند هیچ پیاوی تێدا نیە • »
« ئاخ ئەمە چ جۆرە گوندێکە پیاوی تێدا نیە ؟ ئەدی لە کوێن ؟ »
— « لە شەڕن • »
« ئای ! دیارە خەڵکی گوندەکەتان هەموو پیاون تەنیا ئێوە ئەم دووەتان نەبێ • »

ئەبوتالیب شتێکی بەسەر هات • سەعاتەکەی بردە لای سەعاتچیەك بۆی چاك بکاتەوە • ئەو کاتە سەعاتچییەکە خەریکی چاکردنەوەی سەعاتی گەنجێك بوو کە لەوێ دانیشتبوو •

سەعاتچییەکە بە ئەبوتالیبی گوت : «دانیشە !»
«نەخێر ئێستا پیاوێکت لە کنە جارێکیدی دێمەوە • »

سەعاتچییەکە بە سەرسامیەوە پرسی : «کوا پیاو ؟»

« ئەم کوڕە گەنجە ••• »

« ئەگــەر پیـاو بوایە کاتێ تۆ هاتیـە ژووریٚ یەکسەر هەڵدەستاو جێی بۆ چۆل دەکردی • چ لە داغستان کەم نابێ ئەگــەر سەعــاتی کابرایەکی ـ بەکـەلك چ نەهـاتوو ـ پاش‌و پێش بـکات بەلاّم پێویستە سەعاتی تۆ ڕاست‌و دروست بێ •

پاشان ئەبوتالیب دەیگوت کـاتێ کـە نازناوی شاعیری گــەلی داغستانی پێدراوە ئەوەندەی قسەکــانی سەعاتچییەکــە هــەوەسی پێنەهاتوە •

سی نەتـەوە لـە داغستاندا هـەن ؛ بەلاّم پیـاوی زیر دەڵێـن داغستان تەنیا دوو پیاوی لێ‌هەیە •

« ئەمە چۆن دەبێ ؟ »

ئاسانە یەکێ پیاوی باشە ، یەکێ خراپ •

« ئەگـەر ئەو حسێبە بـکەی ، تەنیا یەك پیـاو لە داغستاندا هەیە • پیـاوی خراپ پیاو نیە • »

لە (کوشین)ێ وەستا تەپڵە دروست دەکـەن ، بەلاّم هەندێ کەس لە سـەری دەنێن‌و هەندێـکی‌دی بە ڕستەکەی وەدەکەن • ئاسنگرەکانی (ئامگوزین) خەنجەر دروست دەکەن ، بەلاّم هەندێ کەس لەبەر پشتی ڕادەکەن‌و هەندێـکی‌دی بە سنگولکەی وەدەکەن •

وەستاکانی (ئاندی) کەپەنك دروست دەکەن ، بەلاّم هەندێ کەس لـە کـاتی تەڕو تووشی لەبەری دەکەن‌و هەندێکی‌دی لەناو سـندوق هەڵیدەگرن •

لە بارەی خەڵکیشەوە هـەمان شتە • هەندێك هەمیشە سـەریان قاڵە • لەبەر ڕۆژو لەبەر (با)دا هـەر ئیش دەکەن • کەچی هەندێکی‌دی

وەکو کەبەنـکی ناو سندوقو تەپڵەی سـەر ڕستەگەو خەنجەری بـە سنگولـکەوە کراو وان • دەڵێی سێ پیرەمێردی ژیر چـاو دەبڕنە داغستان • سـەدان ساڵ ژیاون • هەموو شتێکیان دیوەو هـەموو شتێك دەزانن ، یەکێکیان لـە ناخی مێژووی کۆنەوە سەیری گۆڕستانی کۆن دەکـاتو بیر لـەو باڵندانە دەکـاتەوە کـە بـە ئاسماندا دەفڕن ، دەڵێ «داغستان پیاوی تێدا بوە •» ئەوەی دوەم تەماشای جیهانی ئەمڕۆ دەکا • پەنجـە بۆ ئەو گلۆپانە درێژ دەکا کـە لــە داغستان دەدرەوشێنەوە • ناوی پیـاوە کۆکو ماقوڵەکان دێنێ ، دەڵێ : داغستان پیاوی تێـدایە • ئەوەی سێیەمیش باشـە ڕۆژ دەنرخێنێ ، سەیری ئەوبناخانە دەکات کـە ئەمڕۆ بۆ دوا ڕۆژ دایاندەنێن ، دەڵێ : «داغستان پیاوی تێدا دەبێ» •

من لەو بڕوایەدام هەر سێکیان ڕاست دەکەن •

ماوەیێ لەمـەو بەر ئاندریان نیـکۆلایف/ی ئاسمانەوانی ناودێر میوانی داغستان بوو هاتە ماڵی منیش • کچە بچکۆڵەکەم پرسی :

«داغستان هیچ ئاسمانەوانی تایبەتی خۆی نیە • »

وەڵامم دایەوە « نەء » •

«بەڵام دەبێ وا نیە ؟! »

« با • دەبێ • »

دەبێ چونـکە منـداڵ دێنـە دونیاوە ، چونـکە ئێمـە ناویان لێ دەنێین ، چونـکە پێدەگەنو نیشتمانەکـەیان پێش دەخەن • هـەر هەنـگاوێکی دەیهاوێن لـە ئامانجی پیرۆزیان نزیک دەکاتەوە • چـۆن ئەگـەر گوندێك ئاشتیو تەباو تفاقی باڵی بەسەردا کێشا بێ ئێمە دەڵێین (پیاوی تێدا دەژی)بلا منداڵەکانیشمان هەمـان قسە دەرهەق داغستـان بـکەن •



# گــەل

**پیاوێ بتوانێ بێ هەراو هوریا شاد بێ ،**
**پیاوێ بتوانێ بە چاوی مۆلەق بگری ،**
**پیاوێ بتوانێ بێ ئۆفو ناڵە بگری ،**
**ئەوە پیاوە : چیاییە ، رۆڵەی شاخانە ·**

ساڵی ١٩٥٩ ، کــە لە ئەمریکا هاتمــەوە دایکم لێی‌پرسیم : « پێم بڵێ ، ئەمریــکا بــــە قــەد وولاتی ئێمــە گــەورە دەبێ ؟ ئەرێ ئەوان زۆرترن یان ئێمە ؟ »

لە گوندێکی کپو نووستوودا ، چ لە کاتی بارانو چ لـــە کـاتی خۆشیدا بێ ، بــە توندی لــە پەنجەرەیەك دەدرێ :

« هۆ ، چ پیاو لەوێیە ؟ ئەسپەکەت زین کە ! »
« ئەتۆ کێی ؟ »
« ئەگەر ئەم پرسیارە دەکەی ، لە ماڵی خۆت بمێنەوە ، تۆ بە کەڵك نایەی • »
دیسان : تەپ ، تەپ •
« هۆ ، چ پیاو لەوێیە ؟ ئەسپەکەت زین کە !
« بۆ کوێ ؟ بۆچی ؟ »
« ئەگەر دەپرسی بۆ کوێو بۆچی ؟ لە ماڵی خۆت بمێنەوە ، تۆ بە کەڵك نایەی • »
بۆ جاری سێیەم تەپەتەپ دێ :
« هۆ ، چ پیاو لەوێیە ؟ ئەسپەکەت زین کە ! »
« ڕاست بڕۆ ، ئامادەم • »

ئەمەیە پیاو ، ئەمەیە چیایی ! بەم جۆرە دوو سوار سوار بوونو ڕۆیشتن • تەپ ، تەپ !
« چ پیاو لە ماڵە ؟ ئەسپەکەت زین کە ! »

ئێستا تەنیا دوو یا سێ یا دە کەس نەبوون ، بەڵکو سەدانو هەزاران بوون • هەڵۆ فڕیە لای هەڵۆ ، پیاو خۆی دایە پاڵ پیاو • بەم جۆرە گەلی داغستان هاتە کایەوە • (با)ی گەڵیان بێشکەی ڕازەنی ، جۆگەلەی شاخان لایلایەی گوت •

**— لە کوێ بووی دینگیر دانگارچۆ ؟**

**— دینگیر دانگارچۆ لە دارستان بوو •**

کە کوڕێك لە دایك دەبوو ، خەنجەرێکیان دەخستە ژێر سەرینەکەی ، لێی نووسرابوو :

« باوکت دەستێکی هەبوو هیچ نەدەپەنگایەوە ، یاخوا دەستی تۆش وا بێ » •

که کچێك له دایك دەبوو ، شەقشەقەیەکیان بە لانکەکەی وەدەکرد لە سەری نووسرابوو : «ببیە خوشکی حەفت برایان ! »

لە دۆڵان جۆلانە بە پەتەوە هەڵدەبەستریێ ، لە زنجێکەوە بە زنجێکی تر دەبەسرێتەوە • کوڕ پێدەگەن ، کچ پێدەگەن • گەلی داغستان بێگەیشتوە • سمێلی هاتوە • ئێستا سمێڵەکانی دێنە قەفبەستن •

بەم جۆرە داغستانیەکان زیادیان کردو بوون بە ملیۆنێك‌و سەد هەزار • ناوبانگیان بەسەر شاخە دوورەکاندا بڵاو بوەوە ، ئاگریان خستە دڵی لەرزۆکی ئەو داگیرکەرانەی دەستی چنۆکیان بۆ داغستان درێژ کرد بوو •

داغستانیەکان گوتیان : « وازمان لێبێنن بە ئاشتی لەبەر ئاگردانی خۆمان ، لەگەڵ ژن‌و دایك‌و باوکمان دانیشتووین ، ئەوەتا ئێمە زۆر کەمین • »

دوژمنەکانمان وەڵامیان دایەوە : « ئەگەر ئێوە کەمن ، هەر یەکەتان دەکەینە دوو کەرت‌و جا زۆر دەبن • »

بەم جۆرە شەڕ دەستی پێکرد •

داغستان ببوو بە بڵێسە • سەد هەزار ڕۆڵەی جوامێری داغستان لە قەد شاخان ، لە دۆڵان ، لە هەڵەموت‌و هەڵدێران فەوتان ـ گەنجترین ، بەهێزترین ، ئازاترین کەس بوون •

بەڵام هێشتا ملیۆنێك مایەوە ، دیسان (با) لانکی ڕاژەنی‌و لایلایە

نەبڕایەوە • سەد هـەزار کوڕی تازە لـە داغستان پێ گەیشتن • بە ناوی پاڵەوانە شەهیـــدەکان کران • ئینجـــا هێرشێـــکی پێخواسان بەرەو داغستان هات •

شەڕێکی گران قەوما • هـاتو هـــاواری ئەو شـــەڕە گەیشتە ئاسمان • ســـەری ڕەق وەك بەرد گلۆر دەبوونەوە ناو گەڵیان • ســـەد هـــەزار ڕۆڵەی جوامێری داغستان فەوتان • ســـەد هەزار جەنـگاوەر ، سەد هـەزار جوتیار ، ســـەد هەزار گەنج ، سەد هەزار باوك •

بەڵام ملیۆنێك مایەوە • دیسان لانك دامەزرانو لایلایە گوترا •

**ـــ لە کوێ بووی دینگر دانگارچۆ**
**ـــ دینگیر دانـگارچۆ لە دارستان بوو •**

ســـەد هـەزاریتر پێ گەیشتن • ئینجـا شاهنشای ئێران ، نادری مەرگچنن هات ، ویستی دونیا داگیر بـکاتو بە تەما بوو بە تاکە زەبرێك داغستان تەخت بـکات •

شاهەنشا پێش شەڕ دەیگوت :ـ

« فوویان لێ دەکەمو وەك تۆز بەبایان دەکـەم ، بـە ڕاستی ئـەم مشکانە دەیانەوێ لـە ڕووی پشیلەکانم هەڵقۆزنەوە »

بەڵام کە شەڕ بڕایەوە دەیگوت :

« ئامادەم هەموو لەشکرەکەم بە مورتەزالی قارەمان بگۆڕمەوە • »

شانادر زۆر قسەی قەڵەوی کرد • بەڵام تۆ هێزی گـــات لــە بۆڕەبۆڕەوە بۆ دەرناکـەوێ • بەڵـکو لـە ئیش کردنەوە • چایەکـان شاهنشایان بـــە فڕین ڕەوانـــە کردەوەو وەك (با)و خۆڵـــەمێش سەربازەکانیان ڕاداو دۆڵی ووشكو سووتاوی (چوخ)یان بـــە خوێنی خۆیانو خوێنی دوژمنان ئاو دا • لەو کاتەوە بۆتە پەند لە ئێران :

« ئەگــەر شـــا گەوج بێ دەچێ داغستان داگیر بکات • » لە تاران تەختــی زێڕینی نادرم بینی لــە هیندەوە هێنابوویان • لــە زۆر وولآتدا پەیکەرەکەیم دیوە • شمشیرە کەوانەکەیم دیوە • برادەرە ئێرانیەکانم دەیانــگوت :

« ئەم شتە بچکۆڵەیە نیوەی دونیای خستە ترس‌و مل کەچی • »

« بەڵام نەیتوانی بــگاتە داغستانی بچکۆڵە • »

لە میشیخت دیوارەکانی موزەخانەی شـا بە شیعری ئـەو کـەڵە شاعیرانە ڕازاوەتەوە کـە بە کردەوەکانی شایان هەڵدەگوت بەڵام گەلی داغستانیش ، سێ ســەد ساڵە گۆرانیەك لــە بارەی ئەم شایەوە دوویات دەکاتەوە :

**ڕاکەن ، خۆتان دەرباز کەن ، ناتانکوژین ،**
**بەسەرتان دانادەین •**
**بە زیندوویی بەرتان دەدەین •**
**تا باسی هەڵاتنی خۆتان**
**بۆ نەوەکانی دادێ بکەن •**

ئێرانی لــەو بڕوایەدان کــە شا گەلە پەرت‌و بڵاوەکانی یەکانگیر کردووەو وولآتێکی گــەورەی ئێرانی دروست کردوە • ڕەنگە ئەمە وا بێ ، بەڵام من ئەوەی دەخەمە ســەر کــە یارمەتی یەکگرتنی گـــەلە پەرتەکـانی داغستـانی داوە • دڵی پیاوەکـــانی کردۆتە یــەك • ڕقی هاوبەشیان بەرامبەر شای ئێران یەکی خستوون •

لــە شــەڕی دژی شادا ، داغستان ســەد هەزار ڕۆڵەی جوامێری لەناو چوو : شوان ، ڕاوکەر ، بەردتاش ، کرێکاری ئاسن ، جوتیار ، شاعیر ، لەناوچوون •

بەڵام ملیۆنێك مایەوە • لانك دامەزران ، لایلایەی ناسك گوترا ، شۆڕەسوار دەزگیرانیان گواستەوە • لـە ژێر یەك کەپەنك ڕاکشان • یەکتریان گرتە هامێزو گـەلی داغستان بەردەوام بوو • سـەد هـەزار کوڕو کچی نوێ لـە دایك بوون • سـەد هـەزار داس ، خەنجـەر ، پاندوور ، دەهۆڵ • ئینجا شەڕێکیتر دەستی پێکرد • تۆپ لــە دۆڵو ڕێـگەی چەقێندا تەقینەوە ، تەور لـە دارستانەکانی قەدشاخان چرتەیان هات • سونگی بریسکایەوەو گوللە گیزەی هات •

**لە ئۆرالەوە تا دانوب ،**
**تا زێی گەورە ،**
**لەشکر شەپۆل دەدا**
**شەپۆل دەداو دەبریسکێتەوە •**
**مووی سپی وەك گیای دەشت**
**دەلەرێتەوە •**
**سوارەی ڕازاوە**
**تۆز دەکـــاو دەڕوا**
**پەلی جەنــگاوەران**
**ڕیز ڕیز دەڕۆن**
**ئالآیان لە پێش دەشەکێتەوە**
**کـــەرەنا لێدەدەن •**
**تۆپ داوێن •**
**بۆمبـــا دەتەقێ •**
**دوکـــەڵ دەدەمێ •**
**سوپا سالاری ئەم لەشکرە**
**سەرکردەیەکی ڕیش سپیە : ئاگری لە چاوان دەبارێ •**
**لە باهۆزی شـــەڕ قاڵ بوە**
**پەلی جەنــگاوەران بە سەربەرزی دەڕوا •**
**وەك ڕوبار خوڕەی دێ •**
**وەك هەوری ڕەش مەندە •**
**بەرەو ڕۆژەڵات دەڕوا •**
**گازمیك بە ڕوگرژی کەوتە ژماردنی دوژمن •**

**لەبەر بیری ڕەش و پیس داوەشا بوو •**
**خـەیاڵی ڕەشی لە سەردا بوو •**
**لەگەڵ ئەمەشدا پێی نەژمرا .**

دوژمن نەدەهاتنە ژمارە • گۆرانیەکانمان دەڵێن یەك بە سەد بوو • پیرەمێردەکان دەڵێن : « یەکێ قۆڵێــکی بڕایەوە بە قۆڵەکــەی دی دەجەنگا • سەرێ بپەڕیبوایە ، لەشی بێسەر دەکەوتە شەڕ • ڕێــگەو شیو پڕ کەلەشە ئەسپ بوون • زەلام لـە بڵندەوە یەکسەر بازیان دەدایە سـەر نووکـە قەمـــان ، پێیان دەگوتین : بەسیـــەتی خوێن ڕشتن • دەستکردنەوە ســـوودی نیـە • بۆ کـوێ دەچن ؟ باڵتان نیـە بەرەو ئاسمان بفڕن ، چڕنۆکتان نیە زەوی هەڵکۆڵن •

بەڵام شامیل وەڵامی دانەوە :ـ

« باڵ هەیە ـ شمشیری من ، چڕنۆك هـەن ـ خەنجەرەکانمان ، تیرەکانمان • »

چیایەکان بیست و پێنج ساڵ بە سەرکردایەتی شامیل شـــەڕیان کرد • لـەم ماوەیەشدا نەك تەنیا دیمــەنی داغستان گۆڕا • بگرە ناوی جێــگاو ڕووبارەکـــانیش گۆڕان • (ئاقار قۆیسو) بوو بـە ( قەرەقۆیسو : واتـە ڕووباری ڕەش • چیـای برینــداران و دۆڵی شەهیــدان و ڕووباری ڤالیریك ناو بانگیان دەرکرد • ڕێبازی شامیل، ڕێــگای شامیل ، سەمای شامیل بوونە بەشێکی یادو بیرەوەری گەل •

چیـای گونیب شوێنێکی پڕ کارەساتی شەڕ بوو • لەوێ لەســەر تۆپکەکەیدا ئیمام دوا نوێژی کرد • لە کاتی نوێژکردندا گوللەیەکی بە دەستی بەرزەوە بوو کــەوت • بێ سلەمینەوە نوێژەکەی تەواو کرد • خوێن ڕژایە ســەر ئەژنۆی و ســەر ئەو تاتەی لە سەری وەستا بوو • بەڵام ئیمامی بریندار نوێژی نەبڕی ، تەواوی کرد •

کە هەستایەوە هاوڕێکانی پێیان گوت : « ئیمام ! بریندار بووی !» شامیل چەپکە گیایەکی هەڵچڕی بۆ ئەوەی خوێنەکەی پێ بسڕێتەوە : « ئەم برینە سووکە ، ساڕێژ دەبێ ، بەڵام داغستان خوێنی لەبەر دەڕوا ، چارەی ئەو برین زەحمەتە • »

لەو ساتە هەرە سەختەدا شامیل هاواری کردە ئەو مەرد ئازایانەی کە تازە کەوتبوونە گۆڕەوە ـ ئەوانەی لە (ئەخولگۆ) کوژران ، ئەوانەی لە (خونزاخ) مردن ، ئەوانەی لە نزیك گوندی (سالتی) لە ژێر زەوی بەردەڵاندا ڕاکشانو ئەوانەی لە (گەرگەبیل) نێژرانو ئەوانەی لە (لارکۆ) شەهید بوون •

هاوگوندەکانی خۆی هاتەوە یاد • باوکو باپیری ، قازی محەممەدی باش ئیمام ، حاجی موورادە شەل ، عەلی بەکیلاف ، ئەخبەر دیلۆفو زۆر کەڵە مێردی‌تر ••• ئەمانە لە ژێر خاکی داغستان ڕاکشاون ـ یەکێ بێ سەر ، یەکێ بێ قۆڵ ، یەکێ دڵی پێکراوە • شەڕ مانای مردنە • سەد هەزار ڕۆڵەی جوامێری داغستان •

لەگەڵ ئەمەشدا ، کە شامیل بە پانو بەرینی ڕوسیادا دەپەڕیەوە ، هەر دەیگوت :ـ

«داغستان بچووکە ، گەلەکەمان کەمە ، وای دەنا تەنیا دەهەزار شمشیر بەدەستی ترم هەبوایە • »

لە (گونیب)ی زووروو نووسینێك لەسەر بەردێك هەیە ، دەڵێ :ـ

« میر باریاتینسکی لەسەر ئەم بەردە دانیشتبوو کە شامیلی دیلی بۆ هات • »

باریاتینسکی به شامیلی یەخسیری گوت: «هەموو هەوڵت، هەموو شەڕت بە فیڕۆ چوو.»

شامیل وەڵامی دایەوە: «نەخێر، بە فیڕۆ نەچوو خەڵکی یادی دەکەنەوە. زۆر کەس کە دوژمنی خوێن بوون لەم خەباتەدا بوونەوە برا، زۆر گوند دوژمنداریان لە نێودا بوو پێك هاتنەوەو یەکیان گرت. زۆر گەلی داغستان کە خۆبەخۆیی بە شەڕ دەهاتن‌و دەیانگوت: «گەلی من!» «وولاتی من!» لەناو یەك گەلی داغستانیدا یەکیان گرتوە. هەستی نیشتمانی ئەوان، هەستی یەك داغستانم پێ بڕاوەو ئەمەش بۆ نەوەکانم بەجێ دێلم. چما ئەوەندە کەمە؟!»

جارێکیان لە باوکم پرسی:

«بۆچی پێخواس، تیمۆر، نـ.ـادر هاتنە سەرمان. خوێنیان ڕشت، ڕۆیان چاند؟ چییان لە داغستان دەویست کە وەکو گورگێکەو مانای بەزەیی نازانێ.»

«با چیرۆکی کابرایەکی دەولەمەندتان بۆ بگێڕمەوە: کابرا سامانێکی زۆری هەبوو. کە چوە سەرگردێک. دیتی سەراپای دۆڵ هەر لە بنار گردەوە تا کەنار دەریا پڕ بوو لە مەڕو ماڵاتی ئەو. ڕانەمەڕو ڕەوە ئەسپ نە سەری دیار بوو نە بن. باعە باعی مەڕ ئاسمانی پڕ کردبوو؛ زۆری هەوەس پێ‌هات کە دیتی ئەم هەموو زەویە هی ئەوەو ئەم هەموو ماڵاتو وڵساتەی سەریشی هەر هی ئەوە. بەڵام لەو کاتەدا چاوی بە قانە زەویەکی ڕووتی بێ‌مێگەل کەوت. وەك یەکێ برینێکی قوولی بکەوێتە دڵ ئاوا دڵی داخوریا. قینی دەروونی جۆشا. بە هەڕەشەوە هاواری کرد: «هۆ کابرا بۆچی ئەو قانە زەویە وەکو پێستەی بێ تووك وایە؟ بای ئەوە ماڵاتم نیە دایپۆشێ؟ مێگەلی

بازۆنێ ، ڕەوەی بازۆنێ ..»

بەڵام باوکم لە هەموو شتێ زیاتر حەزی لەوە بوو باسی شامیل خۆی بکات - بۆ نموونە ، شامیل چۆن ڕێگرێکی ئازای بەزاند .

ڕۆژێکیان ئیمامو موریدەکانی چوونە گوندێک . پیرەمێردەکان بە ساردی بە خێریان هێنا . گوتیان : «لە شەڕ وەڕس بووین دەمانەوێ بە ئاشتی بژین . ئێمە لە جێی تۆ باین لە مێــژ بوو لەگەڵ قڕاڵ ڕێک هاتبووین ..»

« دەك خەجاڵەت بن ! بەلای خۆتانەوە سەردەمێ چیایی بوون . دەتانەوێ نانی داغستان بخۆن بەڵام پاسەوانی دوژمنەکانی بکەن ؟ من بووم ئاشتیم لە ئێوە تێكدا ؟ من بەرگریم لێ کردوە ! »

« ئیمام ! ئێمەش داغستانین . بەڵام دەبینین ئەم شەڕە هیچ چاکەی داغستانی تێدا نیە . تەنیا لاساری بە هیچمان ناگەیەنێ .. »

« ئێوە - داغستانین ؟! ڕاستە ئەو شوێنەی لێی دەژین داغستانە ؛ بەڵام دڵتان دڵی کەروێشکە . داغستان خوێنی لەبەر دەڕواو ئێوەش دەتانەوێ دانیشنو پەنگری ناو ئاگردان تێكوەردەن ! دەرگا بکەنەوە نەوەك بە زەبری شیر دەیکەینەوە .! »

ماوەیەکی زۆر ڕدێن سپیەکان ئیمامیان دواند بەڵام لە ئەنجامدا بڕیاریان دا بە میوانی شەرەف وەری بگرن . بەرامبەر بەمەش شامیل گفتی دا هیچ کەسێك لەم گوندەدانەکوژێو کەتنی کۆن بە با نەکا . سوپا دڵسۆزەکەی بردە ناو گوندو چەند ڕۆژێ لەوێ مایەوەو لەگەڵ ڕدێن سپیەکان ڕاوێژی کرد .

ئێستا ، لەو کاتەدا ڕێگرێکی تۆقێنەر هەبوو ، ترشو تاڵانی ئەو

گوندەو گوندەکانی دەورو بەری دەبرد • بەزنی دوو مەتر بوو • سەرانەی لە هەموو کەسێك دەسەند • گەنمو مالآتو ئەسپی دەبرد • دێنشینەکانی دەکوشتو دەیتۆقاندن • باکی بە هیچ نەبوو • خودا ، قراڵ ، ئیمام بەلایەو ووشەی بۆشو بەتاڵ بوونو هیچی تر

جا پیرەمێردەکان هانایان بۆ شامیل برد :

« ئیمام ! لەم ڕیگرەمان قوتار کە ! »

« ئاخر ! چی لێ بکەم ؟ »

« بیکوژە ، ئیمام ! بیکوژە ، زۆر کەسی لە نێو بردوە • »

« گفتم داوە نابێ یەك تاقە کەس لەم گوندەدا بکوژم ، پیاو کە گفتی دا دەبێ بیگەیەنێتە جێ • »

« چارەیەك بدۆزەرەوە ، ئیمام ! لەم پیاوە بەدکارەمان ڕزگارکە !»

دوای چەند ڕۆژێ مریدەکانی ئیمام ڕێگرەکەیان ئابلوقەدا ، گرتیانو بە قۆڵبەستی هێنایانە ناو دێو لەوێ خستیانە ژێر زەمینو دەرگایان لەسەر کلیل دا • دادگایەکی تایبەتی پێك هات بۆ ئەوەی بە سزای خۆی بگەیەنێ • دادگا بڕیاری دا چاوەکانی دەربێنن • بە کوێری بردیانەوە زیندانو دەرگایان لەسەر داخست •

چەند ڕۆژێك پێ چوو ، شەوێکیان بەرەبەری بەیانی ، کە شامیل بە ئاسوودەیی خەوتبوو لە گرمەیەکی زووری بە ئاگا هات • بازی هەڵداو سەیری دەوروبەری خۆی کرد • بینی تەورێ دەرگەی بڕیو زەلامێکی وەك شاخ لێی هاتە پێشو وەك دەعبای کێوی دەینەڕاند • ڕێگرەکە بوو • هەر چۆنێك بێ قوفڵی شکاند بوو ، هاتبوو تۆڵەی خۆی بکاتەوە •

کابرا ددانی جیڕ کردەوە • دەستێکی تەورو دەستێکی خەنجەر

بووو هـاته پێشەوە • ئیمامیش خەنجەری هەڵکێشا • بانـگی مریدەکانی کرد بەڵام ڕێگرەکە هەمووی کوشتبوون گوند لە خـەو دا بوو ، کەس هـاواری نەبیست •

ڕێـگری کوێر بەم لاو بەو لادا بازی دەدا ، تەوری دەوەشـاندو هـەموو شتێکی ژوورەوەی ووردو خاش دەکرد • شامیلیش خـۆی پەنا دەدا تا هەلێـکی دەست کەوێو هەڵمەت بۆ دوژمنەکەی بەرێ •

ڕێـگرەکە دەینەڕاند : « لە کوێی ، کابرای ئازا کـە کتێبت لـە بارە نووسراوە ؟ خۆت لـە کوێ شاردۆتەوە ؟ وەرە دەست بەستم کە ، بمگرە ، چاوەکانم دەربێنە • »

ئیمام هاواری کرد : « ئەوەتا لێرەم ! » یەکسەر بازی دا لایەکی‌تر • تەور لـەو شوێنە چەقیە دیوارەوە کـە پێشتر شامیلی لێ وەستا بوو • جا شامیل خۆی دانووساند تا دەرفەتی بێ‌و خـــۆی هــەڵداتە سـەر دوژمنەکەی • ڕێگرەکە بە هێزتر بوو ، جانەوەر بوو • شامیلی ڕاو ناو چـەند جارێك بریندار کرد • بەڵام شامیل بـــە چوستی‌و هوشیاری خۆیەوە خـۆی لـە زەبرە کوشندەکانی پاراست • شەڕەکە دوو سەعاتی خایاند • لە ئەنجامدا ڕێگرەکە شامیلی گرت‌و بەرزی کردەوە بۆ ئەوەی لـە زەوی بکوتێ‌و سـەری لێ بـکاتەوە ، بەڵام شامیل توانی لە حەواوە چـەند خەنجەرێك لـە سەرو گوێلاکی ڕێگرەکە بدا • ڕێگرەکە خاو بوەوەو دەلا هـات‌و وەك گومەزی کەربووچ هەرەسی هێنا • خەنجەری لە دەست پەڕی • بەیانی بینیان هەردووکیان لەناو گۆمی خوێندا بوون •

شامیل نۆ برینی لە لەشـدا بوو ، یەك مانگ لەو گوندەدا مـایەوە تا چاك بوەوە •

خـەباتی شامیل دژی دوژمنی بە چاو بەهێز ، گەلێ لەو شـــەڕە دەکـات • لـە زۆر شـاخی سەخت دوژمـن بـە زۆری وەکو کوێر وا بوو • شامیل بە زانایی خۆی لـە زەبرەکانی دەپاراستو ئینجا کتوپڕ لـە تەنگێشەوە یا لـە دواوە لێی‌دەدا •

هـەر چاییەو ڕەنـگە بە جۆرێ وێنەی شامیلی لە مێشکدا بێ • منیش بـە شێوەی تایبەتی خۆم دەبینم •

هێشتا گەنجـە • لەسـەر تۆپکەی پانی (ئەخولگۆ) چۆکی داداوە • تازە دەستی بـــە ئاوی ( ئاڤار قۆیسو ) شـووشتووە • دەستی بـــەرز کردۆتەوە ئاسمان • لێوەکانی چپەدوویانە ـ هەندێ کەس دەڵێن کە لە نوێژدا ووشـەی خوای دەچپـاند ، خەڵـکی ووشەی (سەربەستی) یان دەبیستو کـە ووشەی (سەربەستی) لـە دەم دەهـاتە دەرێ ووشـەی (خوا)یان دەبیست •

تەواو پیر بوە • لە کەناری دەریای قەزویندا ماڵاوایی لە داغستان دەکات • ئێستا دیلی قڕاڵە • بەسەر کـەورێك هەڵدەگەڕێو چـــاو بە ئاوی هەڵچووی قەزویندا دەگێڕێ • ئێستا لە باتی (خوا)و (سەربەستی) لێوی (بەخێر بمێنن) یان لێ‌دەچپێ • دەڵێن لەو ساتەدا دڵۆپە شێی لەسەر ڕوومەتەکان بوو بەڵام شامیل قەت نەگریاوە • ڕەنگە ئەو دڵۆپانە دڵۆپە خـوناو بووبن •

کـەچی لـە هەمووی بزۆزتر ئەوەیە کە لە چیرۆکەکەی باوکمدا دەیبینم ، لـە زنجیکی تەنگ ، بە تەنێ لەگەڵ ڕێـگرە دڕندەکەدا لـــە شەڕێـکی دژی خوێناویدایە •

شامیل لەگەڵ حاجی موراد هەندێ جار تەبا بوونو هەندێ جـار

لێك گیر دەبوون • گەلێ چیروكی ڕاستو ئەفسانەیان لەبارەوە هەیە •

جارێكیان كـە هێزی شامیل ئابلوقەدراو هیچ دەرەتانێكیان شـك نـەبرد ، پیرە ئیمـام حاجی مورادی بانگ كردو پێی گوت : «دەرەتانێك بدۆزەوە ! » حاجی موراد ئـەم ئەركە قورسەی وەئەستۆ گرت ، بەڵام مەرجێكی لـە شامیل خواست • داوای لێ كرد ئەو هەشت بەكرێگیراوە دوور بخاتەوە كە تەفرەیان دابوو • شامیل قسەی داێ • حاجی موراد ڕێی پێشان دانو هێزی ئیمام لـەو كەمینە دەرباز بوو • شامیلیش قسەی خـۆی بـە جێ هێنا • بەڵام مانگێكی پێ نەچوو ئیمـام دەوری پڕ نایبی بەكرێگیـراوو زگرەشو درۆزن بوەوە كـە مـەرتەبەی بەرزیشیان وەرگرتبوو •

ئەوا دیسان تەفرەی دەدەنو هەڵی دەخەڵەتێنن • تا بەرژەوەندی تایبـەتی خۆیان هـەبێ بیر لە بەرژەوەندی گـەلو نیشتمان ناكەنەوە •

پاشان كـە شامیل لە كالوگە یەخسیر كرا و كـەوتە بەردەستی قیراڵ ، لـە بارەی ئـەم جۆرە كـەسانەوە گوتی : « نەمدەزانی ئەوەی سمێڵی هـەبێ درۆی لـە زار دێتـە دەرێ • غەزاكەم زۆری هـەڵە تێـدا بوو بەڵام بە داخەوە زۆر شتی ئەم غەزایە پەیوەندی بـە نەزاهەتی منـەوە هەبوو • »

دوای ئەوەی شامیل حاجی مورادی كردە نایب • ناردیە (خایداك) و (تەبەساران) بۆ ئەوەی ڕایانكێشێتە پاڵ خۆیەوە ، یانووردتر بڵێین ڕایانكێشێتە ناو شـەڕ • بـە ئومێـد بوو حـاجی موراد بە خـۆشی ئیقناعیان بـكات • بەڵام نایبی نوێ لیسو ئاگری خستە كار • ئەگـەر یەكێ زاتی بـكردایە باسی یاسـا بـكات • حـاجی موراد مستی پێشان دەداو دەیـگوت : « ئەمـەیە یاساتان • من حاجی مورادی (خونزاخ)یم •

من هەموو یاسای ئێوەم ٠ »

شامیل توندو تیژی حاجی مورادی پێ گەیشتەوە ، سوارێکی بە شوێنەوە نارد ٠ نایب تالانێکی زۆری هێنا ٠ پیاوەکانی گاڕانە ڕەشە وولاخێك ، ڕانە مەڕێك ، ڕەوە ئەسپێکیان هێنا ٠ حاجی موراد خۆیشی ئافرەتێکی زۆر جوانی خستە سەر پاشکۆی ئەسپەکەی ٠ لە خۆشیان هەر ئەوەتە پەڕی دەرەنەدەکرد ٠

حاجی موراد لە ئەسپەکەی دابەزی ٠ سلاوی لە سەرکردەکەی کرد : « السلام علیکم ! »

« و علیك السلام ، نایب ، بە خێر بێی ٠ چ شتی باشت نەهێناوە ؟ »

« با بە دەستی بەتاڵ نەهاتووم ٠ ئەوەتا زیو ، ئەوەتا مێگەڵ ، ئەوەتا ئەسپ ، ئەوەتا مافوور ، لە تەبەساران مافووری چاك دەچنن ٠ »

« ئەدی چ ئافرەتی جوانت نەهێناوە ؟ »

« بەدی ، یەکێکم هێناوە ٠ لە جوانیدا هاوتای نیە ! بۆ تۆم هێناوە ، ئیمام ! »

جەنگاوەرەکان نەختێ چاویان بڕیە یەکتر ٠ ئینجا شامیل وەدەنگ هات :

« پێم بڵێ ، دەکرێ ئەمن لەگەڵ ئەم ژنەدا بچمە شەڕ ؟ ئەمن پێویستم بە مەڕ نیە بەلام بە پیاوە ، پێویستم بە ئەسپ نیە بەلام بە سوارە ٠ تۆ مالاتت هێناون بەمەوە دڵت پێکاون‌و لە ئێمەت کردوونەتەوە ٠ ئەوانە دەبوایە بین بە جەنگاوەرو جێگای کوژراوو برینداران بگرنەوە٠ ئێستا کێ جێگەیان بگرێتەوە ؟ ئێمە ئەگەر خەڵکی خایداك‌و تەبەسارانمان لە پشت‌بوایە قەت لە سالتی‌و گەرگەبیل وامان لێ

دەفەوما ؟ توخوا ڕەوایە داغستانییەك ماڵی داغستانییەكی دی كـاول‌و تاڵان بـكات ؟ »

« ئاخر ، ئیمام ئەوان تەنیا لەو زمانە دەگەن ! »

« تۆ هەوڵت دا لـە زمـانی ئـەوان بـگەی ؟ ئەگـەر تۆ تێیان گەیشتبوای بە بێ لیس‌و ئاگر لەگەڵیان ڕێك دەكـەوتی ٠ چمـا نایبی مـن دزن ؟ »

« ئیمام ! ئەمن حاجی مورادی (خونزاخ)یم ٠ ٠ »

« منیش شامیلی ( گمری )م ٠ (كـەبەد محەمەد)ی (تەلەتلیا)یی‌و (حسێن)ی (چیركی)ش هـەن٠ بوو بە چی ؟ ئاڤارو خینداڵیال‌و كومیك‌و لیزجیـان‌و لەك‌و خـایداكی‌و تەبەسارانیت هـەموو تاڵان كردوون ٠ هەموویان ڕۆڵەی یـەك داغستانن ٠ ئێمە دەبێ لە یەك بـگەین ٠ ئێمـە پەنجـەی یەك دەستین ٠ دەبێ هـەموو پەنجەكان توند یەك بـگرن تا مشتێك پێك بێنن ٠ حاجی موراد سوپاسی نەبەردیت دەكەم ٠ لەم بارەیەوە شـایەنی هەموو پاداشتێكیت ٠ تۆ كەشیدەت لەسـەرە بەڵام ئێستا ڕام لە كردەوەكانت نیە ٠ ٠ »

« كاتێ كەشیدە بە سەرەكانی‌دی دی تاڵانیان برد هیچت پێ نەگوتن، ئیمام ، ئێستا لـە هـەر كوێ بروسكەیەك بگرمێنێ تروسكەكەی بەسەر سـەری منـدا دەڕژێ ٠ ٠ »

« دەزانم چیت لە مێشكدایە ، حاجی موراد ، ئەخبەردیلاڤ‌و قازی محـەمەدی كـوڕو هـەتا منیشت مەبەستە ٠ بەڵام ئەخبـەردیلاڤ دوژمنەكەمانی لە مۆزدۆك تاڵان كرد ٠ منیش كەرەستەم لـەو خـانانە سـەند كـە نەیاندەویست پشتمان بگرن‌و تەنانەت هـەوڵیان دەدا لـە

ڕووشمان بچەقن • نەخێر حاجی موراد ، بوونە نایب هەر بەوە نابێ دڵێکی نەبەردو خەنجەرێکی تیژت هەبێ ، دەبێ سەرێکی باشیشت هەبێ • •

زۆر جار ئەو مشتو مڕە لە نێوان شامیلو حاجی مورادا دەبوو • دووزمانی جیاوازی نێوانی تیژترو ناخۆشتر کردن • تا لە کۆتاییدا دوژمنداری لێکی جودا کردنەوە • حاجی موراد شامیلی بە جێ هێشت • چوە بەرەکەی دیو سەری خۆی دۆڕاند • مەیتی لە (نۆخا) نێژرا • دابەشکردنێکی گرنگ : سەری لای دوژمن مایەوە ، بەڵام دڵی هەر لە داغستان بوو • ئای لەم چارەنووسە !!

## سەری حاجی موراد

**سەرێکی براوم دەبینم •**
**گرمەی شەرم دێتە بەر گوێ**
**لە گوندە هەڵچوەکانا**
**خوێن بەسەر بەردی ڕووتدا دەڕژێ •**

**ئەو شیرانەی عاجباتیان دیوەو**
**بە بەرد تیژکراونەتەوە ، شریقەیان دێ •**
**مریدی دڵسۆز بەرەو قەوقاس**
**ڕێی هەڵەتو سەختیان گرتۆتە بەر •**

**لە سەری خۆنیاویم پرسی :**
**تکایە ، تۆ سەری کێ بووی ؟ پێم بڵێ •**
**تۆیەکی سەربلندو سەرکەوتوو**
**چۆن کەوتویتە بەر دەستی بێگانان ؟**

**لەنکاوڕا دەنگێکم هاتە بەر گوێ :**
**پێی ناوێ بیشارمەوە**
**من سەری حاجی موورادم**

**لەسەر شانی بەربوومەوە ·**
**چونکە وێڵو سەرگەردان بووم ·**
**ڕێی ڕاستیم نەگرتە بەر ،**
**ئەویش لە مەغروری خۆم بوو ·**
**سەیری سەری وێڵ کـە**
**کە لە شەڕێکی ناحەق بڕاوە ·**

**ئەی ئەوانەی لە شاخان لە دایك بوون ،**
**هەمووماں ، زیندوو مردوو ،**
**دەبێ بە ڕێـگای ئاسۆی دوورەوە**
**بگەڕێینەوە سەر ترویکەی شاخان ·**

ئیمامیان لـە داغستان سـەند · قەلاّی وا دامەزران کـــە هـەموو لایان مەتەرێز بوو · تۆپو تفەنگ لەو مەتەرێزانە سەریان دەرهێنا بوو ·

ئەگـەر چی نەدەتەقین بەلاّم دەتـگوت دەڵێن : « چاینە ، بـــە هێمنی دانیشن ! بۆ خۆتان پیاو بن ، داکاسێن · »

« داغستان ! کـەی برینەکانت سارێژ دەبن ؟ چما ئەو ماوە درێژە تەنیـا بۆ پارچـە تیشکێك دەجەنـگای ؟ تۆ چتۆ شاخت هەن ! هـــەر چـەندەی خوێنیان بەسـەر دابڕژێ هیچ گوڵێـکیان لێ شین نابێ — یا خـود خوێنی تۆ شـەرابەو داگیرکەرەکان دەینۆشن ؟

**خەڵـکی ئەم شاخانە غەمبارن ،**
**ڕوبارو دڕندەو باڵندە غەمبارن ،**
**ڕێی ئازادییان لێگیراوەو**
**تەنیا بە مردن لەم بەندیخانەیە ڕزگار دەبن ·**

حاکمێك کـە داغستانی بە جێ هێشت گوتی : «وولاّتی کێوییانە !»

یەکێکی‌تر نووسیویە : « لەســەر زەوی ئاسایی نازین ، لەســەر هەڵدێران دەژین · »

سێیەم گووتوویە : « کێوی وا ئـەو خاکەشیان لێ زیادە کـە هـەیانە • »

بەڵام تا لـەو کاتە دواکەوتوەشدا دەنگی لیرمەنتوفو دۆبرۆلوبۆفو چیرنیفسکیو بیستۆجیفو مارلینسکیو بیرگۆف دەزرینگایەوە • بـەڵێ ڕوسیای قڕالی هی وای تێـدا بوو لـە چیایـان بـگەنو قسـەی باش دەرهەق گەلی داغستان بکەن • وای ئەگەر بهاتایە چیایی لـە زمانیـان گـەیشتبان ! داغستانی بـە تەنێ لـە ژێر سەرکردایـەتی شـامیل دژی قڕال نەدەجەنگان ، بەڵـکو ڕوسو پۆلۆنیش پاش ڕاپەڕینەکەی **١٨٦٣** هـەڵاتنو خۆیان گـەیاندە قەوقاس • ئەو جوتیارە ڕووسانەی لە دەست ڕژێمی بەندایەتی هـەڵاتبوون چـەکیـان بۆ هێزەکانی شـامیل دروست دەکرد • دەڵێن پاشـان کـە قڕال شامیلی گرتو نەفی کالوگەی کرد ، شـامیل لـەوێ تووشی سـەربازە ڕووسەکانی گۆرین هـات —

**چیاکانی داغستان بەفری سپی جاویدانو**

**تاریکی شەوی جاویدانیان بەسەرەوەیە •**

جارێکیان کە سلێمان ستالسکی سـەیری خـاکی باوكو باپیرانی دەکرد وای گوت •

باوکم جارێکیان نووسیویە : « لەوەتی داغستان خراوەتە زیندانێ ، هـەموو مانگێك سیو یەك ڕۆژە • »

ئەبووتالیب گوتوویە : « چیاکان ! ئێمـەو ئێوە لە زیندانێك داین •»
خاتوو ئەخیل مارین لـە گۆرانیەکانیدا دەڵێ :

« تەنانەت بزنە کێویەکانیش بەشداری خەممان دەکەن • »

مەحموود ڕایماڵی : «ئەم دونیایە شایەنی بیر کردنەوە نیە ئەوەی

خۆراکی خنکالی بێ گەورەترین ناوبانگی دەبێ ٠ »

باتیرای گوتوویە : « گەورە بە تەپڵی سەری گچکەدا دەدا ٠ گچکە تەنیا لە چیرۆکو ئەفسانەدا شادومانە ٠ »

« ئەحمەد مونگی‌ی کوباچی دوای ئەوەی دونیا گەڕا گەیشتە ئەو ئەنجامە : « بەختیاری لە هیچ شوێنێکدا نیە ٠ »

بەڵام ئیرچی کازاك نووسیویە : « داغستانی دەبێ لە هەموو شتێك داغستانی بێ ٠ »

هەمان باتیرای پێش مردنی نووسیویە :

« یاخوا پیاوی ئازا قەت توخمی منۆخی لێ‌نەکەوێتەوە ٠ »

مەحموود خۆیشی گوتوویە :

« ئەگەر نێری لەناو شاخی تاریك هەڵەتە بێ ، یان ڕێی خۆی دەدۆزێتەوە یان دەمرێ ٠ »

ئینجا ئەبوو تالیب گوتی : « بەم زوانە بروسك بەسەر ئەم دونیایەدا دەگرمێنێ ٠ دەبا گرمەی هەر بەرز بێ ٠ »

کە وەختی داهات ، بروسکەکە دەنگی هات ٠ لە دوورەوە چەخماخەی دا ٠ یەکسەر نەهاتە داغستان ، بەڵام هەموو شتێك بە خەتێکی سوور بوو بە دوو بەش :

مێژوو ، چارەنووس ، ژیانی هەر کەسێکو هی هەموو مرۆڤایەتی ٠ ڕقو ئەوین ، بیرو خەون ـ هەموو شتێك بووە دوو بەش٠

« وا بروسکە داوێ ! »

« لە کوێ ؟ »

« له سەرانسەری ڕووسیا • »
« چ شتێ دەبرووسکێنێ ؟ »
« شۆڕش ! »
« شۆڕشی کێ ؟ »
« ڕۆڵەکانی گـەلی چەوساوە • »
« ئامانجی ؟ »
« ئەوەی هیچ نەبوو دەبێ بە هەموو شت • »
« ڕەنـگی ؟ »
« سوورە ! »
« گۆرانی ؟ »
« با بەرەنگاری دوا شەڕ بین • »
« سوپای ؟ »
« هەموو برسیو بە ئازارەکان سوپای گەورەی چەوساوە • »
« زمانی ؟ نەتەوەی ؟ »
« بە هەموو زمانێکە • هی هەموو نەتەوەیەکە • »
« سەرکردەی ؟ »
« لینینە ! »
« شۆڕش دەبێ چ بە چیایەکانی داغستان بڵێ ؟ ڕونی کەوە • »

پاڵەوانو گورانیبێژەکان زمانی شۆڕشیان وەرگێڕایە سـەر هەموو زمانەکانی داغستان •

« ئەی گەلەکـانی داغستان کـە سـەدان سـاڵ چەوساونەتەوە ! شۆڕشی مـەزن هاتۆتە ماڵمـــان ، کێڵگەکانمـان ، پێچـــی ڕەوەزە شاخەکانمان • گوێی لێبگرنو یاریدەی بدەن • ووشەی وای بۆ هێناون هەرگیز نەتانبیستوە ، پێتان دەڵێ :

« براینــه ! ڕووسیــای نوێ دەستی بۆ درێژ کردوون • دەستی بــگرن • دەستی لەگــەڵ دەست تێـــکەڵ بــکەن‌و مستێکی توند پێك بێنن ، هێزو دڵسۆزیتان لەوەدایە •

ڕۆڵەی شاخ‌و دۆڵان ! پەنجەرەتان بە ڕووی دونیادا بــکەنەوە ! بەخێر هاتنی نەك هــەر ڕۆژێــکی نوێ ، بەڵــکو چــارەنووسێــکی نوێ بــکەن • بڕۆن بەرەو ئەو چارەنووسە بڕۆن !

ئێستا ، چیــدی پێویست ناکــات ســەر بۆ بەهێزان دابنــەوێنن • لەمــەو دوا هیچ دوژمنێك ســواری ئەسپتان نابێ • لەمـــەودوا ئەسپی خۆتان بۆخۆتانە • »

بەم چەشنە ، زمانی (ئاورۆرا)(١) وەرگێڕدرایە ســەر زمانەکــانی داغستان • مەحــەج ، ئوللوبی ، ئوسکار جــەلال ، قازی محــەمەد ، محەمەد میرزا ، هارون‌و مریدەکانی تری شوڕش ، کە باش لــە کێشەو بێشەی داغستان گەیشتبوون وەریان گێڕا • بەم جۆرە داغستان بــەرەو پێشەوە ، بەرەو چارەنووسی خۆی چوو • چیــایەکان ڕەنگ‌و گۆرانی شۆڕشیان قبوڵ کرد •

بەڵام دوژمنەکانی ترسان • برووسکە بەسەرسەریانەوە گرماندی ، زەوی لــە ژێر پێیانەوە لەرزی ، دەریا لەبەر دەمیانەوە هەڵچوو ، شــاخ لــە پشتیانەوە هەڕفی • دونیــای کۆن هــەژاو هەرەسی هێنا • بیرازێکی قووڵ دەمی بەش کردەوە • دوژمنەکانی شۆڕش ، کــە بە خــۆیان دەگوت دۆستی داغستان ، پاڕانەوە : « دەستمان بگرە ! »

---

**(١) ئاورۆرا : کە شتی ئوستۆلی بەلتیك کـــە بە خـــۆی‌و شێلکەوە نیشانەی سەرەتای شۆڕشی ئوکتۆبەری ١٩١٧ یە •**

« ئێوە دەستان بە خوێن ئالوودە بوە • »
« بوەستە ، مەڕۆ ، ئاوڕ دەوە ، داغستان ! »
« چ هەیە هەتا ئاوڕی لێ بدەمەوە ؟ هەر گرانیو درۆو تاریکیو خوێنــــە • »
« داغستان ، داغستانی خنجیلە ، بۆ کوێ دەچی ؟ »
« دەچم لە شتی گەورە دەگەڕێم • »

هەڕو گیفیان کرد : « وەکو بەلەمێکی بچووکت لێ دێ لە دەریالوشێکی گەورەدا ونـــدا دەبیت ! زمانت ، ئاینت ، ڕەوشتت ، تەپڵەت ، سەرت بزر دەبێ ! »

« من لە ڕۆیشتنی سەر کلکە شاخی تەنگەبەر ڕاهاتووم • تازە بترسم نەکو لە ڕاستەڕێدا لاقم بشکێ ؟ زۆر بە دوای ئەم ڕێگایەدا گەڕاوم • قەت داوە موویەکی سەرم ناکەوێ • »

قەلەکان قیڕاندیان ، گورگەکان لووراندیان :
« داغستان چەتەیە ، دەفەوتێ • داغستان ڕزگارکەن • »

هــــاواریان کـــرد ، گـەفیان کرد ، کوشتیان ، بڕیان ، فێڵیان دامەزراند •• وای زۆر بوون ئەوانەی ویستیان بەرد بهاوێنە چراوگی داگیرساو ، ئەوانەی ویستیان پردی گەورە بڕمێنن !

ئالایەك جێگەی بۆ ئالایەکی دی بەجێ هێشت • دزێك بۆ دزێکی دی • وەك کەپەنکی شەوی ساردی زستانان داغستانیان بەم لاو ئەو لادا ڕاکێشاو زوێر بە زوێریان کرد • ئەویش وەك بزنە کێوی تێ کۆشـاو زنجیرەکانی پساند ، هەر کەسە دەیەویست وەکو دڕندەی برسیو چاوچنۆك هەڵی لوشێ ، زۆر ڕاوکەو خۆیان خۆش کرد بوو بیینکن •

« من ـ نەجموددین کوتسنیسکی ـ م ئیمامی داغستانم • گەل لە گوندی ئاندیدا هەڵی بژاردووم ، شیرەکەم بە دوای ئەو تەپڵانەدا دەگەڕێ کە تیلمەی سووریان بەسەرەوەیە • »

یەکێکی‌تر کە ناوی (ئوزون حاجی) بوو مڕاندی :

« برای دینینە ، موسلمانینە ! وەرنە دووم • من ئاڵای سەوزی ئیسلامەتیم هەڵکردوە • »

میر نوخبەك تارکۆفسکی نەڕاندی : « تا سەری دوا بۆلشەفیك بە دارێ وەنەکەم‌و لەسەر بڵندترین چیای داغستانی نەچەقێنم ، چەکم دانانێم • »

لەو ساڵەدا بوو کە کۆلۆنیل کاتیماز عەلیخانۆف/ی سوپای قڕال کۆشکێکی بۆ خۆی لە خونزاخ دروست کرد •

چیایەکی بانگ کردە ناوێ بۆ ئەوەی خانوە نوێکەی پێشان بدا • زۆر لە خۆی‌و لە کۆشکەکەی ڕازی بوو • لە کابرای پرسی :

« باشە ، کۆشکەکەم خۆشە ؟ »

چیایەکە وەڵامی دایەوە : « بۆ پیاوێك کە لە گیانەلادا بێ ، زۆر باشە ! »

« من بۆ دەمرم ! »

« شۆڕش »

کۆلۆنیل عەلیخانۆف گوتی : « لێ‌ناگەڕێم بێتە خونزاخ »و خۆی هەڵدایە سەر ئەسپە سپیەکەی •

یەکێکی‌تر لەگەڵ پاشاو بەگلەرەکانی تورك هاتبوو ، گوتی : « من ـ سەعید بەگ ـ م نەوەی ئیمام شامیلم • لەلایەن سولتانی

نورکەوە هاتووم بۆ ئەوەی بە سوپای ئەوەوە داغستان رزگار بکەم • »

خۆتێ‌هەڵقوتێن‌و تاقمەیەکی نێردراوی ئینگلیزی کە هاتنە داغستان هاواریان کرد : «ئێمە دۆستی داغستانین ! »

کۆلۆنیل بیچەراخۆف/ی سوپای قراڵ هەوای پەڕیە سەرو پۆرت پیترۆفسك/ی کاول کرد : « داغستان قەنتەرەی ڕوو لە باکۆیە • قوفلێکی توند بەو قەنتەرەیەوە دەکەم • »

میوانی ناخوندی زۆر بوون • زۆر دەستی پیس‌و پۆخڵ کراسی بەر داغستانیان دڕی • زۆر ناو بیسترا زۆر (با) وورشەی هات ، زۆر شەپۆڵ لەسەر تاشە بەردان شکانەوە •

دوژمنەکان هەڕەشەیان کرد : «داغستان ، ئەگەر بۆمان دانەهێنی ، فڕێت دەدەینە ناو دەریاو بەخنکاندنت دەدەین • »

لەو کاتەدا باوکم نووسی : «داغستان وەکو گیاندارێکە باڵندە لە هەموو لایەکەوە دوندوکی لێ‌بدەن • »

تەقە بوو ، ئاگر دەباری ، خوێن دەڕژا ، شاخەکان دووکەڵیان دەدەماند ، گەنم دەسووتا ، گوند وێران دەبوون ، نەخۆشی خەڵکی هەڵدەوەراند ، قەلا ئەم دەست ئەو دەستیان پێ‌دەکرا • ئەمە هەمووی چوار ساڵی خایاند •

چاپیەکان دەیانگوت : « زەویمان دەفرۆت ئەسپمان پێ‌دەکڕی ، مانگامان دەفرۆت شمشیرمان پێ‌دەکڕی • »

ئەسپی بێ‌سوار دەیانحیلاند • قەلەڕەشکە چاوی شەهیدانیان دەردێنا •

ئەو کـاتە باوکم داغستانی لەگەڵ کەورێك بەراورد کرد کە زۆر ڕوباری جۆر بـە جۆری بەسـەردا ڕژا بێ بەڵام دایکم لەگەڵ ماسیەکی بەراورد کرد کـە دژی شووفو تەووژمی بەگوڕ مەلەوانی بکات ٠

ئەبوتالیب دەگێڕێتەوە : « وولاتەکەمان گوێی لە زۆر بۆقی لێـدەر بوو ٠ » خۆیشی بۆق لێدەری بەتەلیۆنی پارتیزان بوو ٠

ئەمڕۆ پێنووس ئـەو مێژووە تۆمار دەکـات کـە ئەو کـاتە بە شمشیر نووسرا بوو ٠ ئەمڕۆ ئەو زانایانەی لـەو کـاتی دەکۆڵنـەوە ناوبانگو دەسکەوت بە تای تەرازوو هەڵدەسەنگێنن ٠ زاناکان پیلەکـە دەکـەن و لەسـەر نرخاندنی پاڵەوانەکانی دەکەونە بەربەرەکانێ ٠

بەڵام ئەو پاڵەوانانە شـەڕی خۆیان کردو بڕایەوە ٠ بەلای منەوە ئەوەندە ناهێنێ داخـۆ کێ یەکـەم بوەو کێ دوەمو کێ سێیەم ٠ گرنگی لـە شوێنیکی‌تردایە : شوڕش خەنجەری خستوتەوە کالآن و بە لاچکی ساقۆی خـــوێنی لەسـەر دوا دوژمنی کوژراو سڕیوەتەوە ٠ چیـایش خەنجەرەکەی کردۆتە داس ٠ قەمەی تووڕ هەڵداوەتە ناو بەردی قـەد شاخان ٠ خۆی دەسـەر هەوجاڕ داهێناوە ، زەوی دەکێڵی ٠ گایەکانی دەنگ دەدا ، قرشەی لـە عارەبانە بار دەکات ٠

داغستان کـە ئالآی سووری‌لەسەر بەرزترین تۆپکەدا دەشەکایەوە سمێڵی بادەدا ٠٠٠ کەشیدەی ئیمام گوتسنسکی/ی ساختەچی کردۆتـە داوەڵو گوتسنسکی خۆیشی سزای خـۆی لە شۆڕش وەرگرت ٠ لەبەر دەم دادگـادا گوتی : « قراڵ شامیلی نەکوشت ٠ دەستیان لـە موویەکی سـەری نەدا ٠ ئەدی ئێوە بۆچی ئەمن دەکوژن ؟ »

داغستانو شوڕش وەڵامیـان دایەوە : « شامیلیش بوایە سـەری

پیاوی وەکو تۆی دەپەڕاند ..»

شامیل دەیگوت : « پیـاوی خاین لـە ژێر زەوی بێ باشترە نەك لەسەر زەوی ..»

بەڵێ ، بڕیارەکە جێ بـە جێ کراو هیچ شاخێك نەلەرزی ، هیچ کەسێك نەگریا ، هیچ کەسێك بەردێـکی لەسەر گۆڕەکەی دا نەنا .

کایتماز عەلیخانۆف بـە سواری ئەسپە سپیەکـەوە بە ناو دارستانی (تسونتن)دا هەڵات . دوو کوڕی لەگەڵدا بوو . بەڵام گوللەی پارتیزانە سوورەکانیان گـەیشتێ . ئەسپە سپیەکـــەی کۆلۆنێل ، لۆزلوز ، بـــە شەلەشەل ، ملی ڕێـگای خۆی گرتو گەڕایەوە (خونزاخ) .

موسلم عەتاییف بەو ئەسپە بەستەزمانەی گوت :

« بەڕێـگایەکی چەوتیاند بردیو ویستیان داغستانیش بە هەمـان ڕێـگادا بازۆن ..»

بیچەراخۆف ـ یشیان وەدەرنا . تاقمە پەرتو بڵاوەکـــەی لـــە قەزویندا خنکان . کـە شەپۆلەکان لوولیان دا گوتیان «ئامین !» چیاکان گوتیان : «ئامین» « با دۆزەخ بۆ ئەوان کەسان بکرێتەوە کە دۆزەخیـان لەسەر زەوی دروست کرد ..»

لـە ئەستەمبۆڵ چوومـە بازاڕ ، ئەو پیرە ـ ئاڤـارەی لەگەڵمدا بوو پەنجـەی بۆ پیرەمێردێك ڕاکێشا لـە ناو حەشامەتەکە دەڕۆیشت . وەکو جواڵە گەنمکێکی نیمچە بەتاڵ وا بوو .

« ئەوە ـ کازنبێ ـ یە ! »

« کام کازنبێ ؟ »

« ئەوەی کـە لەگەڵ لەشکری سولتاندا هاتە داغستان ..»

« چی ؟! چما هەر ماوە ؟ »
« ئەوە دەبینی ، ئەوەتا خۆیەتی ! »
پێکیان ناساندین •
کابرای پیرە کەترە گوتی : « داغستان ! ئا ئەو وولاتە دەناسم • »
گوتم : « داغستانیش تۆ دەناسێ !! »
« بەڵێ ، لەوێ بووم • »
بە تەوسەوە پرسیم : «جارێکی دی دێی ؟ »
گوتی : « نەء » و بە پەلەپەل کەوتە شوێن دەوارەکەی و ڕۆیشت •

ئایا ئەم بازرگانە چرووکە توانیویە ئەوە لەبیر بکات چۆن لە (کاسومکێنت) سێ جوتیاری ڕاست لەسەر زەوی خۆیانەوە کوشت ؟ ئایا دەتوانێ ئەو هەڵدێرە لە بیر بکات کە کچێك لە ترسی جەندرمەکانی خۆی لێ‌هەڵدێرا ؟ ئایا ئەم بازرگانە توانیویە ئەوە لە بیر بکات چۆن لەناو باخچەیەکدا منداڵێکی بچووکیان بۆ هێنا ، گەرازەکانی لە دەست فڕێ‌داو ناوکەکەی لە چاوان کوتا ؟ بەڵام زەحمەت ئەو ڕۆژەی لە بیر کرد بێ کە بە خۆی ڕانەگەیشت‌و بە شمەکی سەرگۆشتی هەڵات‌و ژنێك هەیهای بۆ لێ‌دا :

« هێ ! تەبڵەکەت لە بیر چوو ! »
تالانکەرەکان لە داغستان هەڵاتن • هەروەها ئینگلیزە خۆتێهەڵقوتێنەکانیش • کازنیش ، سەعید بەگی نەوەی شامیلیش •

لە ئەستەمبۆڵ پرسیم : « ئێستا سەعید بەگ لە کوێیە ؟ »
« چۆتە سعودیەی عارەبی • »
« بۆچی ؟ »
« بە بازرگانی • نەختێ زەوی لەوێ چنگ کەوتوە • »

بازرگانینه ! پێتان نەکرا بازرگانیتان لە داغستان بـکەن • شورش گوتی : « بازاڕ داخراوە • • » هەموو پیسیەکی بە گەسکێکی خوێنـاوی تووڕ دایـە دەرەوەی وولاتی شاخاوی • «ئیستـاش لەشی لەڕو لاوازی پاسەوانو دڵسۆزانی داغستان لە وولاتی بێگانان دەسوورێنەوە •

بەر لـە چـەند ساڵێ ، کۆنگرەیەکی نووسەرانی ئاسیاو ئەفریقیا لـە بیرۆت بەسترا • منیش چووبووم • داوایان لێدەکردم نەك تەنیـا بۆ گۆنگرە بەڵکو بۆ گوێگرانی دیکەش وتار بدەم • لەو کۆبوونەوەیەدا من باسی داغستانی خۆمم بۆ کردن ، باسی گـەلێ ڕەوشتەکانی ، شیعری گەلێ شاعیری داغستانیو هی خۆیشم خوێندەوە •

پاشان ، ئافرەتێکی جوانو جاحێل لەسـەر قاڵدرمان ڕایگرتم :

« جەنابی ڕەسوول ، دەتوانی چـەند دەقیقەیەك بۆ من تەرخـان بـکەی ؟ »

پێکەوە بە ناو شەقامەکانی بیروتدا گەڕاین • هاوڕێ نویێکـەم داوای لێکردم : « باسی داغستانم بۆ بکە • تـکات لێدەکەم ، هـەموو شتێکم بۆ باس کە • »

« ئەوە سەعاتێکی تەواوە باسی داغستان دەکەم • • »

« هێشتا ! هێشتا ! »

« چیت لە هەموو شتێ پێ خۆشترە ؟ »

« هەموو شتێك ، هـەر شتێك کـە پەیوەندی بـە داغستانەوە هـەبێ • • »

دەستم بە قسان کرد • بە بێ ئامانج دەسووڕاینەوە • لێ نەدەگەڕا کڕ بمـەوە هـەر دەیگوت : « هێشتا ! هێشتا ! »

منیش هەر قسەم بۆ کرد •
« شیعری خۆت بە ئافاری بخوێنەوە • »
« ئاخر ، تۆ تێی ناگەی ! »
« گرنگ نیە • »

جا شیعرم بۆ خوێندەوە • چ دەکەی ، کە ئافرەتێکی جوان‌و جاحێل داوا بکات ؟ بێجگە لەوەش تاسەو پەرۆشیەکی پڕ بە دڵم لە دەنگیەوە دەبیست بۆیە ئەستەم بوو قسەی بشکێنم •

ئەرێ گۆرانیەکی ئافاری نالێی ؟ »

« ئاە ـ نەخێر • گۆرانی نازانم • »
بیرم کردەوە دەمێکی‌تر داوام لێ‌دەکا هەڵیش‌بەڕم •
« حەز دەکەی من گۆرانیەکت بۆ بڵێم • »
« زۆرم پێ خۆشە • »

لەو کاتەدا گەیشتینە سەر دەریا کە لەبەر تریفەی مانگدا کەسك دەچوەوە • جا ، ئەو حەلە لە بێروتی دووردا ، ئەو ئافرەتە نازدارە گۆرانی (دەلالێ)ی داغستانیمانی بە زمانێك گوت نەمزانی چ زمانە • بەڵام کە دەستی بە گۆرانی دوەم کرد زانیم بە کومیکی گۆرانی دەڵێ •

بە سەرسامیەوە پرسیم :ـ « تۆ چۆن فێری زمانی کومیکی بووی ؟ »

« بە داخەوە نایزانم ! »
« ئەدی گۆرانیەکە • »
« باپیرم فێری کردم • »
« بۆ باپیرت لە داغستان ژیاوە ؟ »

« به ڕێکەوت ! »

« لـه مێژه ؟ »

« نوخبەك تارکۆفسکی باپیرم بوو • دەیناسی ؟ »

« کۆلۆتێلەکە ؟ ئێستا له کوێیه ؟ »

« له تاران دەژیا • ئەمساڵ عەمری خوای کرد • له سەرەمەرگدا هەر داوای لێدەکردم ئەو گۆرانییەی بۆ بڵێم • »

« گۆرانییەکە لەبارەی چییه ؟

« باڵندەی کۆچەر • هەڵپەڕکێیەکی داغستانیشی فێر کـــردم • سـەیر کـه ! »

وەك مانـگی نوێ بە ئاسکی دەدرەوشایەوە • به نەرمی باســکی هەڵدەهاویشت • وەك مــراوی سـەر گۆماو لـه ئەڵقەیەکی خڕ دا سووڕی دەدا •

داوام لێکرد جارێکیتر گۆرانی باڵندەی کۆچەرم بۆ بڵێتەوە • ووشەکانی بۆ لێك دامــەوە • کـه چوومه ئوتێلەکــەم لــه دەفتەری بیرەوەریدا نووسیمەوە ، بەڵام به ئافاری •

بەڵێ ، بەهـار هاتۆتەوە داغستان • بەڵام زۆرم پێ سەیرە ، ئـەو گورانییەی باڵندەی کۆچـەر بە لای میر نوخبەك تارکۆفسکی مانای چی بوە ؟ ئـەو کۆلۆتێله ، کـه لـه وولاتی شۆڕشگێڕانەی خۆیو لـەبەر تۆڵـەی داغستان هەڵاتبووو لـه ژێر دەسەڵاتی شادا دەژیا ، بۆچی شاخه جوانەکانی بەرهەتاوی هاتبوەوە بیر ؟

ئاخۆ ، هەستی بە چ تاســەو غەریبییەك کرد بێ ؟ ئارکۆفسکی ، کـه لـه ئێران دەژیا ، یەکەم جار دەیگوت :

« ئەوەی لـە من‌و داغستان قەوماوە هـــەلەیەکی چـارەنووسە ؟ دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی ئەو هەلەیە ڕاست بکەمەوە • »

هـەموو ڕۆژێ لەگەڵ کۆچ‌کردوەکانی‌تر دەچوە کەناری قەزوین بۆ ئـەوەی گوێی لـە دوا دەنگ‌و باسی داغستان بێ • بەلاَم هـەمیشە ئالاَی سووری بەسەر کەشتیانەوە دەدی • پایزان کـە ژنەکەی سەیری باڵندانی دەکرد لـە باکوورەوە دەهاتنە خوارێ ، غەریبی هەڵدەستاو گۆرانی دەچڕی • ئەویش ئـەو گۆرانیـەی باڵندەی کۆچەری دەچڕی • لـە ســەرەتاوە میر تارکۆفسکی‌بە تەواوی ڕکی لەم گۆرانییە دەبوەوە •

ساڵ هـات‌و ڕۆیشت • منداڵی فەرازی بوون‌و کۆلۆنێلیش کەوتە ســالاَنەوە • تێ‌گەیشت هـەتا هـــەتایە داغستـانی لـە دەست چوە • تێ‌گەیشت داغستان چارەنووسێکی نوێی هـەیە • وولاَت خۆی ڕێـگای ڕاست‌و دروستی خۆی هەڵبژاردوە • ئەو حەلە میری بە سالاَ چـوو خۆیشی دەستی پێ‌کرد گۆرانی باڵندەی کۆچەری چڕی •

باوکم دەیگوت : «داغستان هەرگیز لەگەڵ ئەو کەسانەدا ناڕوا کە لەگەڵ داغستان نەڕۆیشتن • »

ئەبوتالیب بۆی زیاد دەکرد : « ئەوەی سواری ئەسپێکی بێـگانە بێ زوو دەگلێ • خەنجەری ئێمـە هەرگیز لە جۆرە جلێکی‌تر نایە • »

سلێمان ستالسکی نووسیویە : « من وەکو چەقۆیەك وا بووم کـە لـە زەویدا نێژرا بێ ، هێـــزی سۆڤێت دەری هێنام ، قوڕەکـەی پاکژ کردەوەو منیش درەوشامەوە • »

باوکیشم گوتوویە : «ئەگـەرچی ئێمـە هەمیشە جیـایی بووین ، ئێستا وا بە سەر تەپکە شاخان کەوتین • »

ئـەبوتالیب بۆی زیاد دەکـرد : «داغستان ، لــە زیندانێ وەرە دەرێ • »

دایکم کە لانکی ڕادەژەند ، گۆرانی دەگوت :

**بخەوە : ئاشتی هەموو چیاکانی ئەم ناوەی گرتۆتەوە**
**تەقەش لەناو شاخی هەزار بە هەزاردا ناتەقێتەوە •**

ئەبوتالیب گوتوویە : «شوبات لـە هەموو مانگان کورتترە ، بەلاّم لـە هەموویان گرنگترە • لە شوباتێ بوو قڕاڵ تەختی وەرگەڕا • لــە شوبات سوپای سوور دامەزرا • هەر لە شوباتیش دا بوو لینین بەخێـر هاتنی وەفدێکی ئەم شاخانەی کرد •

لەو کاتەدا لە گوندی (روگودجاب)ی دوور ، ئافرەت گۆرانیەکیان لە بارەی لینین دانا :

**یەکەم کەس تۆ بووی لە وولاتی خۆماندا ئازادت کردین .**
**چەکی سەرکەوتنت خستە ناو دەستی بەهێزمانەوە •**
**چۆن کە قاز گوێیان لە قیرەی هەڵۆ دەبێ هەڵدێن‌و دەڕۆن •**
**بەم جۆرە ، شەو لەبەر دەم خۆری لینینی مەزندا ڕێی بۆ ڕۆژ چۆڵ کرد**

گەلێکی بچووك‌و چارەنووسێـکی گـەورە • باڵندە لـە داغستاندا دەخوێنن • ئەو ووشانەی لـە دەمی نەوەکـانی شۆڕش دێنـە دەرەوە ، دەنگ دەدەنەوەو دەزرنگێنەوە • منداڵ باسیان دەکەن ناویان لەسەر کێلە قـەبران هەڵدەکـەنرێ ، بەلاّم هـەندێ پاڵەوان لــە گۆڕی بزردا ڕاکشاون •

پێم خۆشـە بە شەوی کپ‌و هێمن لـە ناو شەقامەکـانی پێتەختی داغستان بسووڕێمەوە • کـە ناوی شەقامەکان دەخوێنمەوە ، وا هـەست دەکـەم کـە لیژنەی شۆڕش دوبارە کۆبۆتەوە • مەحەج دەخەدایێف !!

گوێم لـــە دەنـگییەتی : « ئێمـــە جەنـگاوەری شۆڕشین • زمانمان ، ناومـان ، ڕەوشتمان جودایە ؛ بەڵام هـەموومان لە شتێکدا هاوبەشین : هەموومان دڵسۆزی شۆڕش‌و داغستانین • هیچ کەسێکمان لـــە پێناوی شۆڕش‌و داغستان سووی لە خوێن‌و زیانی خۆی نابێتەوە • »

مەحەج بە دەستی چـەند ڕێگرێـکی پەلی تارکۆفسکی کوژرا • ئوللوبی بویناکسکی • گوێم لـە دەنـگییەتی : «دوژمنەکانمان ئەمـــن دەکوژن • هاوڕێکانم دەکوژن ، بەڵام هیچ دوژمنێك ئەو پەنجەمان خاو ناکاتەوە کە مشتێکیان پێك هێناوە • ئەو مشتە قوڕس‌و بەهێزە چونـــکە شاخی داغستان‌و باوەڕی شۆڕش قوچاندویانەتەوە • ئەم مشتەیە قوڕگی داگیرکەران دەگرێ • بیزانە ! • »

ئوللوبی لاوی کۆمۆنیستی داغستانی (بیست‌و هەشت ساڵان بوو ) بە دەستی پیاوەکـــانی (دەنیکین) کوژرا •لـــە بیاباندا کوژرا • ئێستا گوڵە خاشخاشی سوور لەو شوێنەدا شین بوە •

دەنـگی «ئوسـکار لیشچنسکی» ، ( قازی ـ محەمەد ئاگاسیف ) ، (هاڕون سەیدۆف) ، ( عەلی بەگ بەگەتیریێف) ، (سەفەر دودارۆف)، (سولتان ـ سەید کازبەکۆف) ، (باتیر موزاییف‌و کوڕی) ، (عومـــەر چۆخسـکی) ••• دەبیسم • زۆر کوژران ••• بەڵام هـــەر ناوێك زمانەیەکی هـاڵاوی ئاگرە ، ئەستێرەیەکە ، گۆرانییەکە • هـەموویان پاڵەوانی وان هـەتا هەتایە هـەر لاون • ئەوانە (چەپاییف)و (شچۆرس)و (شاومیان)ەکانی داغستانی ئێمەن • لە (ئاختی) ، لە دۆڵی (ئایا ـ کـاك ) لە دەم ڕوباری (کاسومکێنت) ، لەســەر دیوارەکانی قەڵای (خونزاخ) ، لـە (خەسافیورت)ی شەوتی ، لە (دەربەندی دێرین)دا فەوتان • لـــە گـەڵی (ئەراکان) دا بەرد نیـە بە خوێنی سەربازانی داغستان سوور نەبوو

بێ • لـە زنجیرەی (مۆچۆخ)دا بۆسەیان لـە پەلی (بەگەتیریێڤ) داناوە • خوێن لـە (ئەمەر خان شورا)و پۆرت پترۆڤسك‌و هـەر چوار قۆیسو ، کـە ئێستا لـە یادی شەهیدان گوڵی تێداوێن ، جۆگەلەی بەست • سەد هـەزار داغستانی فەوتان ، هـەموو کۆمۆنیست‌و پارتیزان بوون • بەڵام گـەلەکـانی دی بـە داغستانیان زانی • ملیۆنەهـا دۆست دەستیان بۆ داغستانی سوور درێژ کرد • داغستانیەکان کـە هەستیان بـە گـەرمێتی ئەو دەستانەی دۆستان کرد گوتیان : « ئێمە ئێستا زۆرین » !

شەڕ خەلـکی لێ‌ناکەوێتەوە • بەڵام داغستانێکی نوێ لە ناو ئاگری جەنـگی شۆڕشگێڕانەدا هـاتە دونیاوە •

لە ۱۳/ی تشرینی دوەمی ۱۹۲۰ دا یەکەم کۆنگرەی تایبەتی گەلانی داغستان بەسترا ••• ستالین بە ناوی حـکومەتی ڕوسیای فیـدرالی کۆنفراسەکەی کردەوە • ئۆتۆنۆمی بۆ وولاتە شاخاویەکەی داغستانیان ڕاگەیاند • ناوێـکی نوێ ، ڕێـگایەکی نوێ ، چارەنووسێکی نوێ • لـە ڕۆژمێرە داغستانیەکان ئەو ڕۆژە بە خەتێکی سوور نیشان کرا •

پاش مـاوەیەك لینین لــە ژووری خۆی ، لە کرملین پێشـوازی وەفدێـکی داغستانی کرد ، پاش گفتوگۆیەکی زۆرو لەسەر داخـوازی چایەکان خـۆیان لینین وێنەی خۆی بـە دیاری بۆ ناردن لێی نووسرا بوو : « بۆ داغستانی سوور • »

ئاسنـگەری (کوباچی)و تەنەکـەچی (ئونتسول) چوارچێوەیەکی ئەوتۆیان بۆ دارشت کەس شتی وای نەدی بوو • لە هەمـان ساڵـدا کەشتیەکی نوێ لە بەندەری مەحەچ قەڵادا هاتە دەرێ ـ ناوی داغسـتانی سوور بوو • داغستان خۆیشی وەکو کەشتیەکی گەورە وا بوو کەوتبوە گـەشتێکی نوێی گەورەوەو بەرەو پێش دەچوو •

( ئەستێرەی بەیان ) • ئەمە ناوی یەکەم گۆڤاری داغستانی بوو • بەیانی لە داغستان هەڵاتبوو • پەنجەرەیەك بەرەو دونیای هەراودا کرابوەوە •

لە ڕۆژە سەختەکانی شەڕی نیشتمانیدا کە تاقمەکەی گۆتسنسکی بە شاخان وەر ببوو باوکم نامەیەکی هاوڕێیەکی بە سالاچووی پێگەیشت کە هاوڕێی خوێندنی (مدرسە)ی بوو •

باسی نەجمەددین گۆتسنسکیو سەربازەکانی کرد بوو • لە کۆتاییدا گوتبووی :

« نەجمەددین لێت ڕازی نیە • وا بزانم زۆری پێخۆشە ئەگەر بێتو تۆ شیعر بۆ ئەم چیایە هەزارانە بنووسیو ڕاستەقینەی ئیمامیان تێبگەیەنی • من وەئەستۆم گرتوە کە خۆم بگەیەنمە تۆو هەرێم داوە کە تۆ ئەمە دەکەی • تکایە داوای منو ئارەزووی ئیمام بەجێ بێنە • نەجمەددین چاوەڕێی نامەت دەکات • »

باوکم وەڵامی دایەوە : «ئەگەر تۆ کاری وات گرتۆتە ئەستۆ خۆت شیعرەکان بنووسە • ئەمن یەك بە باری خۆم نامەوێ ئاو بەر بدەمەوە سەر ئاژگێڕێ ئەوەوە • والسلام و الکلام • »

لەو کاتەدا محەمەد ـ میرزا خزرۆف/ی بولشەفی ، ناردیە دوو باوکم بۆ ئەوەی بچێتە تەمەر ـ خان ـ شووراو داوای لێکرد لە ڕۆژنامەی ( کراسنێی گۆری ـ شاخە سوورەکان ) ئیش بکات • ئەم ڕۆژنامەیە بوو کە شیعری (بانگێك بۆ هەزارەکانی شاخ)ی باوکمی بلاو کردەوە •

باوکم لە بارەی داغستانی نوێی نووسی • بۆ (کراسنێی گۆری)ی

نووسی • ڕۆژگار هـاتو چوو ، محەمەد ـ میرزا خزروف کچێـــکی بوو • ڕوویان لە باوکم نا ناوێـکی بۆ پێشنیار بکات • ئەویش بلنـــدی کردو گوتی : «زوهرە!» زوهرە مانای ئەستێرەیە •

ئەستێرەی نوێ لە دایك بوون • منداڵ گـەورە بوونو بـە ناوی پاڵەوانە مردووەکان کران • داغستان وەکو لانکێـکی گـەورە وا بوو • شەپۆلی قـەزوین لایلایەی بۆ دەگوت • وولاتێـکی گەورە وەکو هەتیو خۆی دەسەر داغستان داهێنا بوو •

لـەو کاتەدا دایـکم گۆرانی بـە پەڕەسێلـکەو گیـای بن بەردو گوڵی پشکوتووی پایزان هەڵـگوت • بە دەم ئەم لایلایانەوە سێ کوڕو کچێك لە ماڵی ئێمەدا پێ گەیین •

دیســان ســەد هــەزار کوڕو کچ لـە داغستان پێ گـەیشتن ـ جوتیار ، شوانکارە ، باخچەوان ، ماسیگر ، بەردتاش ، مۆرهەڵـکەن ، ئەندازیاری کشتو کاڵی ، دەختـۆر ، مامۆستا ، ئەندازیار ، شـــاعیر ، هونەرمەند • کەشتی کەوتنە دەریاوەو فڕوکـە کەوتنە ئاسمانەوەو چرای وا ڕوناکیان بلاو کردەوە کـە شتی وا پێشتر نەدیترا بوو •

سلێمان ستالسکی گوتی : « ئێستا بوومـەتە خـاوەنی سامانێـــکی گـەورە • »

باوکم گوتی : « ئێستا تەنیـــا لێپرسراوی دێ نیم ، بەڵـــکو هی هەموو وولاتم • »

ئەبوتالیب هاواری کرد : «بفڕە ، گۆرانیەکـەم ، بەرەو کرملین بفـــڕە • »

نەوەی نوێ ســەرو سیمای نوێیان بە گەلەکەمان بەخشی •

وولاتی گـــەورەی سۆڤیەت وەکو درەختێکی گـــەورە وایە • داغستان چلێکیەتی •

نازییەکان بۆیە پەلاماریان داین تا ئەو درەختە ڕیشەکێش بکەن‌و قـەدو چلەکانی بسووتێنن •

ئەو ڕۆژە ژیان ڕێچکەی ئاسایی خـۆی گرتبوو ، لـــە خونزاخ بازاڕی یەك شەم هەبوو • لە قەڵادا پیشەنگای کشت‌و کاڵی ناوچـــەیی هـــەبوو • تیپێك لـــە گەنجان چوز بوون بە قەد (چیای‌زینێ) هەڵگەڕێن• شانۆی ئافاری خۆی بۆ یەکەم شەوی شانۆگەری (قوتووی گیروگرفت)ی باوکم ئامادە دەکرد •

بەڵام بۆ بەیانی قوتوویەکی گیروگرفتی وا کرایەوە کە ئەوانەی دی هەموو لە بیر کران • شەڕ دەستی پێ‌کرد •

ڕەوە گەنج‌و پیاو لە هەموو گوندە شاخاوییەکانەوە ڕەوانە کران ، کە تا دوێنێ ڕەزەوان بوون‌و ئەمڕۆ پاسەوان‌و بەرگریکەری وولاتەکەیانن لـە هـــەموو گوندەکانی داغستان ، پیرەژن‌و کچـــە عازەب‌و منـــداڵ چووبوونە ســـەر بانان‌و سەیری زەلامانیان دەکرد کــــە خـــەریك بوون دەڕۆیشتن • دەچوون ماوەیەکی زۆریان پێ دەچـــوو ، هـــەندێك بـــە یەکجاری دەڕۆیشتن • لە هەموو شوێنێکدا هەمان قسە بوو دەکرا :

« خوا حافیز ، دایە ! »

« بە خێر بمێنن بابە ! »

« ئەو ماڵە هەر ئاوا بێ داغستان ! »

« بەختتان لە بار بێ منداڵینە ! بەسەر کەوتوویی بێنەوە ! »

شەمەندەفەر لـــە دوای شـەمەندەفەر مەحەچقەلایان بە جێ هێشت ،

وەك هێلێك وا بوون لە نێوان دەریاو شاخەکاندا •

گەنجو هێزو جوانی داغستانیان پێ بوو • سەراپای وولات پێویستی بەم هێزە بوو •

پیاو لە هەموو شوێنێکدا دەیبیست :ـ
« دولبەر ، حوا حافیز ! »
« حورمێ ، خوا بتپارێزێ ! »
« بە جێم مێلە ، دەمەوێ لەگەڵتا بێم ! »
« بە سەرکەوتوویی دێینەوە ! »
شەمەندەفەرەکان ڕۆیشتن • سەریان لە دوو یەك نا بوو •

( کۆلیجی ڕاهێنانی مامۆستایان)ی خۆم دەبینم • بەتالیۆنی سوارەی داغستانی بە تەك گۆڕستانی ئەو کەسانەدا تێپەڕی‌کە لـە پێناوی شۆڕشدا شەهید کران • (کەراکەرایێف)ی پارتیزانی سوور سەرکردەیان بوو • ڕوویەکی ترش‌و تاڵی هەبوو • بەتالیۆنەکەی خۆی لە شیری خوا دا •

ئینجا چاییەکی نەوەد ساڵی قسەی بۆ بەتالیۆنەکە کرد :

« داخم ناچێ کـە ئەمڕۆ لە تەمەنی سی ساڵیدا نیم • بەڵام بـە سێ کوڕم لەگەڵتاندام • »

ئینجا تیپی جەنـگاوەری داغستان ، بەتالیۆنی تانـــکی شـــامیل ، شەمەندەفەری شەڕکەری کۆمسۆمۆلی داغستان هاتن • کوڕو باب شـان بە شانی یەکدی دەجەنگان •

جارێکی‌دی ناوبانـگی جەنگاوەران لەسەر شاخان درەوشایەوە • ئافرەت ، خەناو کـــەو گوارەوبەنتك‌و کەمەرەو ئەنـگوستیلەیان بەخشی ـ کـە دیاری دەزگیران‌و مێردو باوکان بوو ـ زێڕو زیوو مرواریان بە

وولاتەکەیان بەخشی بۆ ئەوەی سەرکەوتن بە دەست بێنن .

بەڵێ داغستانییەکان چوونە سەنگەرە بۆ ئەوەی شان بە شانی سەراپای وولات بجەنگن . لە هەموو قۆڵێکدا دەکەوتنە بەرچاو ـ دەریاوان ، پیادە ، تانکچی ، نیشانەشکێن ، فڕۆکەوان ، تفەنگچی ، کۆماندۆ ، پارتیزان . لە هەموو سەنگەرەکانیشەوە نامەی ناخۆش بۆ داغستانی بچکۆلە دەهات .

گوندی (تسادا)مان حەفتا ماڵە . نزیکەی حەفتا لاوی چوونە سەنگەر . لە کاتی شەڕدا دایکم دەیگوت : «زۆر جار لە خەوندا دەبینم هەموو منداڵە تسادایەکانمان لە مێرگی خوارێ کۆبوونەتەوە . » هەندێ جار سەری هەڵدەبڕیو تەماشای ئەستێرەیەکی دەکردو دەیگوت : « ئەو ئەستێرەیە لە شوێنێکی نزیك لینینگراد بەسەر منداڵەکانماندا دەجریوێنێ . » کە باڵندەی کۆچەر لە باکوورەوە دەهاتن دەیگوت : « ئەرێ منداڵە تسادایەکانمانتان نەدیوە ؟ »

ژنە چیاییەکانمان ، بە نامە خوێندنەوەو گوێدانە ڕادیۆ زۆر ناوی سەیرو گران فێربوون : کێرچ ، برێست ، کۆرسون ـ شێفچینکۆفسکی ، پلۆیستی ، کۆنستانتا ، فرانکفۆرت/ی سەرمێن ، براندنبرگ . دوو ناو هەبوو هەمیشە لێیان تێکەڵ دەبوو ـ بۆخارێستو بۆدابێست . باوەڕیان نەدەکرد ئەمانە دوو شاری جودا بن .

بەڵێ ، منداڵە تسادایەکانمان چوونە زۆر وولاتی بێگانە .

لە چلو سێدا منو باوکم چووینە شاری بەلاشۆف . براگەورەکەم ( محەمەد هەمزەتۆف ) لەوێ لە نەخۆشخانەی سەربازی ئەمری خوای کرد بوو .

باوکم ئەمامێکی لەسەر گۆڕەکە چاند ، چنارێکی ڕووسی · گوتی :
« گۆڕستانی تسادامان فراوان بوە · گوندەکەمان گەورە بوە · · »

## گۆڕستانی تسادا

دراوسێینە ، ئێوە
لە گۆڕستانی تسادا
لەناو کفنی سپی ڕاکشاون و تاریکی نووڵی داون ·
من لە دوورەوە هاتومەتەوە ماڵێ ·
ئەچی ئێوە ئەوەندە نزیکن و
نائەڕێنەوە ماڵێ ·
کەم برادەر لە گوند ماوە ·
گوندەکەمان خزمی تێدا کەم بۆتەوە ·
توش کچی کاکەم ·
ئەمڕو نەهاتیتە پێشوازیم ·
ئەی ئەشمیلو ڕوحسووك ، چیت لێ‌هاتوە ؟
ڕۆژگار وەك ڕوبار بەسەرتا تێ‌دەپەڕێ ·
هاوڕێکانی دوێنێت خوێندنیان تەواو کرد ،
کەچی تو هەتا هەتایە هەر لە پۆلی پێنجەمی ·
پێم سەیرو ناشیرین بوو ،
لەم ناوچە چۆلە ،
لەســەر گۆڕەکەی ·
زوڕنای پیاسلان فیقەی دێ
دەفی باوکی سەمەدی هاوڕێی لێی‌دا
گوێی لە ڕۆژگاری پێشوو بوو ·
هەستم کرد ، وەکو شادی
زەماوەندی دراوسێ‌کەیان
شــاد بوون ·
نەخێر خەڵکی ئێرە حەزیان لە هەرا نیە · ·
ئەوەی بانگیشی بـکەی وەڵامت ناداتەوە ·
گۆڕستانی تسادا ، نیشتمانی پێدەنگان ،
دوا مەنزڵی ڕۆڵەکانی نیشتمان ·

تۆ گەورە دەبیو بێسنوور دەکشێی ٠
ساڵ بە ساڵ پڕ کێلتر دەبی ٠
دەزانم ڕۆژێ دێو ،
منیش دەکەومە ناو سنووری تۆ ٠
لە نێو چەوانمان نووسراوە ٠
هەر چەندە ڕێمان جودا بێ
دوا قۆناغ لێرە پێك دەگەینەوە ،
بەلام زۆر تسادایی هەن ٠
لێرە نایانبینم ٠
ئەگەرچی لە مێژیشە مردوون ٠
زۆر سەربازی گەنجو جەنگاوەری کاڵ
لە ماڵەوە نەمردوون ٠
ئیسحاق بیاسلانۆف ، لە کوێ نێژراوی ؟
حاجی ماگوی ، برام ، ئەدی تۆ لە کوێی ؟
برا ئازیزە کوژراوەکانم ، ئێوە لە کوێن ؟
دەزانم چیتر یەکدی نابینینەوە ٠
بەلام سـەد ئاخ ٠
گۆڕتان لە گۆڕستانی تسادا نیە !
گولله لە شەڕگەی دوورا دڵی سمیون ٠
لە شەڕگەی دوور دەستتان تێك گرتوە ٠
گۆڕستانی تسادا ،
تۆ چۆن گۆڕی ڕۆڵەکانت وا دوورفڕێ داوە ٠
ئێستاش لە وولاتی گەرمو سارد
کە ڕۆژ دەجۆشێو زریان دەیبەستێ ٠
ژنە ئاڤار گوڵ ناهێننە سەر گۆڕتانو
لە سەر گوڵکۆی دانانێن ٠

لـــە کـاتی شـەڕدا نەخشەیەکی گەورە بـــە دیواری سۆڤێتی گوندەکەمانەوە هەڵواسرا بوو ٠ ئەو جۆرە نەخشەیە لـە سەرانسـەری وولاتدا هەبوون ٠ ئالای بچکۆڵەی سووریان لەسەر چەقابوو کـە جێ سەنـگەرەکانیان پێشان دەدا ٠

نەخشەی ئێمەش ئالآی بە سەرەوە بوو • بەڵام مانایەکی تریان دەگەیاند • ئەو جێگایانەیان پێشان دەدا کە زەلامەکانمان لێ شەهید بوون • ئەو ئالآیانە زۆر بوون • بە قەد ئەو نووکە دەرزیە تیژانە بوون کە دڵی دایکانیان سمی بوو •

بەڵێ ، گۆڕستانی ئەسادا گچکە نەبوو • دایکە پەرۆشەکان دەچوونە لای فاڵچییان ، ئەوانیش دڵیان دەدانەوە : «ڕێیەك هەیە • ئاگرێك هەیە • سەرکەوتنێك هەیە • کوڕت دێتەوە • ئاشتی دوبارە دەگەڕێتەوە • »

ئەو فاڵچییانە حیلەباز بوون • بەڵام لە بارەی سەرکەوتنەوە بە هەڵەدا نەچووبوون • لە سەر دیوارەکانی (ڕێچستاگ) نووسینێك لەناو گەلێ نووسینی تردا هەیە • بە نووکە قەمە هەڵکەندراوە :

« ئێمە خەڵکی داغستانین ! »

دوبارە ، پیرەمێردو ژنو منداڵ بە سەر بانان کەوتنو لە دوور ڕامان • ئەمجارە هەڵۆکانیان بە ڕێ نەدەکرد ، بەڵکو چاوەڕێ بوون بگەڕێنەوە • چ دیار نەبوو زەلام لە کلکە شاخان شریتە ببەستن • هەموو پێکەوە چوون بەڵام یەك یەك هاتنەوە • هەندێ ئافرەت دەسرۆکی ڕەنگینیان بەست ، بەڵام هەندێکی تر هی ڕەش • ئەوانەی گەڕابوونەوە دایکەکان لێیان دەپرسین :ــ

« کوا عومەری من ؟ »

« ئەرێ عەلی منت نەدیوە ؟ »

« محەمەدی من بەم زوانە دێتەوە ؟ »

دایکیشم دەسرۆکێکی ڕەشی بەستا بوو • محەمەدو ئەخیلچی ــ جوتە کوڕی ئەوو جوتە برای من ــ تازە نایەنەوە • ئەوانەی دایکم

خـەونی پێوە دیبوون لـە مێرگی خوارێ یاری دەکـەن ، زۆر بەیان نەهاتنەوە • زۆربەی ئەوانەش نەگـەڕانەوە کـە فاڵچیەکان پێشبینی گەڕانەوەیان کرد بوون •

نزیکەی سـەد زەلام نەهاتنەوە گوندەکەمان ، سـەد هـەزار نەهاتنەوە داغستان •

تەماشای ئالایەکـانی سـەر تەختەی دەکـەم • ناوی شوێنان دەخوێنمەوە ، ناوی پیاوەکانی گوندی خۆمانم دێتەوە بیر •

محەمەد حاجیف لە دەریای بارنیتسدا خنکا • محـەمەد زاهید عەبدوڵەنافۆفی تانـکچی ، لە سمفرۆپۆل کوژرا • خان پاشانوورادیلۆفی دۆشکەچی لە ستالینگراد شەهید بوو ـ چەچان بوو بەڵام ڕۆڵەی داغستان بوو • کەمالۆفی نەبەرد سەرکردایەتی چەتە شەڕکەرەکانی کرد لـە ئیتالیاو لەوێ مرد •

هـەر گوندێـکی چیایی پەیکەرێکی قووچەکانی لێیە • ناو ، ناو ، ناوی تێـدایە • چیـایی لـە ئەسپەکەی دادەبەزێو بـە سـەر کۆتی لە دیاری ڕادەوەستێ •

کانی شاخان ناوی شەهیدانیان لێیە • پیرەمێرد لەسەر ئەو کانیـانە دادەنیشن چونـکە لـە زمانی ئاو دەگەن • لە هەموو ماڵێکیشدا ، لـە جێـگای پیرۆزو متەفەڕك وێنـەی ئەوان کەسان هەڵواسراوە کـە هەتا هەتایە هـەر جوانو جەحێلن •

هـەر کاتێ کە لە گەشتێکی دوورو درێژ دەگەڕێمەوە ، هەندێ دایك بە دزە ئومێدەوە لێم دەپرسن :

« قەت لەوێ تووشی کوڕی من نەبووی ؟ »

بە هیواو کوڵو کەسەرەوە سەیری قورینگان دەکەن کە بە ڕەوە دەفڕن • منیش ناتوانم چاو لەو قورینگانە هەڵگۆزم کە بەسەر سەرمدا تێدەپەڕن •

## قورینگ

هەندێ جار وا دەزانم سوارەی دلێر ،
کە لە شەڕی خوێناویدا مردوون ،
نەخراونەتە گۆڕ ،
بەڵکو هەڵفڕیونو بوونەتە قورینگی پەڕسپی •

لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ
بەسەر سەرمانەوە دەفڕنو دەفیڕێنن ،
ئەدی بۆیە نیە بە کپو بێدەنگی
تێیان تێ دەبینەوە •

لە وولاتی هەرە دووری بێگانانیدا
قورینگ لە نێو زەردەپەڕدا دەبینم
وەك ئەسپ سواری چالاك
بە کۆمەڵ تیژ دەفڕنو تێدەپەڕن •

کاتێ کە دەفڕنو دوور دەکەونەوە
گوێم لێیانە ناوی یەکێك دەبەن •
ئەوە بۆیەیە کە دەنگی زمانی ئاڤاری
قیرەی قورینگانی تێدایە •

بەناو ئاسمانی شەکەتدا پێشبڕکێیانە •
دۆستو خزمن !
بۆشاییەك لە ریزەکانیان دەبینم •
ڕەنگە بۆمنیان دانابێ ؟

ڕۆژێ دێ دەچمە ناو ڕەوە قورینگان •
لەگەڵ ئەواندا لە شەقەی باڵ دەدەمو دەڕۆم •
ئێوەش کە لێرە لەسەر زەوی دەمێننەوە •
گوێتان لە قیرەی بڵندو بەهێزی من دەبێ •

فورینگەکان دەفڕن ، گیـا دەڕوێ ، بێشکەکان ڕادەهەژێن • لـە ماڵی منـدا سێ کـەس لە سـەر پشتی لانك ڕاکشاون • سێ کچم بوە • ئەوانی دی چوار یا دە یا پازدە یان هەیە • سـەد لانك لـــە تســـادا ڕادەهەژێ • سەد هەزار لانك لە داغستان ڕادەهەژێ • ڕادەی منـداڵ بوونی داغستان لـە هـەموو ڕوسیای فیدرالیدا زیاترە • ئێستا ، ئێمـــە ملیۆن‌و نیوێـــکین • تـا خـەڵك زۆر بێ زەمـــاوەند زۆر دەبێ ، تا زەماوەندیش زۆر بێ خەڵك زۆر دەبێ •

چاپیەکان دەڵێن : سێ شت هەن نابێ وە درەنگ بخرێن : ناشتنی مردوو ، دانان‌و بەخێر هێنانی میوان ، بە شووداني کچی ســەرو عوزر شـــۆر •

داغستان قەت لـەم سێ شتەدا سستی ناکات • دەهۆڵ دەکوترێ ، زوڕنا فیقەی دێ ، ئاهەنگ‌و زەماوەند دەست پێدەکات • خـــاوەنی ئاهەنگەکە کـە پێکی یەکەم هەڵدەدا دەڵێ : « بووك کوڕی ببێ ! »

سێ شتی تریش هەن دەبێ چاپیی بە ویژدانی بیان‌کات :

شاخی ــ شەراب تا دوا تڵپ هەڵقوڕێنێ ، ناوی خۆی بپـارێزێ‌و هەرگیز لە ساتی تەنگانەدا وورەی نەڕووخێ •

چاپیەکانیش تەنگانەیان کـەم نەدیوە • چارەنووس زۆر زەبری گـــرانی ســـرەواندۆتە زنجەکـــانی داغستان ، بەڵام توند خـــۆیان ڕاگرتوە •

ئێستا وەکو پێشان ، ئاشتی لـە دونیـادا نەماوە • تفەنگ دەتەقێ ، بۆمبا لێرەو لەوێ دەگرمێنێ‌و دایك هەمیشە کۆرپەکانیان بـــە خـۆوە دەقرسێنن •

کە هەوری تەڕو تاری بە ئاسماندا دەڕوا سەپان بە هەڵەداوان دەچێتە سەر زەوی بۆ ئەوەی قرشەی درواوە دا بکات • کە ئاسمان بەسەر دونیاداتاریك دادێ ، گەلان بە لەزو بەز دەچن بۆ ئەوەی ئاشتی لە هەڕەشەی شەڕ بپارێزن •

ئێمە لە داغستاندا دەڵێین : « گای کێوی قۆچەکانی دەبڕێ ، سەگی دڕ زنجیر دەکرێ » ئەگەر ئەمە لە ئاستی دونیادا بکرایە ژیان زۆر ئاسان دەبوو ! ئەمرۆ داغستانی بچکۆڵە خەمی دونیای گەورەی لەبەرە •

کاتی خۆی کە چیایەکان دەچوونە شەڕ ، منداڵیان نەدەبردن • بەڵام شامیل گوتی دەبێ بیانبەین • ڕەنگە قلینجك بێسوود بێ بەڵام مستی توند بێ قلینجك پێك نایە •

دەبا داغستان لە مستی قوچاوەی وولاتدا وەکو قلینجك وا بێ • دوژمن هەر چەندە هەوڵ بدەن ئەو مستەیان پێ خاو نابێتەوە • مست تەنیا بۆ دوژمنانە • بۆ شانی دۆستان دەستی والا هەیە • بەڵام ئەو دەستەش قلینجکی خۆی هەیە •

کە لە وولاتانی تر بم ، یەکەمجار ناسیاوی لەگەڵ شاعیراندا پەیدا دەکەم • گۆرانی زوو لە گۆرانی دەگات • بەڵام هەوڵیش دەدەم هاونیشتمانەکانم بدۆزمەوە • بێگومان ، زۆر جۆرە کەس لە دەرەوە هەن • بەڵام کەیفم بە هیچ هەڵوێستێکی هاونیشتمانیان نایە هەر لەبەر ئەوەی لایان داوە • لە تورکیا ، سوریا ، ئەلمانیای رۆژئاوا تووشیان هاتووم • جا لە کوێ تووشیان نەهاتووم ؟!

هەندێ داغستانی لە سەر دەمی شامیلیش داغستانیان بەجێهێشت • بە دوای بەختیاریەك داچوون کە لە ماڵێ چنگیان نەدەکەوت •

هەندێکی‌تر بۆیە ڕۆیشتن چونکە لە شۆڕش نەگەیشتن یا تێ گەیشتن بەڵام ترسان • هەندێکی ترسیش شۆڕش خۆی وەدەری نان • جۆری چوارەمیش هەن ، لە هەمووان کەمترو بێ هوورەترن • ئەمانە لە شەڕی بەم دوایەدا خاینی نیشتمانەکەیان بوون • زۆر جۆرە داغستانیم دیوە • بگرە لە تورکیا چوومە سەردانی گوندێکی داغستانی • خەڵکی گوندەکە پێیان گوتم :

« ئێمە ، لێرە داغستانی بچکۆڵەی خۆمان هەیە • »

« نەخێر ، وا نیە • تەنیا یەك داغستان هەیە ، قەت نابێتە دوو • »

« ئەدی ئێمە کێین ؟ و خەڵکی کوێین ؟ »

« ڕاستە ، کێن‌و خەڵکی کوێن ؟ »

« خەڵکی (کەرەت) ، خەڵکی (باتلوخ) ، ( خونزاخ) ، (ئاکوش) ، (کوموخ) ، (چۆخ) ) ( سۆگراتلی )ین • ئێمە خەڵکی گەلێ دێهاتی داغستانین • هەروەها ئەوانەش کە لە گۆڕستانی گوندەکەمان ڕاکشاون • ئێمەش داغستانێکی بچووکین • »

پەنجەم بۆ وێنەی « گوتسنسکی » ،(عەلیخانۆف) ، «ئوزون حاجی» درێژ کردو پرسیم : « کاتی خۆی هەو بوون • هەندێك هێشتا دەیانەوێ هەو بن • ڕەنگە ئەمەش داغستان بێ ؟ »

« ئەدی چییە ؟ ئەوانە لەگەڵی خۆمانن ، بە هەمان زمان دەدوێن •»

« داغستان لە زمانیان نەگەیشت‌و ئەوانیش لە زمانی داغستان نەگەیشتن • »

« هەر کەسە بە شێوەی تایبەتی خۆی لە داغستان دەگات • هەر

کەسە داغستانی خۆی لە نێو دڵدایە ٠ »

« بەڵام داغستان هەموویان بە کوڕی خۆی دانانێ ٠ »

« کەوا بوو ، ئەدی کێ بە کوڕی خۆی دادەنێ ؟ »

« وەرنە ئەو شوێنەی لانکی منداڵەکانمی لێ ڕادەهەژێ ٠ »

« لەوێ چیمان دەرهەق دەڵێن ٠ »

« دەڵێن ئەو بەردانەن کە لە کاتی دروست کردنی داغستاندا لەگەڵ دیوار نەگونجان‌و فڕێ دران ٠ ئەو گەڵایانەن بای خەزان ڕایماڵین ٠ ئەو ژێیانەن کە لەگەڵ ژێیە سەرەکیەکانی پاندوردا ڕێك نەکەوتن ٠ »

ئاوها لەگەڵ ئەو هاونیشتمانانە دوام کە لە وولاتی بێگانەدا دەژین ٠ دەوڵەمەندو هەژار ، باش‌و خراپ ، سەربەرزو سەرشۆڕ ، تەفرەخۆرو تەفرەدەریان تێدایە ٠ سەمای ( لێزجینکا )یان بۆ کردم ؛ بەڵام دەهۆڵەکە بپانی بوو ٠ کە دەڵێن ئێمەی داغستانی ملیۆن‌و نیوێکین ئەوانە حسێب ناکەین ٠

کە سووریام بە جێ هێشت ، ژنە ئافارێك داوای لێکردم سڵاوی بە دارقەیسییەك بگەیەنم لە گەرگەبیل ، دەستی لەسەر دابنێم ٠

منداڵە ئافار لەسەر کەناری دەریای مەڕمەڕە ، کە باوکیان چوو بوە مەککە ، پێیان گوتم : « مەککەی ئێمە داغستانە ٠ یەکێ بچێتە مەککە دەبێتە حاجی ، بەڵام ئێمە حاجیمان ئەو کەسەیە بچێتە داغستان ! »

جارێکیان حاجیەك کە چل ساڵ وولاتی خۆی نەدی بوو ، لە مەحەچ قەڵا هاتە لام ٠ لێم‌پرسی :

« باشه ، دەبینی داغستان گۆڕا بێ ؟ »

« ئەگەر بچم لەوێ بۆ خەڵکی باس بکەم باوەڕ ناکەن • بەڵام دەتوانم یەك شت بڵێم : داغستان دەژی ! »

بەڵێ ، دەژی ، داغستانەکەم ، کۆمارەکەم • گەلەکەم ـ زمانی ، ناوی ، ڕەوشتی ، هەمووی دەژین • ئەوەیە چارەنووسی داغستان • ئاهەنگی زەماوەند دەگەڕێ ، لانك ڕادەهەژێ ، مەی دەخورێتەوەو گۆرانی دەگوترێ •



# زمــان

**ئەی دابەشکەری زمانان ، جارێکی‌تریش سوپاست دەکـــەم • سوپاست دەکەم کە شاخەکانمان ، گوندەکانمـان ، دڵەکانمانت لــــە بیر نەکرد •**

**سوپاس بۆ ئێوەش هەمووتان کە بە زمانی زگماکی خۆتان گۆرانی دەبێژنو بیر دەکەنەوە •**

★ ★ ★

ووشەی « میللەت »ی ئاڤاری دوو مانـــای هەیـە : « نەتـەوە » « بایەخ» یان « پەیوەندی » • باوکم دەیگوت : ئەوەی بایەخ بە نەتەوەی خۆی نەدات ناتوانێ بایەخ بە دونیا بدات • »

ئەبوتالیب دەپرسی : « ئاخۆ دەبێ نەتەوە بایەخ بەو کەسانە بدا کە بایەخ بە نەتەوە نادەن ؟ »•

دایکم دەیگوت :

« مریشك ، قاز ، مشك ، نەتەوەیان نیە ، بەڵام خەڵك هەیانە ».

دەشێ یەك نەتەوە لە دوو کۆماردا هەبێ . وەکو « ئۆسێت »ی دراوسێکانمان . یان یەك کۆمار چل نەتەوەی تێدا هەبێ .

ڕێبوارێك لە بارەی داغستانەوە گوتوویە : « یەك شاخ زمان و گەلن . »

دوژمنەکانمان گوتوویانە : « عەزیایەکی هەزار سەرە . »

دۆستەکانمان گوتوویانە : « درەختێکی هەزار لکە . »

ڕێبوارەکان گوتوویانە : « هەموو دونیا بگەڕێی وڵاتێکی وا بچووك نادۆزیتەوە ئەوەندە نەتەوە زۆرەی تێدا بێ . »

ئەبوتالیب بە گاڵتە دەیگوت : « ئێمە یارمەتیەکی زۆری پێشکەوتنی ڕۆشنبیریی جۆرجیمان داوە . »

«مەبەستت چیە ؟ ئەوان تەمەنی ڕۆشنبیریان هەزار ساڵە . شۆتا ڕۆستاڤێلی هەشت سەد ساڵ پێش ئێستا ژیاوە . ئێمە دوێنێ فێری خوێندەواری بووین ، چۆن توانیومانە یارمەتیان بدەین ؟ »

« بەم شێوەیە : ئێمە هەر گوندێکمان زمانێکی تایبەتی خۆی هەیە . جۆرجیە دراوسێکانمان بڕیاریان دا ئەو زمانانە فێر بن و بەراوردیان بکەن. ئەوانەی لە زمانەکانیان کۆڵیەوە ووتارو کتێبی زانستیان نووسی و بوون بە باحث و خاوەن ماستەرو دکتۆری زانست ئەگەر داغستان تەنیا یەك زمانی هەبایە ئەوەندە دکتۆرە پەیدا نەدەبوو . »

بەڵێ ، زۆر کتێب لە بارەی ڕێزمان و سینتاکس و فۆنەتیك و ووشەی

زمانەکانی داغستان نووسراوەو دەنووسرێ • زۆر ئیش ماوە بکرێ ، لێکۆلەرەوەینە ، وەرنە بەرێ ، بەشی خۆتانو منداڵەکانیشتان دەکات •

زاناکان مشتو مڕو گفتوگۆ لەسەر زمانەکانی داغستان دەکەن • هەندێ دەڵێن ژمارەی زمانەکانی ئەوەندەیە ، هەندێکی دی دەڵێن نە ، ئەوەندەیە •

هەندێ دەڵێن زمانەکان بەم جۆرە پەیدا بوون ، هەندێکی دی دەڵێن بەو جۆرە ـ بەڵگەو سەبارەتەکانیان زۆر دژو ناکۆکە •

بەڵام شتێ هەیە من باشی دەزانم : دەشێ ئەوانەی بە ترومبێل سەفەر دەکەن بە پێنج زمانی جودا بدوێن • خۆ ئەگەر پێنج ترومبێل لە چوار ڕیانێك بگەنە یەك ئەوا گوێت لە (٣٠) سی زمان دەبێ •

کە ڕێکخراوی ژێرزەمینی پارتی بە سەرۆکایەتی ئوللوبی بویناکسلی کەوتنە بەر تەقەی دوژمن ـ خۆیان شەش کەس بوون ـ پێش مردن بە پێنج زمان جوێنیان حەواڵەی دوژمن کرد :

| | |
|---|---|
| ئوللوبی بویناکسلی | بە کومیکی |
| سعید عبدالعلیمۆف | بە ئاڤاری |
| عبدالوهاب حاجییف | بە دارجینی |
| مجید علی تۆغلی | بە کومیکی |
| عبدالرحمن اسماعیلۆف | بە لیزجیانی |
| ئوسکار لێشچنسکی | بە ڕووسی |

محەمەد سلێمانۆڤی نووسەری داغستانی پازدە چیرۆکی گاڵتەجاری لە بارەی پازدە محەمەدی پازدە نەتەوەی داغستانیەوە هەیە • ئەو کۆمەڵە چیرۆکەی ناو ناوە « پازدە محەمەد • »

دیمتری ترونۆفی نووســـەری ڕووسی کــە لە داغســتان دەژی ، ووتارێکی لە بارەی کولخۆزێکەوە نووسیوە کە ئەندامەکانی لە (٣٠) سی نەتەوەن ●

دەفتەری بیرەوەری ئەفەندی کەپاییف باسێکی تێدایە لە بارەی سێ نووسەری داغستانی - سلێمان ستالسکی ، هەمزە تساداسا ، عەبدولـــلا محەمەدۆف کە هەموو پێکەوە بە یەك ترومبێل چوونە مۆسکۆ بۆ یەکەم کۆنگرەی نووسەرانی یەکێتی سۆڤیەت ● سێ ڕۆژ بە ڕێوە بوون ، هەموو شاعیری میللی داغستان بوون بەڵام نەیاندەتوانی قسە لەگەڵ یەکـــدی بکەن ● هەر کەسە زمانی خۆی هەبوو ناچار بــە ئیشارەتو لاسایـی قسەیان دەکرد ●

ئەبوتالیب کە باسی تاقی کردنــەوەی پارتیزانــی خۆی دەکــرد ، دەیگێڕایەوە : « خەڵك لە دەوری یەك مەنجەڵە مزەورەدا بە بیست زمان دەدوان ● یەك فەردە ئارد بە ناو بیست نەتەوەدا دەبەشرایەوە ● »

جونگوتای ژێریو جونگوتای ژووریمان هەیە ● بەینیان ســـێ کیلۆمەترە ● جونگوتا ی ژێری بە کومیکی دەدوێن ، کەچی جونگوتای زووری بە ئاڤاری داخڤن ●

دارجین دەڵێن خەلکی « مەگەب » دارجینن ؟ کەچی ئاڤار دەڵێن نەء ئاڤارن ● باشە خەلکی مەگەب خۆیان چ دەڵێن ؟

« ئیمە نە دارجینینو نە ئاڤار ● ئیمە مەگەبین ● زمانی مەگەبـــی خۆمان هەیە ● » لە مەگەب حەفت کیلۆمەتر هێوە بڕۆ بۆ چۆخ ، زمانی مەگەبی دادت نادا ، ئەوانیش زمانی تایبەتی خۆیان هەیە ●

دەڵێن بۆیە ئەو ماوە دوورو درێژە نهێنی ئاسنگرانی کوباچــــی

نەزانراوە چونکە کەس نەیتوانیوە لە زمانیان بگات • تۆ ئەگەر بشتەوێ نهێنیەك بدۆزیتەوە چت پێ ناکرێ چونکە هیچ ڕێگایەکت نیە •

هەروەها دەڵێن جارێکیان خانی خونزاخ خەفیەکانی خۆی ناردە گیداتلی بۆ ئەوەی لە گۆدەکانو لە بازاڕ گوێ ڕابگرنو بزانن نیازیان چیە ؟

خەفیەکان بە پەلەپەل گەڕانەوە •

« چیان لێ تێگەیشتن ؟ »

« هیـچ • »

« چـۆن دەبێ ؟ »

« هەر کەسە بە زمانـی تایبەتـی خـۆی دەدوێ ، لـە هیچێکیان نەگەیشتین • »

چیایەك چوە بازاڕی ئاندی کەپەنکێك بکڕێ • تەماشای کەپەنکێکی کردو لە قیاتی پرسیو مامڵەتی کرد ، بۆیان داشکاند • پاشان کابـرای ئاندی بای داوە سەر زمانی تایبەتی خۆی • چیایەکە نارەزایی پێشان دا :

« مادام من کڕیارم دەبێ بە زمانێکی وا بدوێی کە تێیبگەم • »

« کە بە نرخەکەمان ڕازی بووی وا دەکەین • »

بەڵێ ، ڕاستە • ئاندی قەت لە مامڵەت تێ نەکەوتوون •

چیایەك ئەشقی کچێکی جوان بوو • ویستی سێ ووشەی بـــۆ بنووسێ :

« تۆ ـ م ـ خۆش دەوێ » بەڵام بە نامە نەء • بەڵکو ویستی لە جێگەیەکی وا بنووسێ کە هاتوچۆی کچەی بە سەرەوە بێو نووسینەکە ببینێ ـ لەسەر شاخ ، لەسەر ڕێیەکانی ، لەسەر دیواری ماڵی نازدارێ ،

لەسەر پاندوور • نووسینەکە سانا بوو بەڵام کوڕە وای بە خەیاڵ داهات کە بە هەموو زمانەکانی داغستان بینووسێ بۆیە کەوتە گەشتو گەڕان • وای دەزانی گەشتەکەی درێژە ناکێشێ بەڵام بینی هەر گوندێك بە شێوەی تایبەتی خۆی ئەم ووشانە دەردەبڕێ :

| | |
|---|---|
| دیێ ـ مون ـ یۆکیولا | « ئافاری » |
| زاز ـ ڤون ـ کیاندا | « لیزجیان » |
| تتون ـ ئنا ـ چای‌بورا | « لەك » |
| خیو ـ ناب ـ ڕیگولرا | « دارجین » |
| مێن ـ سێنی ـ سیوێمێن | « کومیك » |
| ئوزوز ـ ئوقو ـ ککوندوزاز | « تەباساری » |
| مێ ـ تورێ ـ خۆسدەنوم | « تات » |

ئینجا بۆتلیخ ، چۆخ ، تسومادین ، تسوتین و هی دیکەش هەبوون •

دەڵێن ئەو ئاشقە ئێستاش هەر بە شاخاندا دەسووڕێتەوە • کچە لە مێژە شووی کردوەو سەری سپی بوە ، کەچی کابرا هەر خەریکی نووسینی ئەم ووشانەیە •

پیرەمێردێك لە گەنجێکی پرسی : « نازانی بە زمانی خۆتان پێی‌بڵێی : تۆم خۆش دەوێ »

گەنجەکە کچێکی لە تەنیشت بوو ، هامێزی تێ وەرهێناو وەڵامی دایەوە : « بە زمانی ئێمە ئاوها باسی خۆشەویستی دەکەن »

هەر باڵندەیەکی بچووك ، هەر گوڵێك ، هەر ڕووبارێك ، لە داغستان دەرزنە ناوێکی هەیە •

بە پێی دەستوور ، ئێمە هەشت نەتەوەی سەرەکیمان هەیە : ئاڤار ، دارجین ، کومیك ، لیزجیان ، لەك ، تات ، تەبەسارانی ، نۆگایی •

پێنج ڕۆژمێر بە پێنج زمان دەردەکەین : دوڤـاڵ ، دوسـلوك ، تلماگدیش ، گودولچـی ••• هـەموویشیان یـەك مانایـان هەیـە : « دۆستێنی » •

لە داغستاندا کتێب بە نۆ زمان چاپ دەکرێ • ئەدی داخۆ گۆرانی بە چەند زمان دەگوترێ ؟ هەر مافوورێك نەخشی تایبەتی خۆی هەیە • هەر شیرێکیش نووسینی خۆی لەسەرە •

بەڵام چۆن ئەوەندە پەنجەیە لە یەك دەستدا ڕواون ؟ ئەو هەموو زمانانە چۆن لە داغستان پەیدا بوون ؟

لێ گەڕێ با زاناکان بە شێوەی تایبەتی خۆیان لێکی بدەنەوە ، بەڵام باوکم ئەم چیرۆکەی بۆ دەگێڕامەوە :

« قاسیدی خوا بە سواری ئێستر کەوتە ناو ئەم دونیایە ، فەردەیەکی گەورەی پڕ زمانی پێ بوو هەر نەتەوەیەكو زمانێکی پێ بەخشی • چوە چینو زمانی چینی پێ بەخشین • چوە عارەبستانو زمانـی عارەبـی پـێ بەخشین • زمانی گریکی بە گریکان بەخشـی ، ڕووسی بـە ڕووسـانو فەڕەنـگی بە گەلی فەڕەنگ بەخشی • زمانەکانیان جیـا بوون • هـەندێ زمان ناسك بوونو هەندێکیتر ڕەق • هەندێ زمان تەڕو پاراو بوونو هەندێکیتر ووشكو برینگ • خەڵك هـەوەسیان بـەم دیاریە هـاتو یەکسەر بە زمانی ئادەمانە کەوتنە گفتوگۆ • هەر کەسە بە زمانی تایبەتی خۆی • وای لێهات بە خێرا زمان خەلك باشتر تێك بگەنو هەر گەلەو باشتر لە گەلەکانی دراوسێی بگات •

بەم جۆرە قاسید بە سواری ئێستر هاتە داغستان ، تازە زمانی بە جۆرجیەکان بەخشی بوو کە پاشان شۆتا ڕوستاڤێلی داستانە بە ناوبانگەکەی پێ نووسی • هەروەها تازە زمانی بە ئۆسێتەکان بەخشی بوو کە کۆستا خێتاگورۆف پێی‌نووسیوە • ئینجا بوو بە نۆرەی ئێمە •

بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە زریان بوو لە چیاکان • بەفر لە دۆڵان تێك دەئالاو هەڵدەکشایە ئاسمان • چاو چاوی نەدەدی • نە ڕێ دیار بوو نە ئاوەدانی • تەنیا لـوورەی (بـا) لە تاریـکی دەهات • ڕنـگەی گلۆربوونەوەی بەردان دەهات • شلپو هۆڕی چوار قۆیسوەکانمـان دەهات • قاسیدی خوا ، کە سمێلی بەست بووی ، گوتی : « نەخێر بەسەر ئەم شاخانە ناکەوم ، بە تایبەتی لەم ڕۆژە تووش‌و سەختەدا •» فەردەکەی کردەوەو ئەو مشتە زمانەی تێدا مابوو بەسەر چیاکانی وەرکردو گوتی : « هەر کەسە چ زمانێکی دەوێ با بۆ خۆی ببا • » ئیدی گەڕایەوە بارەگای خودا •

(با) زمانەکانی هەڵـگرت‌و بە ناو شاخ‌و گەلیانی وەرکردن • لـەو کـاتەدا هـەموو داغستانیەکان لە ماڵەوە دەربەڕین بە ڕاکردن‌و پاڵدان چوون ئـەو بارانە زێڕینە بگرنەوە کـە هـەزار ساڵ بوو چاوەڕێیـان دەکرد • دانەی گرانبەهایان هەڵگرتەوەو کۆیان کردەوە • هەر کەسە چی کـەوتە بەر دەست بردی • بـەم جۆرە هـەر کەسـە بوو بـە خاوەنی زمانی زگماکی خـۆی • ئینجـا هـەموو ڕایانکردەوە مـاڵێ‌و چاوەڕێ بوون تا زریان بڕایەوە •

بۆ بەیانی دونیا خۆش بوو ڕۆژ بە دەرەوە بوو ، دەتگوت زریان‌و ڕەهێڵە هـەر نەبوە • تەماشای چیایان‌کرد ناوی ـ چیـا !! هـەبوو • دەیانتوانی ناوی بێنن • دەریا ناوی هـەبوو • هـەر شتێکی بینیان ناوی

خۆی هــەبوو • سەیرە ! نان ، دایك ، زنج، ئاگردان ، کوڕ ، دراوسێ گــەڵ ••• ناویان هەبوو •

هــەموو دەربەڕینە کۆڵان‌و هاواریان کرد •• چیا !! بەڵام هــەر یەکــە جۆرە دەنگێکی دایەوە • هاواریان کرد: دەریا !! دیسان هــەر یەکــە جۆرە دەنگێکی دایەوە • لــەو کاتەوە ئاڤار ، لیزجیان ، دارجین ، کومیك ، تات ، لەك ••• پەیدابوون بەڵام هێشتا هەموو بە یەکـــەوە پێیان‌دەگوترا : داغستان • بنیـــادەم لــە مـــەڕو گورگ‌و ئەسپ‌و کلۆ دابڕا ••• دەڵێن ئەگــەر زمانێك بمابایەوە بۆ ئەسپ ئەویش دەبوو بــە بنیــادەم •

بەڵام ئـــەی قاسیدی خوا ! تۆ بۆچی لـــە زریان‌و شاخەکانمان سڵەمیتەوە ؟ بۆچی کوێرانە زمانەکــانی ئێمەت بڵاو کردەوە ؟ وای چ کووکەیەکت نایەوە ! ئــەو گــەلەی کـــە بــە گیــان‌و دڵ و شێوەو دەستوورو جۆری ژیان هێندە لەیەك نزیکن ئەو زمانە جودایانە لێـــکی کردوون !

لەگــەڵ ئەمەشدا ، بەجێیە ، سوپاست دەکــەین بۆ ئەوەی کـــە هــەیە • هیچ زمانێك لە زمانێکی‌تر خراپتر یان باشتر نیە • ئەوەی‌تریش خۆمان پێکی دێنین • خۆمــان ڕێــگای بـــە یەك گەیشتنی خۆمـــان دەدۆزینەوەو دەزانین زمانی جودا لێکمان جودا ناکاتەوە بــگرە یەکمان دەخـــا •

ئینجــا تەیموور لەنــگ‌و پێخواس‌و شای ئێران پەلاماریان داین • ویستیان زمــانی خۆیانمـــان بەســەردا بسەپێنن • بەڵام کـــە قۆڵیان هەڵتەکاندین پەنجەمان هەڵنەوەرا ، کــە درەختیان ڕاوەشاندین چلەکانی نەشـــکان •

**شامیل دەیگوت : « دەبێ زمانەکەمان وەکو نیشتمانی زگمـــان بپارێزین » •**

**حـــاجی موراد دەیگوت : « ووشە وەکو کوللە وان خەســـاریان مەکـــەن ! »**

**باوکیشم دەیگوت : « کە باوك دەمرێ خانووو زەویو شیرو پاندور بۆ کورەکانی بەجێ دێلێ ، بـەلام هـەر نەوەیەك زمـان بۆ نەوەی پاش خۆی بەجێ دێلێ • ئەوەی زمانی هـەبێ خانوو دروست دەکـا ، شیر دروست دەکا ، پاندور دروست دەکاو ئاوازی پێ لێدەدا • »**

ئەی زمـانی زگماکم ! نازانم داخۆ تۆ بە من ڕازی یان نەء ؟ بەلام مـن لـە ناو تۆدا دەژیمو بـە تۆ دەپەسنم • چۆن ئاوی سازگاری کانی لە ناخی تاریکـەوە هەڵدەقوڵێتە سـەر سەوزاییو بەر هەتاو ، ووشەی زمـانی زگماکی منیش ئاوها لـە ناخی دڵمەوە دێو لـە گـەرووم هەڵدەقوڵێو لێوم دەیچرپێنێ • گوێ لە چرپەی خۆم دەگرم ، گوێ لە تۆ دەگرم ، ئەی زمانی زگماکم !

هەست بـە گرمـەی بەهێزی ڕوبارێـکی شاخاوی دەکەم کە لـە تەنگەبەرێك ڕێـگای خۆی بکاتەوە • خوڕەی ئەوم خۆش دەوێ • کـە دوو خەنجـەری ڕووت بـە یەك دەکـەون زرنـــگەیان دێ ، ئـەو زرنگەیەم خۆش دەوێ • ئەمانە هەموو لە زمانی مندا هـەن • چرپەی خۆشەویستیم خۆش دەوێ •

ئەی زمـانی زگماکم ! ناتوانم بە هـەموو کەست بناسێنم • لـــەم دەنـگێن دەوڵەمەندی ! زۆرت دەنـگ هـــەیە • زۆر زەحمـــەتە تا بێگانەیەك فێرت دەبێ بەلام کـە فێرت بوو دەزانی چـەند شیرینـــە پێت بدوێ !

بۆ نموونە ژماردن وەر بگرە لە یەکەوە تا دە چەند ئاسانە :

چۆ ، کێگۆ ، لابـگۆ ، ئونـککۆ ، چوگۆ ، ئانلگۆ ، میلـــگۆ نچیگۆ ، ئانچیگۆ • کـــه تووشی یەکێ دەبم بتوانێ بە ڕەوانی تا دە بە ئاڤاری بژمێرێ ، ئەم ژماردنە وەکـــو ئەو پیاوەتیە وایـــە کـــە پیـاو پێویستیەتی‌بۆ ئەوەی لە کەنارێـکی ڕوبارەوە بپەڕێتەوە کەنارەکەی‌ترو بەردێـکی زلیشی لەســەر شان بێ • ئەگـەر بتوانی تا دە بژمێری هەموو شتێکت پێ دەکرێ • دەتوانی مەلـــە بـکەی ••• فـــەرموو ئازایانە وەرە پێش •

ئەدی لە بارەی نەتەوەکانی دی چ بڵێم ! پیرەمێرد بە منداڵە ئاڤاران دەڵێن : سێ جـار لەســەر یەك بـە بێ گرێ‌و ڕاوەستان بڵێ : کۆدا گۆرك کڤێرك کڤا کڤا دانا • » واتە : « بۆق لە بن پرد دەقیرێنێ • » خۆی تەنیـا چوار ووشەیە بەڵام ئێمـە کـە منداڵی گوندەکەمان بووین چەند ڕۆژێ مەشقمان دەکرد بۆ ئەوەی بتوانین ئەم ڕستەیە بە دروستی‌و خێرایی بڵێینەوە •

ئەبوتالیب خۆی ئاڤاری دەزانی ، کوڕەکەی ناردە تسادا بۆ ئەوەی ئەویش فێری ئاڤاری ببێ • کـــە کوڕەکەی گـــەڕایەوە ، ئەبوتالیب لێی‌پرسی :

ــ سواری کەر بووی ؟

+ بەڵێ سواری بووم •

ــ دەزانی تا دە بژمێری ؟

+ بەڵێ دەزانم •

ــ بزانم سێ جـار لەسەر یـــەك بڵێ : «کۆدا گۆرك کڤێـــرك کڤاکڤادانا • »

کوڕەکەی گوتی : « چما تۆ وا دەزانی من ئامانجی تۆم بە تەواوی هێناوەتە جێ ؟ »

زمانی گوندە ترنجاوەکانی ناو شاخەکانمان ئەمانەن • هیچ زمانێکی دونیا ئەوەندە پیتەی نیە بایی نووسینەوەی ووشەو دەنگی زمانی ئێمە بکات • یان وەك زاناکان گۆتەنی ــ بایی ئەوە بکات کە بە ڕەمز دەنگی گەروویی و دەنگی گیرەو توند دەربڕێ • بۆیە کە ئەلفو بێمان دانا ناچار بووین هەندێ پیت بخەینە سەر پیتەکانی ڕووسی بە تایبەتی پیتە دەنگیەکان • ئەمەش هەندێکیانن : گی ، خی ، فی ، لیل •

هەر سەبارەت بەم پیتە زیادانەش کە کتێبێکی ئاڤاری دەکرێتە ڕووسی لە ئاڤاریەکە کەمتر دەردەچێ ! وەکو گوندیەك وایە کە سێ مانگی تەواو وەك موسلمانان بە ڕۆژوو بوو بێ •

یەکێك لە شامیلی پرسی : « بۆچی ئەوەندە نەتەوە زۆرە لە داغستاندا هەن ؟ »

« بۆ ئەوەی لە تەنگانەدا بچنە هانای یەك ، بۆ ئەوەی کە یەکێ گۆرانی گوت ئەوانەی دی بۆی بگێڕنەوە • »

ئێستا ، پرسیارم لێدەکەن : « باشە ، وەزع چۆنە ؟ ئایا بە هەموو لایەك چوونەتە هانای تاکە کەسێکەوە ؟ »

« بەڵێ ، هیچ تاقە کەسێك لاتەریك نەوەستاوە • »

« ئەدی گۆرانی بە کۆمەڵ گوتراوە ؟ »

« بەڵێ ، نیشتمانەکەمان یەکە • زۆر ئاواز هەن بەڵام یەك گۆرانی پێك دێنن • زۆر زمانی جودا هەن بەڵام یەك دڵ هەیە •

دەستکەوتە پیرۆزەکانی هەموو خەڵك لەناو یەك دەستکەوتی گـەورەدا تواوەتەوە • • » •

« بەڵام دیسان نەتەوەکان جیاوازیان هەیە ، باشە ئەم جیـاوازیە چیـه ؟ »

« وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە زۆر زەحمەتە • »

لـە بارەی نەتەوەکانمانەوە دەڵێن : « هەندێك بۆ جەنـگان لـە دایك بوون ، هەندێـکی‌تر بۆ چـەك دروست کردن ، هەندێکی تر بۆ مـەڕ لەوەڕاندن ، هەندێکی‌تر بۆ زەوی کێـلان ، هەندێـکی‌تر بۆ باخ پەروەردە کردن • بەڵام ئەمە قسەی قۆڕە • هـەر گەلێك جەنـگاوەری خۆی ، شوانی خۆی ، ئاسنگری خۆی ، باخچەوانی خۆی هەیە • هەر یەکـە پاڵەوانی خۆی ، گۆرانیبێژی خۆی ، وەستای خۆی هەیە •

ئاڤارەکان : شامیل‌و حـاجی مورادی پیرە جەنـگاوەر ، هـەمزەو مەحموودی شاعیر ، مەحەچ‌و خزرۆڤی شۆڕشگێڕ ، محەمەدحاجیێف‌و سعدوالیڤی قارەمانی شەڕی نیشتمانی •

دارجین : باتیرای ، بەگەتیریێف ، ئەحمـەد مونـگی ، ڕەبەدان نورۆف ، کەراکەرایێف •

لیزجیان : سلێمان ، ئەمین ، تاهیر ، ئاگاسێیف ئەمیرۆف •

کومیك : ئیرچی کازاك ، عەلیم پاشا ، ئوللوبی ، سولتان سەعید ، زەینولعابید ، باتیرموزایێف ، نوخای •

لەك : هارون سعیدۆف ، سەعید گـابێف ، ئەفەندی کـاپاییف ، سورخای ـ ئێ ، ئەبوتالیبی برادەریشم •

لـه زۆر نەتەوەو ناو تەنیـا ناوی ئەوانەم هێنا کە یەکەم جـار بە مێشکم داهـاتن • لای ئێمـەو لای نەتەوەکـانی دی وێنـەیان زۆرە • ناوی بەرزیش زۆر هـەن • هـەیانە پیرە جەنـگاوەرە ، شـاعیرە ، پیشەگەرە ، هەیشیانە پاڵەوانی ئەم زەمانەیە •

دەرهەق هەندێکیان دەڵێن : سەرکێشن ، دەرهـەق هەندێـکیتر دەڵێن : گێلن ، هەندێـکیتر :دزن ، هیتر : ساختەچین • بەڵام بـە لای منـەوە ئەمـە هەمووی درۆیە • لە هـەموو نەتەوەیەك پیـاوی کورتو درێژ ، کۆكو پووخەڵە هـەن • دزو دووزمانیش هەن ؛ بەڵام ئەمـانە درکو داڵن ، بەشەر نین •

برادەرێکم دەیگوت : دەتوانم پێشەکی نەتەوەی هەر کەسێ بزانم •
ــ چـۆن ؟

ــ ئاسانە • نەتەوە هـەیە لـە داغستان (ناوی ناهێنین) ڕۆڵەکـانی هـەر کـە گەیشتنە مەحەچ قـەڵا خێرا دەچنـە ڕێستۆرانو لـە شوێنی وا دەگەڕێن کـە کچی جوانی لێ بێ • کەسێ کەسیان دەگـەنە یـەك دەیکەنە کۆڕی ڕابواردن•نەتەوەیتر هەیە (ناوی ناهێنین) ڕۆڵەکانی هەر خێرا ڕادەکـەن بۆ سینەماو شانۆو ئاهەنگی مۆسیقا • کـە سێ کـەسیان دەگـەنە یەك دەیکەنە ئۆرکسترا ، کـە بوون بـە پێنج دەیـکەنە تیپی سەماو هەڵپەڕکێو گۆرانی • هەندێکیتر دەچنە کتێبخانەکانو دەیانەوێ لـە ئامۆژگـا بخوێننو نامـەی دکتۆرا پێشکەش بـکەن • کەسێ کەسیان دەگەنەیەك دەبێتە لیژنەی زانایانو کـە بوون بە پێنج کەس دەبێتە کۆڕی زانیـاری • هەندێکیتر (ناویان ناهێنین) تەنیـا بیر لـە ترومبێل کڕین دەکەنەوەو دەیانەوێ ببن بـە شوفێرو لـە ناو ترومبێلان بـگەڕێن • کـە سێ کە سیان دەگـەنەیەك دەبێتە ئێستگەی ترومبێلو کـە بوون بـە پێنج

کەس دەیکەنە گەراجی هاتو چۆ ۰ هەندێکی‌تر وەرشە ، یان دوکان، یان چێشتخانە یان کۆشك پەسند دەکەن ۰ لە هەر کوێ سێ کەسیان بگەنە یەك دەبێتە دوکانی بازرگانی‌و کە بوون بە پێنج کەس دەبێتە گەڕەکی پیشەسازی ۰

بەلاّم هەر بۆ گالتە ئەم قسەیە دەکەین ۰ ئاخۆ هیچ نەتەوە هەیە پیاوەکانی کچی جوانیان خۆش نەوێ‌و حەز نەکەن بچنە ڕێستۆران ۰ هەر نەتەوەیەك شانۆی خۆی‌هەیەو شایی خۆی هەیەو گۆرانی خۆی هەیە ۰۰۰ تیپێکی‌هاوبەشمان هەیە بۆ هەموو نەتەوەکان : « لیزجینکا » ۰ لە هەموو نەتەوەیەك هی وا هەیە حەزی لە تڕومبێلی فۆلگاو کارگەو دوکانی بازرگانیە ۰ جارێکیان ئەبوتالیب باسی نەخۆشیەکی دەکرد کە پێشتر کەس لە داغستان نەیبیستبوو ، ئەویش نەخۆشی سەرخۆشیە۰ئەبوتالیب دەیگوت : «وەختێ خۆی یەك سەرخۆش لە گوندەکەمان هەبوو ، ناوی دا بوو ، کەس نەبوو نەیناسێ ، کەچی ئێستا تەنیا یەك تاکە کەس لە گوندەکەمان هەیە کە سەرخۆش نیە ۰ خەڵك پێیان‌سەیرەو لە دورەوە دێن‌و وەکو عاجباتی تەماشای دەکەن ۰

ئەبوتالیب زۆر چیرۆکی وای دەگێڕایەوە بەلاّم دەترسم ئەگەر بە بەر چیرۆکەکانی دا بچین خۆمان لە بیر بکەین‌و بە تەواوی لە باسەکەمان بچینە دەرەوە ۰

باسی ئەم نیشانەیەمان دەکرد کە نەتەوەکانی داغستان لێك جودا دەکاتەوە ۰ ئاخۆ دەبێ ئەم نیشانەیەجل‌وبەرگ بێ ؟ تەپڵە بێ ؟ یان جۆری تەپڵە لەسەر نان بێ ؟ بەلاّم ئێستا هەموو کەس چاکەت‌و کراس لەبەر دەکات‌و قۆندرە لە پێ دەکات‌و تەپڵە لەسەر دەنێ ۰ نەخێر ئەگەر یەك شت ما بێ نەتەوەیەك لە نەتەوەیەکی دی جودا بکاتەوە ،

زمـانه • سـەیر ئەوەیە ئەگـەر یەکێـکی لیزجی یان تات یان ئافــار یان دارجین بـە ڕووسی بدوێ یەکسەر لـە نەبرەی دەنـگ‌و شێواندنی ئەکسێنتی ڕووسیەکە دەتوانی کومێك لـە لەك‌و لیزجین لە کومێك جودا بکەیتەوە • بۆ نموونە هەر ووشەیەك سەرەتاکەی (س) بێ ، ئافار (ئ‌ی)ی بۆ زیاد دەکەن ، دەیکە نە (ئیس) • لە باتی (ستەمبۆل ـ بە ڕووسی ) دەڵێن (ئیستەمبۆل) ، لـە باتی (ستکان) دەڵێن (ئیستیکان) ، لە باتی (ستالسکی) دەڵێن (ئیستالسکی) •

ڕۆژێـــکیان باسی زمانەکانمان دەکرا ، ئەبوتالیب لــەوێ بوو • کابرایەك جیـاوازی شـێوەی دەربڕینی زمانەکــانی پێشان دەداو دەولاسکەی دەکردنەوە • ئەبوتالیب گوێی لێ‌گرت‌و پاشان قسەی پێ بڕی‌و گوتی :

« وا چاکـە بێ دەنگ بی ، زۆرت گوت ، ئێستا نۆرەی منە • نابێ هەلەی تاکـە کەسێك بدەیتــە پاڵ هەموو گەل ، دارستان بە درەختێك و بـە سێ درەخت‌و بـە سـەد درەختیش نابێ • مەسەلەی زمانەکــانمان مەسەلەیەکی زۆر سەخت‌و ئاڵۆزە • وەکو گرێیەك وایە لە پەتێکی تەڕ درا بێ • کاتی خۆی وایان دەزانی ئاسانترین ڕێـگا بۆ لە تەنـگانە دەرچوون ئەوەیە وا پێشان بدەی هیچ تەنـگانە لــە گۆڕێ نیە • بەلام گرفتــەکە هــەر دەمێنێ • لـە سەردەمی دێرین هیچ شتێ هێنـدەی جیـاوازی نەتەوایەتی گەلەکانی تێك بەر نەدەداو شیری پێ‌لێك نەدەسوون •

لە یادمــە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەگەری لە مەحــەج قەلا بەسترا • سی‌و هەشت پەیامنێر کـە لـە مۆسکۆ کاریان دەکردو نوێنەری بیست‌و نۆ دەوڵەت بوون هاتنــە داغستان • یەکـــەم جـــار بــە ناو گوندە شاخاویەکاندا گەڕان‌و قسەیان لەگەڵ ئافرەت‌و پیاوان کرد • ئینجا لــە

کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەگەری کۆبوونەوە • کامیرا چرتەی هات ، فیدیۆ فڕەی هـات ، پەیامنێرەکان پێنووسیان تیژ کردو کاغـەزی خـاوێنیان دەرهێنـا •

هەموومان لـە دەوری مێزێـکی گەورە دانیشتین‌و لەبەر ئـەوەی ئەبوتالیب لـە هەموومان پیرتر بوو ڕومـان لێ‌نا کۆنگرەکە بکاتەوە •

دەستی پێ کرد : « خوشکینە ، براینە ، هاوڕێینە ! » پێمان گوتبوو ئەم ووشـانە بۆ سـەرەتای ووتارەکەی لەبارن ، پاشان لە خۆوە دەستی بە قسە کرد ــ « با یەکتر بناسین • ئەمە ماڵمانە • ئەمـەش خۆمـانین • ئەمانەش بەناوبانگترین شاعیرمانن (پەنجەی بۆ وێنەکانی سـەر دیوار درێژ کرد • باتیرای ، کازاك، مەحموود ، سلێمان ، هەمزە ، ئەفەندی ، چاویان بڕیبوە میوانان • •

ئەبوتالیب لـە بارەی هـەر یەکێکەوە هەندێ قسەی کرد : کێیە ؟ لـە چ نەتەوەیەکـە ؟ بە چ زمانێك نووسیویـە ؟ چۆن ژیاوە ؟ بـە چ ناوبانگی پەیدا کردوە ؟ کـە گەیشتە وێنـەی خۆی هیچ خـۆی تێك نـەدا :

« ئەمەیش خـۆم • بەڵام تـکایە وا تێ مەگـەن لەسـەر دیوار هاتوومەتە خوارێ بۆ سـەر مێز ، لێرە ، لەسـەر ئەم مێزەوە چوومـەتە سـەر دیوار • •

پاشان ئەو شاعیرانەی لەوێ ، لـە دەوری مێزەکە دانیشتبوون بـە میوانەکانی ناساندن • گوتی :

« لەوانەیە هەندێکیان شوێنێ لەسـەر ئەم دیوارە دابگرن • ئەحمەد خـان ئەبووبەکرتان پێشکەش دەکەم : ئاسنگری کوباچی‌و شـاعیری میللی داغستانە •

فازو مووسـای ژنو مێرد : دوو نووسەرن ، دوو ڕۆمانووسن ، دوو شاعیرن ، دوو شانۆگەرینووسن لە یەك خێزاندا • هەندێ جار بە دوو قۆڵی دەنووسن و هەندێ جار هەر کەسە بە تەنێ •

موتەلیب میتارۆف : زاوای گـەلی ئاڤارە ، شاعیرێکی تەبەسارانیە •

شێخ ئەمیر مورادۆف : (کۆتری ئاشتی) شاعیرێکی لیزجیــە ، هەمیشە لەبارەی کۆترە باریکەوە دەنووسێ •

زامدین : ی گاڵتەجارمان ، مارك توین/ی داغستانەو لـە هەمـان کاتدا لێیرسلاوی (لیفۆند)ە •

ئەنوەر : شاعیری میللی داغستــانە ، ســەرنووسەری پێنــج ڕۆژمێری ئەدەبیە •

ترۆنۆف : نووسەرێکی ڕووسیەو لە داغستان دەژی •

خزجبل ئەخشالومۆف : نووسەرێکی تاتە ، بە زمانی خۆی و بـە ڕووسیش دەنووسێ •

ئەبوتالیب لە پێشــکەش کردن بەردەوام بووو ناوی (بـەدەوی ، سلێمان ، ساشا گراچ ، ئیبراهیم ، ئەلیرزا ، مەجید ، ئاشوگ ،ڕوتولسگی) ی هێنا • نووسەری بڵاوکراوە ئەدەبیەکانیشی بە میوانەکان ناساند •

ئینجا گوتی : «دەستووری خانەخــوێتی ڕێمان نادا ناوی میــوانان بپرسین • »

هەموو میوانەکان بـە ڕیز هەستانەوەو ناوی خۆیان و وولاتەکەیان و ڕۆژنامەکەیان پێشکەش کرد •

ئینجــا بوو بە پرسیارو وەڵام ـ کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەگــەری ئاسـایی بوو •

**پرسیار :**

ئێوه کــه ئەوەندە زمانەتان هــەیه ، ئەوەندە گەلەن ـ کە بە ڕاستی بورجی بابلە ـ چۆن لەیەك دەگــەن ؟

**ئەبوتالیب :**

ئەو زمانانەی پێیان دەدوێین جودان ، بەڵام زمانەکانی ناو زارمــان یــەك شتن • ( دەستی خستە سەر دڵی ) ئەمەش باش تێدەگا • (دەستی دا گوێچکەکانی) بەڵام ئەمانە نەء •

**پرسیار :**

من پەیامنێری ڕۆژنامەیەکی بولــگاویم • تــکایە پێمان بڵێ هیــچ پەیوەندی وا لە نێو زمانەکانی داغستاندا هەیە ، وەك ئەوەی بڵێین لـــە نێوان زمــانی بولــگاریو ڕووسیدا هەیە ؟

**ئەبوتالیب :**

زمــانی بولــگاری و زمــانی ڕووسی جمــکن • بەڵام زمانەکــانی ئێمە بنعامیش نین • هیچ ووشەی هاوبەشیان تێدا نیە • نووسەرەکانمان تاقمی تایبەتیان تێــدا هــەیە ؛ بەڵام زمانەکانمان ـ نەء • هــەر زمانێکم ســەربەخۆیە •

**پرسیار :**

زمانەکانتان پەیوەندیان بــە کــام زمــانی ترەوە هەیە ـ سەر بــە کام کۆمەڵە زمانێکن ؟

**ئەبوتالیب :**

تات دەڵێن : ئێمە دەتوانین لە تاجیکی بــگەینو حافز بخوێنینەوە • بەڵام لێیان‌دەپرسم : ئەگــەر ئێوە لــە زمانی سەعدیو خەیام دەگــەن ، ئەدی بۆچی وەکو ئەوان نانووسن ؟

له ڕۆژگاری کۆندا کە دەچوونە داخوازی ، ئەگەر بیانگوتبایە زاوا زمانی کومیکی دەزانێ ، ئەوە مەتحێکی زۆر بوو ـ مانای ئەوە بوو کە کابرا زۆر دەزانێو هەرگیز تێناکەوێ • ڕاستە ، ئەگەر زمانی کومیکی بزانی ، دەتوانی لە تورکیو ئازەربێجانیو تەتەریو بەلکاریو کازاخیو ئۆزبەکیو کیرگیزیو باشکیریو زۆر زمانی پەیدەندیداریتریش بگەی • دەتوانی حیکمەتو کایسین کۆلیفو موستای کەریم بە زمانی ڕەسەنی خۆیان بخوێنیتەوە • بەلام زمانی من ـ بێجگە لە لەکایەتی خۆمان تەنیا ئەو تۆژەوەرانە دەیزانن کە چەند ساڵ خۆیان پێوە خەریك کردوەو نامەی دکتۆرایان لێ وەرگرتوە • لەکێك دوای ئەوەی سەراپای دونیا گەرا ، لە ئەسیوپیا گیرسایەوەو لەوێ بوو بە وەزیر ••• کابرا گوتوویە تووشی هیچ زمانێ نەبوە وەکو زمانی لەکی خۆمان وا بێ •

**عومەر حاجی :**

زمانی ئاڤاری ئێمەش وەکو هیچ زمانێکیدی نیە •

**ئەبوتالیب :**

هیچ زمانێك نیە لە زمانی دارجینی یان لیزجیانی یان تەبەسارانی بکات •

**پرسیار :**

تۆ چۆن توانیوتە ئەم هەموو زمانە فێر بیت ؟

**ئەبوتالیب :**

کاتی خۆی زۆر گەشتم بە داغستاندا دەکرد • من نانم دەویستو خەڵك گۆرانی • کە بچیتە گوندێكو زمانیان نەزانی هەتا سەگەکانیشیان دڕترن • پێویستی هانی دام زمانەکانی داغستان فێر بم •

**پرسیار :**

ناتوانی نەختێ زیاتر باسی ئەو نیشانانە بکەی کە پەیوەندیو جیاوازی زمانەکانتان پێشان دەدەن ؟ چۆن وا رێك کەوتوە ئەم وولاتە بچووکە ئەوەندە زمانەی هەیە ؟

**ئەبوتالیب :**

زۆر کتێب لە بارەی ئەم پەیوەندیو جیاوازیانەوە نووسراوە • من تۆژەوەرنیم ؛ بەلاّم پێت دەلێم چۆنی تێدەگەم • تۆ دەمانبینی لێرە دانیشتووین • هەندێکمان لە شاخان لە دایك بووینو پێگەیشتین ، هەندێکیش لە دەشت • هەندێك لە ناوچەی ساردو هەندێك لە ناوچەی گەرم • هەندێك لە دەم ڕووبارو هەندێك لە قەراغ دەریا • هەندێك لەو شوێنانەی گایان لێیە بەلاّم زەویان لێ نیە • هەندێك لەو شوێنانە لە دایك بوون کە ئاگریان لێیەبەلاّم ئاویان لێ نیە • هەندێکی تر لەو شوێنانەی کە ئاویان لێیە بەلاّم ئاگریان لێ نیە •

لێرە گۆشتو لەو لای گەنمو لەولاتر تەڕە هەیە • ئەو شوێنەی پەنیری لێ هەلّبگیرێ مشکی لێ پەیدا دەبێ ، بەلاّم ئەو شوێنەی مەڕی لێ بەخێو بکرێ گورگی دەبێ • سەرباری ئەمەش مێژووو شەڕو جوگرافیاو دراوسێی باشقە باشقەو سروشت هەن •

ووشەی «سروشت» ، بەلای ئێمەوە دوو مانای هەیە • لە لایەکەوە مانای : زەوی ، گیا ، درەخت ، شاخ ، دەدات • لەلایەکی دیشەوە سروشتی بنیادەمە • سروشتی جۆر بە جۆر لە جێگای جۆراوجۆرەوە ناوو دەستوورو ڕەوشتی جۆراو جۆری دروست کردوە •

لە هەر شوێنێ بە جۆرێ تەپلە لەسەر دەنێنو بە جۆرێ جلو بەرگ هەلّدەبڕنو بە جۆرێ خانوو دروست دەکەن •

لەیلایەی جۆر بە جۆر هەن • مەحموود گورانی بە پاندووری دوو ژێ دەچڕی • پاندووری نێرچی کازاك سێ ژێی هەیە • سلێمان ستالسکی لیزجیانی (تارا)ی لێ دەدا • ئامێر هەیە ژێیەکانی ڕیخۆڵەی بزنەو ئامێر هەیە ژێیەکانی تێلە •

زۆر گەل هەن ، بەڵام هەر یەکە ڕەوشتی تایبەتی خۆی هەیە • وەکو هەموو شوێنێکی‌تر : منداڵ لە دایك دەبێ • گەل هەیە ئاهەنگی ناونانی بۆ دەکەن ، گەل هەیە سوونەتی دەکەن ، گەل هەیە بە ئاسانی بڕوانامەی لە دایك بوونی بۆ دەردێنن •

کوڕە گەورە دەبێ‌و دیسان ڕەوشتی‌تر هەیە • ژنی بۆ داخوازی دەکرێ ـ داخوازی‌کردنیش ڕەوشتی خۆی هەیە • ژن دێنێ‌و زەماوەند دەکا ، ئەویش ڕەوشتی خۆی هەیە • ئەگەر باسی هەموو جۆرە زەماوەندەکانی داغستان بکەم ڕۆژێکی ڕەبەق‌و زیاتریش دەخایەنێ • ئەوەی حەز دەکا کتێبێك هەیە پێشکەشی دەکەین ناوی «ڕەوشتی گەلەکانی داغستان» ، کە چوونەوە بیخوێننەوە •

**پرسیار :**

ڕەوشتتان جودایە ، زمانتان جودایە ، باشە چ شتێ بەیەکەوەم دەتانبەستێتەوە ؟

**ئەبوتالیب :** داغستان •

**پرسیار :**

داغستان ••• دەنا تۆ بۆت باس کردین ئەگەر ناوەکە وەربگێڕدرێ مانای « ووڵاتی شاخان » دەدات • مانای وایە داغستان ناوی ناوچەیەکە ؟

**ئەبوتالیب :**

نەك هەر ناوچەیەکە بگرە نیشتمانە ، کۆمارە • ووشەکە بۆ

ئەوانەی لە شاخان دەژین‌و ئەوانەی لە دۆڵان دەژین یەك شتە • نەخێر (داغستان) تەنیا مانایەكی جوگرافی نیە • ڕوخساری خۆی هەیە ، ئارەزووی خۆی هەیە ، خەونی خۆی هەیە • لە مێژووو چارەنووس‌و خەم‌و شادی هاوبەشین • لەو بڕوایە دای ئازاری پەنجەیەك كار لە پەنجەكانی دی ناكات ؟ هەندێ ووشەمان هەیە لە هەموو زمانەكانماندا هەیە وەكو ، ئۆكتۆبەر ، لینین ، ڕوسیا • پێویست ناكا ئەم ووشانە وەربگێڕینە سەر هەموو زمانەكان • هەموو كەس تێیان دەگا • ئێمەی نووسەر سەرمان بۆ پیلەكەی گەرم دەخورێ بەڵام لە بارەی ئەم ووشانەوە جیاوازیمان نیە • تێ گەیشتن ؟

**پرسیار :**

بەڵێ حاڵی بووین ، بەڵام دەمەوێ پرسیارێكی‌ترت لێ‌بكەم • ئەمڕۆ شیعرێكی (عادل عەلیێف)م لە ڕۆژنامەیەك خوێندەوە • «ئەناتۆلی زایاتس» كردبووی بە ڕووسی • نووسرابوو شیعرەكە لە داغستانیەوە وەرگێڕدراوە • ئاخۆ ئەمە چ زمانێكە ؟

**ئەبوتالیب :**

منیش نازانم داخۆ ئەمە چ زمانێكە • دوێنێ عادل عەلیێفم بینی‌و قسەم لەگەڵ كرد ، ئەو حەلە ئافار بوو ، نازانم چی بەسەر هاتوە • بەڵام خەم ناكا • هەڵەیەك بوەو ڕووی داوە •

**پرسیار :**

لە ئەمریكایش ئێمە زۆر نەتەوەو زۆر زمانمان هەیە ، بەڵام زمانی ڕەسمی‌و سەرەكیمان ئینگلیزیە • لە هەموو كاروبارێك‌و بۆ هەموو دوكمەنتێك بە كار دێ • ئەدی ئێوە ؟ زمانی سەرەكیتان كامەیە ؟

**ئەبوتالیب :**

زمـــانی ســـەرەکی هـــەر کەسێك زمانی دایکیەتی • ئەوەی چیای خـۆی خۆش نەوێ ناتوانێ دەشتی بێـگانانێ خۆش بوێ • بەختیاریەك لـە ماڵەوە چنگت نەکەوێ لەســەر شەقام دەستت ناکەوێ • ئەوەی تف لە دایك خۆی بـکا تف لە هــەموو ئافرەتێکی‌تر دەکـا • کـە بتەوێ مشتووی شمشێر بـگری یان دەستی برادەرێك بگوشی هەموو پەنجەکانی دەستت گەرەکـە •

**پرسیار :**

شیعرێکی (موتەلیب میتارۆف)م خوێندۆتەوە • لە شیعرەکەدا دەڵێ گوایە خۆی نە ئافارە نە تاتە نە تەبەسارانیە • بەڵـکو داغستانیە • ئـەدی بەمـــە دەڵێی‌چی ؟

**ئەبوتالیب :**

(چاوی لە میتارۆف گێڕا) میتارۆف گوێت لێ بێ • لە مێژە زانیومە تۆ نە ئافاری نە کومیکی نە تاتی نــە نۆگایی نە لیزجیانی ؟ بــەڵام تازە بزانــم تۆ تەبەسارانی نی • کــەوا بوو ، تۆ چی ؟ بۆی هـــەیە بەیانی بنووسی کــە موتەلیب میتارۆفیش نی • ئەوەتا من • ئەبوتالیب غەفورۆفم • یەکــەم جار لەکم ، دووەم جــار داغستانیــم ، سێیەم جــار شاعیرێـکی ســۆڤێتیم • یان دەتوانین بە جۆرێـکی‌تری بڵێین : یەکــەم شاعیرێــکی سۆڤێتیم ، دووەم لە کۆماری داغستان دەژیم ، سێیەم‌نەتەوەم لەکەو بـــە زمانی لەکی دەنووسم • ئەمسانە قەت لێك جـودا نابنەوە • پارچـەیەکی بنچینەیین لــە خـــۆم • شتی زۆر بەنرخ‌و بەهـادارن • لــەم سیانە دەستبەرداری هیچیان نابم • لــە پێناوی ئەوانەوە مل بە ئاگرەوە دەنێم •

پرسیار :

«پەیامنێری کۆماری دیموکراتی ئەلمانیا» : کتێبێکی هاوڕێ عەلیکیشێف/ی کاندیدای زانستی پزیشکم لێرە دی بە ناوی : « تەمەندرێژی لە داغستاندا » لەم کتێبەدا باسی ئەو کەسانە دەکا کە سەد ساڵ زیاتر دەژینو دەڵێ لە بارەی تەمەندرێژیەوە ، داغستان لە هەموو یەکێتی سۆڤیێت بە پلەی یەکەم دێ . ئینجا دەڵێ نەتەوەکان وا بەربەرە لێك نزیك دەبنەوەو وای لێ ڕەچاو دەکرێ یەك نەتەوەی تایبەتی لە داغستان بێتە کایەوە . واتە پاش چەند ساڵێکی دی ئاڤارو دارجینو نۆگای خۆیان بە داغستانی دادەنێنو ڕەنگە لە پەساپۆرتیشدا هەر وایان بۆ بنووسرێ . هەروەها ووتارێکی زانایەکانم خوێندەوە دەڵێ گوایە ئەدەبەکەتان خەریکە سنووری نەتەوایەتی دەڕووخێنێو دەبێ بە ئەدەبێکی گشتی داغستانی . مادام کاندێدو دکتۆرەکان مەسەلەی وا لە کتێبو ووتاران هەڵایسێنن ، دیارە مەسەلەکە زۆر گرنگو بەکارە ؟

ئەبوتالیب :

منیش هاوڕێ عەلیکیشێف دەناسم . خەڵکی قەزاکەمانە . لەگەڵ پیرەمێردان دەدوێو گوێ لە باسی ژیانیان ڕادەگرێ . بەڵام زۆر لەوە بە گومانم کە هیچ پیرەمێردێکی بە ڕێزیچایی باسی ئەوەی بۆ کرد بێ کە هەموو نەتەوەکان لە ناو یەك نەتەوەدا دەتوێنەوە . ئەمەی لە خەیاڵی خۆیەوە دروست کردوە . زۆر کەم (میچورین)ی وام دیوە لە ئەزموونگا هەوڵ بدا وەك (کەروێشك) منداڵی زۆڵ چاك بکاو زمانیان لێك بداو بیانخاتە بەر تاقی کردنەوە .

**ویستیان حەفت شانۆی نەتەوایەتی داغستان بکەن بە یەك شانۆ . ویستیان پێنج ڕۆژنامەی نەتەوایەتی داغستان بکەن به یەك تاکە**

**ڕۆژنامە . ویستیان زۆر لـکی یەکێتی نووسەرانمان بکەن بە یـەك ، بەڵام ئەمە وەکو ئەوە وایە کە درەختێکی پڕ لكو پۆپ بکەیتە یەك تاکـــە کاریتـــە .**

**پرسیار :**

من نوێنـەری ڕۆژنامـەیەکی هیندیم ئێمـەش لە هنـدستان زۆر زمانمان هـەیە ـ هیندی ، ئوردوو ، بەنـگالی ... هەندێ نەتەوەخواز ویستیان زمانەکەیان ببێ بە زمانی ڕەسمی سـەراپای هینـد . بوو بـە مشتومڕو تەنانەت شەڕی خوێناویش . شتی وا لای ئێوە ڕوو نادات ؟

**ئەبوتالیب :**

جارێکیان مشتو مڕێـکی وا کـــەوتە بەینی کوڕێـکی ئاڤاریو کوڕێـکی کومیکی کـە هەردووکیان سواری یەك کەر ببوون . کوڕە ئاڤارەکە هـەر هاواری دەکرد : « خیا ، خیا ، خیـاما !» کومیکەکەش هـەر هاواری دەکرد : «ئێش ، ئێش ، ئێشێك ! » هەردوو وشەکە مانای (کەر) دەگەیەنن ، بەڵام ئەو دوو کوڕە لەسەر ئـەم ووشەیە بەشـــەڕ هاتنو لـە ئەنجامدا هەردووکیان گلانو بێ «خیاما» و «ئێشێك» مانەوە . بەلای منەوە مشتو مڕی وا ، کارێـکی منداڵانەیە . زمانەکانمان گورگ نین ، زمانەکانمان لەگـەڵ یەك بەشەڕ نایـەن . قسـەیەکی نەستەقمان هـەیە ، دەڵێ : « گێلیماڵەوە جنێو بە دەرو جیرانان دەدا ، گێل گوند جنێو بە گوندە دراوسێکانی دی دەدا ، گێلی ووڵات جنێو بە ووڵاتەکانی دی دەدا . »

ئەوەی بە خراپە باسی زمانەکانی دی بـکا ، ئێمە بە پیاوی دانانێین .

**پرسیار :**

کەواتە ، بە قسەی تۆ ، ئێـوە لـەم بارەیەوە هیچ مشتومڕو تێك نەگەیشتنتان نەبوە ؟

**ئەبوتالیب :**

مشتو مڕ بوە ، بەڵام هیچ کەس بە دڵ پەلاماری زمانەکانمان یان ناوەکانمانی نەداوە . با هەر کەسە چ زمانێکی پێ خۆشە بەو زمانە بنووسێو بخوێنێتەوەو گۆرانی بڵێو بدوێ . دەتوانی پیلەکە لەسەر ئەوە بکەی کە ئەم شتە یان ئەو شتە چاکە یان خراپە ، ڕاستە یان چەوتە ، جوانە یان ناشیرینە ، بەڵام چۆن زمانێك یان سەراپای نەتەوەیەك یان گەلێك چەوت یان خراپ یان دزێو دەبێ ؟ ئەگەر ئەم باسە پیلەکەیشی لەسەر کرا بێ نە کەس بردوویەوە ، نە کەس دۆڕاندوویە .

**پرسیار :**

ئەمە وا ، ئاخۆ باشتر نەبوو ئەگەر داغستان یەك نەتەوەو یەك زمانی تێدا بوایە ؟

**ئەبوتالیب :**

زۆر کەس دەڵێ : « ئاخ ئەگەر زمانمان یەك دەبوو !! » لە کاتی پەلامارێکی جورجیا ( ڕاژبەندین )ە شەل بە عیراقلی پاشای گوت: «بۆیە ئەم هەموو گرفتەمان بەسەر هات چونکە زمانی یەکترمان نەدەزانی . » حاجی موراد لە (خایداك ـ تەبەساران)وە بۆ ئیمامی نووسی : « ئێمە تێك نەگەیشتین . »

بێگومان ، ئەگەر خەڵك لەگەڵ یەکەم ووشە لە یەك گەیشتبان باشتر بوو ، زۆر شت ئاسانتر دەبوو ، بە ئەرکێکی کەمتر دەسکەوتێکی پترمان دەبوو . بەڵام بە لای منەوە ، خراپ نیە ئەگەر ماڵێك منداڵیان زۆر بێ . ئەو ماڵە دەبێ بایەخ بەهەموو منداڵەکان بدەن . کەم دایكو باوك هەیە پاشان پەشیمان بووبنەوە کە منداڵیان زۆر بوە .

هەندێك دەڵێن : « لە (دەربەند) دەربچی کێ پێویستی بە

زمانەکەمانە ؟ کەس ئێمان ناگات ؟ »

هەندێکی‌تر دەڵێن : « لە گەرووی (ئاراکین) ئاوا بە زمانەکەمان بە کەلکی چ دێ ؟ »

هەندێکی‌تر گلەیی دەکەن : « گۆرانیەکانمان ناگەنە دەریاش • »
بەڵام زۆر خێرا زمانی زگماکیان پشت گوێ دەخەن •

**پرسیار :** لە بارەی پشتگیریەوە دەڵێی‌چی ؟

**ئەبوتالیب :**

پشتگیری لە نێو نەیارو بێگانان پێویستە ، برا پێویستیان پێ نیە •

**پرسیار :**

بەڵام هــەر یەکــە ! برا بۆ ئەوەی لەگەڵ برای بدوێ پێویستی بە یەك زمــانە •

**ئەبوتالیب :** ئێمە ئەو زمانەمان هەیە •

**پرسیار :** کامــە ؟

**ئەبوتالیب :**

ئەوەی ئێستا بەکاری دێنین : ڕووسی • ئافارو دارجین‌و لیزجیــان‌و کومیك‌و لەك‌و تات ــ هــەموو تێی دەگەن (بەنجە بۆ وێنەی لیرمەنتۆف‌و پوشکین‌و لینین درێژ دەکات • ) بە خێرا ئەمانە ئێمــە زۆر باش لەیــەك دەگــەین •

**پرسیار :**

بەرهەمێکی «دوو بەرگی»ی ڕەسووڵ هەمزەتۆفم خوێندۆتەوە • لــە بەرگی یەکەم ، لە شیعری «زمانی زگماکم»دا بە زمــانی ئافــاری هەڵدەڵێ ؟ بەڵام لــە بەرگی دووەم لــە شیعرێکی بە هەمان ناوو نیشانەوە

به زمـانی ڕووسی هه‌ڵده‌ڵێ • ئایا ده‌توانی له یه‌ك کـاتدا سـواری دوو ئه‌سپ ببی ؟ باشه ، بڕوا به کام هه‌مزه‌تۆف بکه‌ین : ئه‌وه‌ی به‌رگی یه‌که‌م یان ئه‌وه‌ی به‌رگی دووه‌م ؟

**ئه‌بوتالیب :**

با ڕه‌سووڵ خۆی وه‌ڵامی ئه‌م پرسیاره بداته‌وه •

**ره‌سووڵ :**

منیش ده‌ڵێم پێت ناکرێ لـه یه‌ك کاتدا سواری دوو ئه‌سپ ببی ، به‌ڵام ده‌توانی دوو ئه‌سپ له گالیسکه‌یه‌ك بخـه‌یت‌و به هه‌ردووکیـان گالیسکه‌که ڕابکێشن • دوو ئه‌سپ ، واته دوو زمان ، داغستان بـه‌ره‌و پێشـه‌وه ده‌به‌ن • یه‌کێکیان زمانی ڕووسیه ، ئه‌وه‌ی‌تر زمانی خۆمـانه ـ بۆ ئاڤاره‌کان ئاڤاری‌و بۆ له‌که‌کان له‌کی • من زمانی زگماکی خـۆم خۆش ده‌وێ ، هه‌روه‌ها زمـانی زگماکی دووه‌میشم خۆش ده‌وێ کـه به سـه‌ر ئه‌م شاخانه‌و به تووله ڕێـگاکاندا بردوومیه‌ته ده‌شته هـه‌راو ، بردوومیه‌ته دونیای گه‌وره‌و فراوان‌و ده‌وڵه‌مـه‌ند • ئه‌وه‌ی زگمـاك بێ ده‌ڵێم زگماکه‌و چیترم لـه ده‌ست نایه •

**پرسیار :**

ده‌مه‌وێ شتێکی دی لـه‌م باره‌یه‌وه له ڕه‌سووڵ هه‌مزه‌تۆف بپرسم• لـه شیعره‌که‌یدا نووسیویه : «ئه‌گه‌ر له ناوچه‌وانی زمانی ئاڤاری نووسرا بێ کـه به‌یانی بمرێ حه‌ز ده‌کـه‌م من ئه‌مڕۆ دڵم بوه‌ستێ‌و یه‌کسـه‌ر بمرم • » به‌ڵام ئێوه گۆته‌یه‌کتان هه‌یه ، ده‌ڵێ : « کـه گه‌وره بێ ده‌بێ گچکه جێی بۆ چۆڵ بکا • » ئێستا زمانی ڕووسی هاتوه ئه‌دی نابێ زمانه ناوچه‌یه‌کان ڕێی بۆ چۆل بکه‌ن ؟ ئه‌دی ئه‌وه ڕه‌وشتی خۆتان‌نیه ؟ بـه گوێره‌ی گۆته‌ی خۆتان ناتوانی له یه‌ك کاتدا دوو ته‌پڵه له‌سه‌ر بنێی ، یان بۆچی دوو جگه‌ره به ده‌مته‌وه ده‌گری ؟

ڕەسووڵ :

زمـان جگەرەو تەپڵە نیـە • زمانێك دوژمنی زمانێكی‌تر نیـــە • گۆرانی گۆرانی لەناو نابات • کـە پوشکین هاتۆتە داغستان پێویست ناکا مەحموود شوێنی خۆی بە جێ بێڵێ• لیرمەنتۆف هیچ هەقی نیەجێــگەی باتیرای داگیر بـکا • ئەگـەر برادەرێکی باش دەستت بگوشێ ، دەستی تۆ لەناو دەستی ئەوا وون نابێ ، بگرە گەرمترو بە تینتر دەبێ • زمـان جگەرە نیـە ، چراوگی ژیانە • من دوو چراوگم هەیە • یەکێ لەسەر لێوی پەنجەرەی زنجی باوکمەو ڕێـگام بۆ ڕوناك دەکاتەوە ، دایکم بۆی داگیرساندووم تا ڕێـگام لەبەر بزر نەبێ • ئەگەر ئـــەم چراوگـــە بکوژێتەوە ، ژیانیشم لەگەڵ دەکوژێتەوە • ئەگـەر بە لەشیش نەمــــرم ژیانم دەبێتە یەك پارچە تاریکی • چراوگی دوەم ، نیشتمانی گەورەم ، وولاتی مەزنی ڕوسیا بۆی داگیرساندووم بۆ ئەوەی لە دونیای فراوان‌و بەر هـەڵ دا ڕێم لەبەر بزر نەبێ • ئەوە نەبێ ژیانم تاریك‌و پووچە •

ئەبوتالیب :

چۆن ئاسانترە بەرد هەڵبگری : یەك دەست‌و شانت بەکار بێنی‌یان هەردوو دەست‌و تێکڕای لەشت ؟

پرسیار :

هەر چۆن بێ ، چاییەکان ئەو زنجانە هەر بەجێ دێلن کە دایکیان چراوگیان تێدا داگیرساندوە و شۆڕ دەبنەوە پێ دەشت ، وا نیە ؟

ئەبوتالیب :

بەڵام کە دەچن زمان‌و ناویان لەگەڵ خۆیان دەبەن • تەپڵەشیان دەبەن • چراوگی لێوی پەنجەرەکانیان لەوێش هەمان شتە •

**پرسیار :**

بەڵام لـەو شوێنە تازەیە ، زۆر جار کوڕ لە نەتەوەکانی دی ژن دێنن • ئاخۆ ئەو حەلە چ زمانێك بەکار دێنن ؟ پاشان منداڵەکانیان بـە چ زمانێك دەدوێن ؟

**ئەبوتالیب :**

چیرۆکێکی کۆنمـان هەیە : کوڕێك حەزی لە کچێکی نەتەوەیەکی دی کردو ویستی بیهێنێ • بەڵام کچەکە گوتی : (مێردت پێ دەکـەم بەڵام دەبێ سەد شتم بۆ بکەی • ) گەنجەکە کەوتە بـە جێ هێنـانی مەرجەکانی کچەکە • یەکەم جار کچە داوای لێ کرد بـە شاخێـکی ڕووتو ڕکـدا هەڵبگەڕێ کـە هیچ پێگیری پێوە نەبوو • پاشان داوای لێکرد لەوێوە خـۆی فڕێ بداتـە خوارەوە • کوڕە بازی داو لاقی سەقەت بوو • کچە داوای لێکرد بـە بێ شەلین بڕوا ، بێ شـەلین ڕۆیشت • هـەموو جۆرە داوایەکی لێکرد : لـە ڕوبارێك بداتو خورجینەی تـەڕ نەبێ ، لـە بایە غارێ ئەسپ ڕابـگرێو چۆکی پێ دابدا ، کچە سێوێـکی لەسـەر سنگی خۆی داناو داوای لە کوڕە کـرد نیشانەی لێ هەڵبگرێو ئەو سێوە بپێکێ • کوڕەکە نەوەدو نۆ مـەرجی بە جێ هێنا • مایەوە یەك مـەرج • ئینجا کچە گوتی : ئێستا دایـکتو باوکتو زمانەکەت لە بیر بکە • گەنجەکـە کـە ئەمـەی بیست خـۆی هەڵدایە سـەر ئەسپەکەیو قامچی لێداو ڕۆیشت هـەتا هـەتایە نەگەڕایەوە •

**پرسیار :**

ئەمـە چیرۆکێکی زۆر خۆشە ، بەڵام لە ژیانی ڕاستەقینەدا چۆن دێتـە دی ؟

**ئەبوتالیب :**

لە ژیانی ڕاستەقینەدا ، کە کوڕو کچێك خێزان پێکەوە دەنێن زۆر ئەرك وەئەستۆ دەگرن • بەڵام هیچێکیان خورتی لەوەی دی ناکا کە زمانی خۆی لە بیر بکا • بە پێچەوانەوە هەر کەسە هەوڵ دەدا زمانی هاوسەرەکەی فێر بێ •

لە ژیانی ڕاستەقینەدا ، بە داخ‌و ڕەخنەوە تەماشای ئەو منداڵانە دەکەین کە زمانی دایك‌و باوکیان نازانن • منداڵەکان خۆیشیان گازاندە لە دایك‌و باوکیان دەکەن چۆنکە زمانی خۆیان فێر نەکردوون • بەخوا بەستەزمانن !!

لە ژیانی ڕاستەقینەدا ، ئەدەتا دەبینن ئێمە لە دیار ئێوە دانیشتووین • ئەوەتە شیعرەکانمان ، چیرۆکەکانمان ، ڕۆمانەکانمان ، کتێبەکانمان • ئەوەتەن ڕۆژنامەو گۆڤارەکانمان • بە زۆر زمان بڵاو دەکرێنەوە • ساڵ بە ساڵ تا دێ زۆر دەبن • ئەم وولاتە گەورەیە زمانەکانی ئێمەی ڕەت نەکردۆتەوە • مافی ڕەوای خۆی داونەتێ ، چەسپاندوونی ، ئەوانیش وەك ئەستێرە دەدرەوشێنەوە : « ئەستێرە ئەستێرە دەئاخێوێ • » ـ ئێمە خەڵك دەبینین‌و خەڵکیش ئێمە دەبینێ • ئەگەر وا نەبا ئێوە قەت باسی ئێمەتان نەدەبیست‌و کەیفتان بە ئێمە نەدەهات‌و ئەمڕۆ لێرە پێکەوە نەدەبووین • ئەوەیە ژیانی ڕاستەقینە •

پرسیارو وەڵام ، پرسیارو وەڵام • ئەگەر دەرفەت هەبوایە کۆنگرەکە هەتا هەتایە دەوامی دەکرد • قسە لە بارەی هەموو زمانێکی دونیاو هی هەموو ڕۆژگارێك دەکراو بنیشی نەدەهات •

ئەبوتالیب ـ ئەمەی بەلاوە شتێکی نوێ بوو ـ کە هەستی کرد زۆری درێژە پێداوە ، گوتی : «ئەم کۆنگرە ڕۆژنامەگەریە وەکو

یاری‌و گۆرانی ئێمه وایه ، کـه هه‌ندێك پرسیار ده‌که‌ن‌و هه‌ندێـکی‌تر وه‌ڵام ده‌ده‌نه‌وه ..

پرسیار تیرێکه کوێرانه ده‌هاوێژرێ ، وه‌ڵام تیرێکه نیشانه ده‌پێکێ. پرسیـار ـ وه‌ڵام . نیشانه‌ی پرسیار ـ نیشانه‌ی سـه‌رسامی . رابردوو پرسیاره ئێستا وه‌ڵامه .

داغستانی کـۆن وه‌کو پیرێژنێك وا بوو کـه له‌سـه‌ر به‌ردێك دانیشتبێ . ئه‌مـه نیشانـه‌ی پرسیار بوو . داغستانی ئه‌مڕۆ نیشانـه‌ی سه‌رسامیه . شیرێکی له کالان ده‌رهاتوه‌و قیت کراوه‌ته‌وه .

کـه شۆڕش گه‌یشته داغستان ، ئه‌وانه‌ی لێی ده‌ترسان گوتیـان هـه‌موو نه‌ته‌وه‌و زمان‌و ناوی گه‌له‌کان به‌م زوانه له‌ناو ده‌چن . (مه‌سه‌دو) ده‌بێ به (ماروسیا) و (موسا) ده‌بێ به (ڤاسیا) . گوتیان پیاو ماوه‌ی نابێ بیر له‌وه بکاته‌وه داخۆ سه‌ر به کام نه‌ته‌وه‌یه‌و خه‌ڵقی کام شوێنه ؟ هه‌موو له ژێر یه‌ك به‌ڕه ده‌خـه‌ون . جا ئه‌وه‌ی لـه هـه‌موویان به‌هێزتر بێ به‌ڕه‌که له‌سـه‌ر ئه‌وانی که ڕاده‌کێشێ‌و هه‌ره بێ‌هێزه‌که‌یان له‌به‌ر سه‌رما ده‌مێنێته‌وه .

به‌ڵام داغستان گوێی‌نه‌دانێ . حـه‌یده‌ر به‌مه‌تۆف کـه ئه‌ندامی حکوومه‌تی نه‌ته‌وایه‌تی چیاییان بوو ،کـه به ترومبێل ده‌یانبرده ده‌ره‌وه ، له‌سـه‌ر لێوی ترومبێله‌که ده‌یگوت : «قسه‌ی منیان نه‌چوه دڵ ، پاشـان ده‌بینین چ ده‌بێ ..

ده‌بینن پاشـان چ بوو . هه‌مووی له کتێب ده‌نووسرێ‌و به گۆرانی ده‌گوترێ . ئه‌وه‌ی گوێی هه‌یه با بیبیسێ ، ئه‌وه‌ی چـاوی هـه‌یه با بیخوێنێته‌وه .

چیایەك ، کە لە بەرەی هاوبەش دەترسا ، پشتی کردە داغستانو چوە تورکیا • دوای پەنجا ساڵ هاتەوە ناو شاخەکانمان بۆ ئەوەی بزانێ دونیا چۆنە داوام لێکرد پیاسەیەك بە ناو مەحەچ قەڵادا بکات کە پێشتر ناوی پۆرت پێترۆفسکی بوو • ئەم شارە پێشان ناوی قراڵێکی ڕووسی لێ بوو ، ئێستا ناوی مەحەچی شۆڕشگێڕی داغستانی لێیە • ئەوم شەقامانەم پێشان دا کە بە ناوی باتیرای‌و ئوللوبی‌و کاپێنف کراون ، بەم ناوی ڕۆڵە دڵسۆزەکانی داغستان کراون • لە گۆڕەپانی (مارین)دا ، ماوەیەکی زۆر لە پەیکەری سلێمان ستالسکی ڕاما • لە شەقامی لینین پەیکەری هەمزەی تساداسای باوکمی بینی • دیار بوو پێش ئەوەی بار بکا ناسیاری لەگەڵ باوکم هەبوو • لە ئاکادیمیای زانستی چوە لای زاناکان • لە ئامۆژگەی تۆژینەوەی زمانو ئەدەبو مێژوو لەگەڵ خەڵکەکە دوا • چوە موزەخانەی هونەرو مێژووی داغستان • چوە زانکۆ کە کوڕو کچی شاخان لە یازدە کۆلیجی جۆر بە جۆردا دەخوێنن • بۆ تیواریێ چووینە شانۆی میری ئافاری‌و لەوێ ( ئەنخیل مارین )ی حاجی زالۆفمان دی • کە ئافارێك لە بارەی کچە ئافارێکەوە نووسیویە • کە فاتیمە خزرۆیفای هونەرمەندی میللی یەکێتی سۆفێت گۆرانیەکی کۆنی لەسەر شانۆ چڕی ، میوانەکەم چاوی پڕ ئاو بوو •

لە گۆڕەپانی گەورەدا ، ماوەیەکی زۆر لە دیار پەیکەری لینین ڕاوەستا ، ئینجا گوتی :

« ئەرێ ئەوە خەونە دەیبینم ؟ »

« کە چوویتەوە تورکیا ئەم خەونە بۆ ئافارەکان بگێڕەوە • »

« باوەڕ ناکەن • منیش ، ئەگەر بە چاوی سەری خۆم نەمدیبا ،

بڕوام نەدەکرد • »

جارێکیان ئەبوتالیب گوتی :

« یەکەم جار قامیشێکم بڕیەوە ، شمشاڵێکم دروست کردو فووم لێ کرد گوند گوێی لە دەنگی شمشاڵەکەم بوو • ئینجا چلێکم بڕیەوە شمشاڵێکی گەورەترم دروست کردو ئاوازێکی ترم لێدا ، لە شاخە دوورەکان گوێیان لێ بوو • پاشان درەختێکم بڕیەوەو زووڕنایەکم دروست کرد ، سەراپای داغستان گوێی لە فیقەی زووڕناکەم بوو • ئینجا دەستم دایە قەڵەمێکی بچووکو شیعرێکم لەسەر کاغەز نووسی ، لە سنووری داغستان پەڕیەوە •

ئەی دابەشکەری زمانان ، جارێکی تریش سوپاست دەکەم • سوپاست دەکەم کە شاخەکانمان ، گوندەکانمان ، دڵەکانمانت لە بیر نەکرد •

سوپاس بۆ ئێوەش هەمووتان کە بە زمانی زگماکی خۆتان گۆرانی دەبێژنو بیر دەکەنەوە •



# گۆرانی

**نووسینی سەر تەنبوورێك :**
**خەنجەر پیاو دەخاتە باوەشی مەرگەو**
**تەنبوور زیندووی دەکاتەوە .**

★ ★ ★

ووشەی «باکان»ی ئاڤاری دوو مانای هەیە : (ئاواز)و بارو هـەستی پیـاو یان سەلامەتی دونیا . کـە بتـەوێ بڵێی ئاوازێکم بۆ لێـدە دەبێ ووشەی (باکان) بەکار بێنی ، کـە بپرسیت چۆنی ؟ دەبێ هەمان ووشە بەکـار بێنی . بـەم جـۆرە بەلای ئێمـەوە ئەحواڵی پیاوو گۆرانی هەردووکیان لەناویەك ووشە دان .

ووشـەو قسە لـە بێژنگ بدە گۆرانیت دەست دەکـەوێ . ڕقو کـەرب‌و خۆشەویستی لـــە بێژنگ بدە گۆرانیت دەست دەکـەوێ . بەسەرهات‌و کاروباری مرۆڤایەتی‌و سەرلەبەری ژیان لـــە بێژنگ بدە

گۆرانیت دەست دەکەوێ •

« بەتایبەتی گۆرانیەکی تاڤلی بزواندی • ووشەکانی کـەم بوو ، هـەموو جوانیەکەی لـە کۆرسی خەمبـاردا بوو : ئێ ، دێ ، دەلالێ • یەرۆشکا ووشەکانی وەرگێرا : گەنجێك پەزی لـە گوندەوە بـەرەو شاخان هـــاژوا • رووس هـــاتن گوندەکەیان سووتاند • پیاوەکـــانیان کوشت • ژنەکانیان یەخسیر کرد • گەنجەکـە لـە شـاخ هاتەوە جێی گوند چۆڵو هۆل بوو • نە دایك ما بوو ، نە برا ، نە ماڵ • یەك تاقـە درەخت مـــا بوو • لـە ژێر درەختەکە دانیشتو گریا : (تەنیام ، ئەی درەختەکە وەکو تۆ تەنیام) : ئینجـا هـەڵیکردە گۆرانی : ئێ ، دێ ، دەلالێ ! » ــ ( لیۆ تۆلستۆی ، قەوقاسیەکان ) !

ئێ ، دێ ، دەلالــێ ، دەللا ، دەلالێ ، دەلالێ ! ئەی گـــۆرانی خۆمان ! ئەی گۆرانیە غەمگینەکانی شاخان ! ئێوە کەیو لە کوێو چۆن پەیدا بوون ؟ ئێوە کە هێندە سەیرو ئازیزن لە کوێرە هاتوون ؟

**نووسینی سەر تەنبوورێك :**
**وا دەزانی ئەم ئاوازە لە ژێیەکانەوە هەڵدەستێ ؟**
**نەخێر ، ئەمە زایەلەی ووشەی ناخی دڵە •**

**نووسینی سەر خەنجەرێك :**
**دوو گۆرانیو دوو دەمو دوو دیو ؛**
**مەرگی دوژمنو ئازادی نیشتمان •**

**نووسینی سەر لانکێك :**
**کەس نیە لەم دونیایەدا ،**
**لەسەر پشتی لانك**
**گۆرانی ناسك ، گۆرانی دایکی**
**بۆ نەگوترا بێ •**

**نووسینی سەر بەردێکی دەم ڕێـگا :**
**گۆرانیو ڕێـگا ـ عەگید لە ڕێـگا گۆرانی دەڵێ •**
**گۆرانیو ڕێـگا قەت بنیان نایە •**

**نووسینی سەر کێلێك :**
**کە گۆرانی دەگوت خەڵك گوێیان لێدەگرت ،**
**ئێستاش خەڵك گۆرانی دەڵێو ئەو گوێیان لێڕادەگرێ •**

گۆرانی کۆنو نوێ ••• لایلایـە ، گۆرانی زەماوەند ، گۆرانی جەنگ ، گۆرانی کورتو درێژ ، گۆرانی غەمبارو خەمڕەوێن ! ئێـوە لە سـەراپای دونیـادا دەچڕێن • ووشەکـان وەکو مووروو ، وەکو زریرەی زیو دەهۆنرێنـەوە • ووشەکان وەکو بزمـار دادەکوترێن • چۆن کـە ئافرەتێکی نازدار دەگری فرمێسکەکانی ڕێچکە دەبەستن ، ووشەیش ئاوهـا بە نەرمی دێنو دادەڕژێن • ووشە وەکو تیـری نیشانەشکێنی مەعلان دەڕواو نیشانە دەپێکێ • ووشـە وەکو ئەو کلـکە شاخانەی دەتوانی تا بنی دونیـا پێیاندا بڕۆی ، ئاوا پێچ دەکەنو دوورت دەخەنەوە • بۆشایی بەینی دێرەکان وەکو کۆڵانیماڵی خۆشەویستەکەتە وەکو دێرە جووتی سەر زەوی باوکتە ، وەکو کاتی گزنگ دانی بەیانیو ئاوابوونی ڕۆژ وایە ، شەو و ڕۆژ لێك جودا دەکاتەوە •

گۆرانی هەیە نووسراوەتەوەو هەیە نەنووسراوەتەوە • بەڵام هەر چۆنێك بێ مادام گۆرانیە دەبێ بچڕێ • ئەو گۆرانیەی نەچڕێ وەکـو باڵندەیەکە نەتوانێ بفڕێ ، وەکو دڵێکە نەتوانێ لێبدات •

ئێمە لە شاخان دەڵێین : کـە شـوان گۆرانی نەڵێ ، مێگەڵ لـە لەوەڕ دەبێ • بەڵام کـە گۆرانی لە قەدشاخی سەوز زرنـگایەوە هـەتا بەرخی ساواو باقۆش گیا هەڵدەوێژنێ •

کابرایەك میوانی هـاتو بە میوانەکەی گوت کـە بەزمانی خۆی گۆرانیەك بڵێ ؛ بەڵام میوانەکە هیچ گۆرانی نەدەزانی ، یان تاقـەتی گۆرانی گوتنی نەبوو ، ئیـدی هەموو قسەی ئـەوە بوو کـــە گوتی : گەلەکەمان یەك تاقـە گۆرانی چیـە یەتی ٠

« جا ئایا تۆ خۆت هەیت یان‌نا ؟ چونکە گەل بە بێ گۆرانی نابێ ! »

ئێ ، دێ ، دەلالێ ، گۆرانی کلیلەو سندووقی پیرۆزی زمانی پێ دەکرێتەوە ٠ ئێ ، دێ ، دەلالێ ، دەلالا ، دەلالێ ٠

بۆتان باس دەکـــەم گۆرانی چۆن پەیدا بوە ٠ شیعرێکم لـــەم بارەیەوە نووسیوە ٠ فەرموو بیخوێننەوە :

## خەنجەرو گیتار

**لە ڕۆژگاری هەرە هەرە کۆندا**
**گەنجێکی لادێیی : لەو دیو دەربەندی چیاکان هەبوو ٠**
**تەنیا یەك خەنجەرو**
**یەك دار هەنجیری هەبوو ٠**

**یەك بزنی تاقانەیشی هەبوو ٠**
**لە مێرگ‌و میرغوزاری سەوز دەیلەوەڕاند ٠**
**ئـەم گەنجـە ،**
**ئەشقی کچی خـــان بوو ٠**

**ئەگەرچی گەنجەکە زیخ‌و تازا بوو**
**بەڵام کە چوە داخوازی کچەکە ،**
**خـــان**
**قاقا پێی‌پێ‌کەنی ٠**

**با خودانی دارهەنجیرو تاکە خەنجەر**
**هـەر بزنی خۆی بدۆشێ ٠**

**پاشای خاوەن زەوی‌و ماڵات**
**کچی خۆی ناداتێ •**

**گەنجی کلۆڵ ئاگری لە دڵ بەر بوو**
**دەستی دایە خەنجەرەکەی ،**
**بزنەکەی بۆ خوا کردە قوربانی‌و**
**دارهەنجیرەکەی لە ڕیشەوە هەڵکێشا •**

**بە تەگبیری خوای شیعر**
**قەدی دارەکەی کردە گیتارو**
**ڕیخۆڵەی بزنەکەی**
**بۆ کردە ژێ •**

**هـــەر هێندە ،**
**پەنجەی گەیاندە ژێیەکان**
**ووشەی « سوێند » و « بەڵێنی »**
**لێ پەیدا بوو •**

**خۆشەویستەکەی بۆ بوو •**
**کچە بە بێ ماندووبوون**
**بوو بە هی خاوەنی**
**دوو گەنجینەی : خەنجەرو گیتار •**

**گوند هێلانەی لە قەدی چیا کردوە ،**
**پشتی داوەتە شاخ •**
**دوکەڵ لە دێ بەرز دەبێتەوە ،**
**خەنجەرو گیتار بە دارەوە هەڵواسراون •**

پاندوورو خەنجەر ، شەڕو گۆرانی • ئەوین‌و کردەوەی مێرانە • مێژووی گەلەکەم • چاییەکان شانازی بەم دوو شتە دەکەن •

ئەم دوو گـەنجینەیە ، لـە مـاڵان ، وەك قۆڵی چاکەت ، لەسـەر مافووری سـەر دیوار ڕاست‌و چەپ لێك تێدەپەڕن • بە ئەسپایی‌و بـە

ڕێزو خۆشەویستی دەیانهێننە خوارێ • بە خۆڕایی دەستیان نادەنێ • کـە دەست درێژ بـکەی خەنجەر دابـگری ، یەکێکی لە خۆت گەورەتر بێت دەڵێ • « ووریا بـە ، ژنی پەندوورەکـە نەپسێنی • » کـە بچی پاندوورەکە بێنیتە خوارێ ، یەکێکیتر دەڵێ :

« ووریا بە ، پەنجەت بە خەنجەرەکە نەبڕی • »

وێنـەی پاندوور لەسـەر پشتی خەنجەر هـەڵدەکەنو وێنـەی خەنجەریش لەسەر پاندوور دەکێشن • کـە خەنجـەرو پاندوور بـە دیوارەوە هەڵدەواسن، بەسەر کەمەرەی زیوو خەناوکەی کچاندا شۆڕ دەبنـەوە • پیاو کـە دەچوونە شـەڕ خەنجەرو پاندووریان لەگەڵ خۆیان دەبردو ئەو شوێنە پیرۆزەی سەر دیوار بە ڕووتی دەمایەوە •

« جا پاندوور بۆ دەبەنە شەڕ ؟ »

« تواهوو !! کـە ژێیەکانی بلەرێنیتەوە یان هەر دەستیان لێ بدەی ، ووڵاتی باوکو باپیرت ، گوندی خۆت ،ماڵی دایکت دێتەوە بەر چـاو • تۆش بۆ ئەمانە دەجەنگیو ئەمانە شایەنی ئەوەن خۆیان بۆ بەخت بکەی •»

پیـاوی ڕەشید گوتوویانە : « کـە شیر وێك دەکەون ، گوندت لێ نزیك دەبێتەوە • » بەڵام هیچ شتێ وەکو پاندوور ماڵ نزیك ناخاتەوە •

ئێ ، دێ ، دەلالێ دەللا ، دەللا ، دەلالالێ !

مەحموود لە شاخەکانی کربات گۆرانی دەگوتو گوندە چیاییەکانی خـۆی لا بوو ، مێرەمی گراوی خـۆی لا بوو ، مەحموود وەسیەتی کردوە ، نووسیویە :

**• نەختێ کەمتر خۆڵ بەسەر گۆڕی من داکەن •**
**تا گوێم تەواو قەپات نەبێ ،**

بۆ ئەوەی بە دڵو گیان ،
گوێ لە گۆرانی چیاییەکانی دێ کەمان بگرم •

تەنبوورە نازیزەکەم لە گەڵما بخەنە گۆڕ ،
بۆ ئەوەی نازدارەکانی گوندەکەمان ،
لە گۆرانی من بێبەش نەبن و
گوێ لە دەنگی پەروشم بگرن •

مەحموود هەروەها دەیگوت :

کە ئاوازێك لێدەدەم چیا دەچەمێتەوە •
بەڵام ، میرەم ، خۆشەویستم ،
نازانم چۆن چۆنی
دڵی تۆ نەرم بکەمەوە •

کە تەنبوور لێدەدەم مار دەکەوێتە سەما •
بەڵام میرەم ، خۆشەویستم ،
نازانم چۆن چۆنی
دڵی تۆ نەرم بکەمەوە •

دەتەوێ بزانی گۆرانی چیا لە کوێوە هاتوە ؟
لە خەونی گەل پەیدا بوە ،
لە سینگی بەرین تواوەتەوەو
لە خوێنی گەرم هەڵقوڵاوە •

لە جەوزای ئەستێرە بەندەوە هاتوە •
لە ماڵو گوندەکانی داغستانەوە هاتوە
پێش ئەوەی تۆ گوێی بدەیتێ
سەدان پشت گوێیان لێ بوە •

گۆرانی سێلاوێکە لـە قـەد شاخەوە دەڕژێتە خوارێ • گۆرانی ئەسپێکی بەبەزی قاسپدی شەرگەیە • گۆرانی ئەو برادەرانەیە لەنکاوڕا دەبنـە میوانت • دەست بدە پاندور ، چۆنـگور ، چاگـان ، دووزەلە ،

کەمانچە ، زوڕنا ، تەمبوورین ، ئەکۆردیۆن ، دەهۆڵ ، تەنانەت لەگەنو سنیش • لەپ لـە لەپ دە ، قونیانی لـە زەوی بـکوتە ، گوێ لـە پێك کـەوتنی شمشیر بـکرە ، گوێ بدە چرتەی ئەو پلووکەبەردەی بـە پەنجـەرەی خۆشەویستەکەت دەکـەوێ • گۆرانی بڵێو گوێ لـە گۆرانیەکانی خۆت ڕاگرە • گۆرانی‌نوێنەری خەمو خۆشیە ، پەساپۆرتی شەرەفو نەبەردیە ، بەلـگەی بیر کردنەوەیە • گۆرانی پیاوی گـەنج ڕەشیدو نەبەرد دەکا ، پیاوی پیرو ژیر گەنج دەکاتەوە • سوار ناچـار دەکـا پیـا ببێو گوێی لێ ڕابگرێ • وا لـە پیادە دەکا خۆی هەڵداتـە سـەر خانەی زینو وەك (با) تێی‌بتەقێنێ • سەرخۆش هوشیار دەکاتەوەو وای لێ دەکـا بیر لـە ژیانی خۆی بـکاتەوە • هوشیاریش سەرخۆش دەکـا • گۆرانی لـە بارەی چـەند شتەوە گوتراوە ؟ چیایی لەبەر ئاگردانی گـەرمی خـۆی دابنێو بادەیەك شـەرابی سـەربەکـەفی خۆمـانەی بۆ بێنـەو داوای گۆرانی لێ بـکە • گۆرانیت بۆ دەڵێ • تـا بەیانی گۆرانی دەڵێو ئەوەی دەیڵێ نایڵێتەوە بەڵام ئەوەندە هەیە زۆر بە نەزاکەتی داوای لێ بـکەو پێشی بڵێ گۆرانی لەبارەی چی بێ • لەبارەی خۆشەویستی ؟ لە بارەی خۆشەویستیەوە گۆرانیت بۆ دەڵێ :

**ئێ ، دێ ، دەلالێ ،**
**ئەوین وەك خوێنو گوڵەخەزێمە سوورە •**
**ئەوین وەك شەوی تاریك ڕەشە •**
**ئەوین وەك خەناوکەی کچۆڵان سپیە •**
**ئەوین لە ئاسمانو سەهۆڵ شینترە •**
**ئەوین وەکو ئەستێرەی مەزن وایە •**
**بەفر دەبارێو لێشاو ووشك دەکا •**
**بەڵام گوڵی ئەوینو دڵداری قەت هەڵناوەرێ •**

**« جوانترین شت لە دونیادا چیە ؟ »**
**« وەنەوشەی شاخان ! »**

**« چ شتێ لە وەنەوشەی شاخانیش جوانترە ؟ »**
**« ئەوین ! »**
**« گەشترین شت لە دونیادا چیە ؟ »**
**« ڕۆژی سەرشاخی سبەینان ! »**
**« چ شتێ لە ڕۆژی سەرشاخی سبەینان گەشترە ؟ »**
**« ئەوین » .**

ئێ ، دێ ، دەلالێ .
باشە گۆرانی لەبارەی چی‌ترەوە بلێم ؟

« لەبارەی ئەو دڵدارانەی بوونە قوربانی ئەوین‌و خۆشەویستی . »

« ڕۆمیۆو جۆلیت ، تاهیرو زوهرە ، تریستان‌و ئیزۆلت . »

ئەدی زۆری واش لە داغستان نەبوون ؟ زۆریان بەو کەسەرەوە مردن کە بۆیەك نەبوون . خەونەکانیان هەڵبرینگاو لێویان قەت نەگەیشتە یەك‌و دەستیان نەکەوتە ناو دەستی یەك ـ زۆر گەنج لە شەڕ فەوتان بەڵام زۆریش لە ڕێگای خۆشەویستی سەریان نایەوە . لەناو ئاگری خۆشەویستیدا سووتان‌و لە شاخی بەرز خۆیان هەڵدێرا . خۆیان فڕێ دایە ناو تەوژمی ڕوباران .

ئەمە کچێکی گوندی ئازینیەو ئەمەش گەنجێکی گوندی کوموخە. فەرموو ئەمەش بەسەرهاتەکەیان . ئەمەش ئەنجامی دڵداریان . باسی سەرەنجامی خۆشەویستی ئەم کوڕو کچەتان بۆ دەکەم کە سەراپای داغستان دەیزانێ :

گەنجێ لە کوموخەوە چوە ئازینی بۆ ئەوەی بە دیداری خۆشەویستەکەی شاد بێ . بەڵام خۆشەویستەکەی لێی نەهاتە دەرێ . کوڕە چوار شەوو چوار ڕۆژ چاوەڕێی کرد . ڕۆژی پێنجەم سواری ئەسپ بوو بۆ ئەوەی بگەڕێتەوەماڵێ .

سەری دانەواند ـ زەوی ووشك بوو •
سەری هەڵبڕی ـ ئاسمان ساماڵ بوو •
ئەم بارانە لە کوێ هاتو
بەتیەی تەڕ کرد ؟

میسیدۆی دەزگیرانی لەسەر بان بوو ، وەك جۆگـــەی شاخـــان فرمێسکی لە چاو دەهات •

ـــ چوار شـــەوو چوار ڕۆژە چاوەڕێت دەکـــەم بۆچی خۆت شاردۆتەوە ؟

ـــ کە براکانم گوێیان لە ترپەی سمی ئەسپەکەت بوو ،
لە پشت چوار دیوار بە چوار قوفل بەندیان کردم •
چوار شەوو چوار ڕۆژ دانیشتم •
ڕۆژی پێنجەم کە سواری ئەسپ بووی
دەروەست خۆم نەهاتم
هێندە خۆشم دەویستی ،
هـەر چوار قوفلم شکاند !
ئێرە بازاڕە ، هەڕاجخانەیە !
وەك کاڵای بازاڕ دەمفرۆشن •
دەملەنێ یەکێکی وا کە خۆشم ناوێ ،
مەڕۆ ، زینی ئەسپەکەت بکەوە •

بەڵام گەنجی کومۆخی ڕازی نەبوو بگەڕێتەوە :

ـــ ئەسپم تەیار کردوە ، تازە زینی لێ بکەمەوە
برادەر چیم پێ دەڵێن ؟ دراوسێ چیم پێ دەڵێن ؟
دوعابوونم لە برادەرەکەم خواستوە ،
تازە چۆن بچمەوە کنی ؟
دەڕۆم بەڵام دڵی خۆمت بۆ بە جێ دێلم •
ـــ نەکەی ، نەوەك براکانم وەك قەل دەکەونە سەری و دەیخۆن •
+ چاوی خۆمت بۆ بە جێ دێلم •
ـــ نەکەی ، نەوەك براکانم وەك تلیەترێ هەڵیمدەمژن •
ئەگەر هەر بڕیارت داوە بڕۆی
تا پەڕگەی دێ جلەوی ئەسپەکەت ڕاکێشە •

لەوێ ئاوڕێکم لێبدەوە : تەماشایەکی ترم بکە •
سەوزە گیا دەرخواردی ئەسپەکەت بدە ،
ئاوی سازگاری ڕوبار بدە ئەسپەکەت •
کە شەو داهات
لە ژێر بەتیەکەت بخەوەو
کە واگا هاتی یادم بکەوە •
ئەگەر باران باری ، بزانە ئەوە فرمێسکی منە •
ئەگەر بەفر باری ، بزانە ئەوە ئازاری منە •

گەنجی بە هەیبەتی کومخی سێ قامچی لە ئەسپەکەی دا ، سێ ئاوڕی لە خۆشەویستەکەی دایەوەو ڕۆیشت • سێ حەفتە پێ چوو ، بەفر شاخەکانی داپۆشی ، میسیدۆی سەرشین ، نەیدەویست مێرد بەو کەسە بکا کە خۆشی نەدەویست ، چوو لەسەر چیایەك خۆی هەڵدێرا • ئێوارەی پێشوو باوكو براكانی لە کۆنگەی زریان و ڕەشەبادا میسیدۆیان وەدەرنا بوو • ئەو شەوە میسیدۆ ئەم گۆرانییەی دانا :

یاخوا ئەم ماڵە سەد کچی ببێ
بۆ ئەوەی باوکم بیانفرۆشێ ،
تا تێر پارەو زێر بێ‌و
لە خەنی خۆشییان هەر هەڵپەڕێ •

یاخوا براژنەکانم حەشەری دەربچن •
یاخوا براژنەکانم حەز لە براکانم نەکەن •

یاخوا ئەو بارانەی لە ئاسمانەوە دەبارێ‌و
ئەو ئاوەی بە ڕوباردا دەڕوا
هەمووی ببێ بە پارەی مەلعوون •

خۆشەویستم ، بەفر دەبارێ ،
شوێنێکی گەرمتر بۆ خۆت بدۆزەوە ،
خۆشەویستم ، ژێر پێم شەختەیە
هەر بڕوانە پێش خۆتەو
هیچ ئاوڕ مەدەوە •

لەوانەیە لاوە گوێی لــە ناڵەی ئاوزنگدانی خۆشەویستەکەی بوو بێو لەوانەیشە دڵی خــەبەری دابێ • هــەر چۆنی بێ ، خێرا بە سواری ئەسپ لــە کوموخەوە هــات • ئەسپەکەی کــەف‌و ئارەقــەی لــێ دەچۆڕایەوە • کــە بەو کارەساتە غەمــگینەی زانی جلەوی ئەسپەکەی بــەرداو زناری لـــە پشت کردەوە جــەکی فڕێ دا • تفەنگی بە بەردێك داداو هـــووردو پووردی کرد • هـــــەر ڕای کردە کن باوك‌و برای دڵخوازی ناکامی و گوتی :

**« نە : نامەوێ خۆشی ماڵەوەتان لێ تێك بدەم ،**
**خەنجەرم بە هەسان ناسووم ،**
**نامەوێ بە گوللەو پۆلا تۆڵەم بسێنمەوە •**
**تەنیا ڕووی خۆشەویستەکەمم پێشان بدەن**
**با یەك جار سەیری سنگی بەفرینی بکەم ؟**
**پیرەباب لەسەر چاوی کچەی هەڵدایەوە**
**کوڕە لە شوێن خۆی سپی بوو ،**
**دەتگوت لە گۆڕ ڕاست بۆتەوە ،**
**کە سنگیان واڵا کردەوە**
**کوڕە تەماشای کردو دەلا هات‌و**
**بێ جوولە کەوت‌و مرد •**

هەردووکیان مردن • چارەنووسیان یەك بوو • بەڵام لەشیان جودا بوو • چار ؟ چۆنیان بنێژن ؟ کۆڕێــکی گەورەیان بەست • دونیادیتە لە هــەموو لایەکی داغستانەوە هاتن • پێغەمبەرە ناودارەکانی خۆشەویستی گوتیـــان :

**ژیان ڕوومردەوەو خوێن بەستی •**
**بە ڕاستی یەکتریان خۆشدەویست •**
**دوو لەش‌و یەك خۆشەویستی •**
**دوو ژیان‌و یەك خۆشەویستی •**

**یەك گۆڕی بەرین**
**بۆ هەردووکیان هەڵکەنن •**

**ژیان ماوەیەك لێکی کردن .**
**مردن هەتا هەتایە پێکی گەیاندن .**

**بە یەك کورك دەیانپێچین .**
**خۆلیان بەسەردا دەکەین .**
**یەك گێلیان بۆ دەچەقێنین .**

چۆنیان گوتبوو وایان کرد . گۆلێکی سوور لە بن کێلەکە ڕواوە بە بەفر هەڵناوەرێ بگرە کە بەفری پێ‌دەکەوێ یەکسەر بەفرەکە دەتوێتەوە دەڵێی گوڵی ئاگرە . لە خوار گۆڕەکەش کانیەك دەربوە ، خەڵك لێی‌دەخواتەوە . لەم لاو لەو لای گۆڕەکەش دوو درەختی وا ڕواون لەناو ئەفسانانیش نموونەیان نیە . کە بای دێ چلەکان لێك دوور دەکەونەوەو کە کزەو نەسیمێکی فێنك دێ تێك دەئاڵێن‌و وەك دوو دڵدار یەکتر دەگرنە باوەش : گەنجی کوموخی‌و کچی ئازینی .

دەمەوێ گۆرانیەکی تریشتان بۆ باس بکەم کە لە بارەی عەلیە ؛ بەلام زۆر درێژە . ڕێم بدەن وەك چیرۆکەکەی پێشوو ، هەندێکی بە بەستە بڵێم‌و هەندێکی بە قسە بگێڕمەوە .

هەبوو نەبوو ، لە گوندێکا ، کابرایەك هەبوو ناوی عەلی بوو . عەلی خۆی لە کن مەڕی بوو . مەڕی دەبردە شەوبەکێو .

ڕۆژێ ، کابرایەك چوە لای عەلی‌و گوتی دایکت گوتوویە مەڕەکەی جێ بێڵێ‌و زوو بگاتەوە ماڵێ . عەلی دڵی کەوتە قرت‌وفرت . دەبێ چە قەوما بێ ؟ بۆ دایکی لە دووی ناردوە ؟ ئەگەر شتێ قەوما بێ ، لە ژنی جحێڵی بترازێ پەیوەندی بە کەسی‌ترەوە نیە .

عەلی پرسیاری لە قاسید کرد . قاسید وەلامی نەدایەوە پرسیاری لێ دووپات کردەوە . دەریای تووڕەیی هاتە جۆش . خەنجەری لێ‌هەڵکێشا . ئەو حەلە قاسید دەستی پێ‌کرد گوتی :

**عەلی ، ژنت جوانو جحێلە ،**
**خەڵك شەو بێ خەمو خەیاڵ دەخەوێ ،**
**بەلام ، عەلی ، برام ، نازانم**
**بۆچی شەو سیرەی پەنجەرەی ژووری ژنەکەت دێ .**

**عەلی ، ژنت جوانو جحێلە**
**بەفر دونیای داپۆشیوە ،**
**بەلام ، عەلی برام ، نازانم**
**شوونی سەربەفری تازە ، شوونی کێیە ؟**

**نەخێر (با) نیە پەنجەرەت ڕادەهەژێنێ ؟**
**ژنەکەت خۆی پەنجەرە دەکاتەوە .**
**بازنی دیاری تۆی فڕێداوە ،**
**ئەنگوستیلەت لە قامك ناکا .**

عەلی بە هەڵەداوان ڕای کردەوە دێ . پێش ئەوەی بچێتەوە لای دایکی خۆی کرد بە ژووری ژنە جوانو جحێڵەکەیدا . ژنە ویستی کورکو تەپڵەی لەبەرداکەنێ و بوزای لەبەر دابنێ ، تا پاش شەکەتی ڕێ ماندووی بحەسێتەوە :

+ جلت داکەنە ، بوزات بنۆشە .
نانو پەنیرمان هەیە .
– لێرە ، کورکی منت بە سەر شانی کێ داداوە ؟
+ پیاویژگە ، تەپڵەت لەسەر کەوە .
عەگیدەکەم ، شۆڕە سوارەکەم .
– لێرە ، بوزات لەبەر کێ داناوە ؟
عەلی خەنجەری هەڵکێشاو دوو خەنجەری لە ژنەکەی دا :

**عەلی ، عەگیدی بەر دڵێ من ،**
**شادو بەختیار بە ، یاخوا عومرت سێ سەد ساڵ بێ ،**
**بەلام : عەلی ، عەگیدی بەر دڵێ من ،**
**سەیر کە چۆن لە خوێنی خۆم دەگەوزم .**

دەستت خۆش ،
خوا پیرۆزی کـــا ،
بەڵام تو خوا لە باوەشم کەو
لە ناو جێو بالینگانم دانێ •

عەلی گوتی : داتدەنێم •
بەڵام ڕاستیم پێ بڵێ :
گوا بازنی دیاری من ؟
بۆ ئەنگوستیلەت فڕێ داوە ؟

ءەگیدی بەر دڵێ من ، عەلی !
ئەو سندووقە بکەوە •
بازنو ئەنگوستیلەی تێدایە •
عەلی ، کە تۆم لە کن نەبی ،
چەکو خشلم بۆچیە ، عەلی ؟

عەلی ڕایکردە لای دایــکی :

- دایە بۆ لە دووت ناردووم ، ج بوە ؟

+ ژنەکـەت غەریبی دەکردی ، منـداڵ غەریبیان دەکردی • ناردم بەڵکو بێتەوەو هەندێ گۆشتە مەڕمان بۆ بێنی • لەمێژە گۆشتمان نەخواردوە •

عەلی بە نائومێدی سەری هەڵگرتو غاری دایەوە کن ژنەکەی :

چاوی ڕومردبوەوە ، ڕوناکی تێدا نەمابوو ،
دەستی سارد ببوو : سینگی کپ ببوو •
عەلی فرمێسکی داباراند ،
ژنی چوو تازە نایەتەوە •

عەلی بۆ جاری سێیەم خەنجەری هەڵکێشا
هێشتا دەمی هەر بە خوێن بوو ،
خستیە سەر سینگی خۆیو دایگرت ،
بەبێ جووڵە لەتەك ژنەکەی ڕاکشا •

بەم جۆرە چیرۆکەکە کۆتایی هات ـ هەردووکیان بە یەکەوە نێژران دوو درەخت لە نزیك گۆڕەکەیانەوە سەوز بوو •

دەتانەوێ چ گۆرانیەکی ترتان بۆ بڵێم• گۆرانی کەمال بەشیر ، کام ،کەمال بەشیر ؟ دون جوانی داغستان کە گەردەنی هێندە ناسك بوو، کاتێ ئاوی زولالی دەخواردەوە لە گەردەنی دیار بوو • باوکی بە دەستی خۆی ئەو گەردنە ناسکەی هەڵبڕی • بەڵام بۆ ؟ هەر لەبەر ئەوەی کە کوڕەکەی بێتام جوان بوو •

کەمال بەشیر مرد بەڵام ئێستاش خەڵك گۆرانی ئەوینو دڵداری دەچڕن • هەر هێندە منداڵێ لە دایك ببێ ئیدی گۆرانی دڵداری لەسەر بێشکەی بەرز دەبێتەوە •

ئێستاش باسی ئەو یاریە میللییەی خۆمان دەکەم کە پێی دەڵێن : « باکیری ڕاخین » •

یاریەکە بریتی بوو لە شەڕە شیعری گۆرانی • بریتی بوو لە پێشبڕکێ زوو دۆزینەوەی ووشەی جوانو لەبار • ئەم یاریە لە هەموو گوندێکی داغستان باوە •شەوی درێژی زستان کوڕو کچی دێ لە ماڵێك کۆ دەبنەوە • شەراب نانۆشن ، قومار ناکەن ، هەراو گاڵتە ناکەن ، بەڵکو شیعر شیعرانێ دەکەن • توخوا جوان نیە ؟

کچێك دێ داردەستێکی بە دەستەوەیە • دارەکە لە گەنجێك دەداو گۆرانی دەچڕێ :

**ئەی جوانترین گەنج ، ئەم دارە بگرە ،**
**جوانترین کچ بۆ خۆت هەڵبژێرە •**

گەنجەکە کچێك هەڵدەبژێرێ کچەکە لەسەر کورسیەك دادەنیشێو بە گۆرانی دەکەونە گفتوگۆ :

**هۆ جوانێ ، جوانێ ،**
**تۆ کێی ؟**
**هۆ جوانێ ، جوانێ ،**
**لە چ نەتەوەیەکی ؟**

هەموو لا پێکەوە چەپڵە لێدەدەن‌و بەستە دەڵێن :

**« ئێ ، دێ ، دەلالێ »**
— **ناوی خۆم گوتوە**
**بەڵام بە یەکێکی‌تر**
**پەیمانی خۆشەویستم داوە**
**بەڵام بە یەکێکی‌تر ٠**

هەموو لا پێکەوە چەپڵە لێدەدەن‌و گۆرانی دەڵێن :

**« ئێ : دێ ، دەلالێ » ٠**

ئینجا کچەکە لەسەر کورسی هەڵدەستێ‌و بە داردەستەکە گەنجێك هەڵدەبژێرێ‌و گەنجەکە لە جێی ئەو دادەنیشێ ٠ ئەم دوە بە گۆرانی دەکەونە گفتوگۆ :

**کچ : بەفر چیای داپۆشیوە ٠**
**رێ‌و بان دیار نیە ٠**
**چ گیا نیە ٠**
**کاوڕی خوری زێڕ بیخوا ٠**
**کوڕ : بەفر دەتوێتەوە**
**وەك ڕوباری زیوین شۆڕ دەبێتەوە ٠**
**کـاوڕی زێڕین**
**لەسەر سنگی تۆ دەلەوەڕێ ٠**
**« ئێ ، دێ ، دەلالێ »**

جووتێکی‌تر دێنە پێشەوە :

**کچ : عـەزیایەك**
**بەری ئاوی کانی ساردی گرتوە**
**لێ ناگەڕێ**
**نێری زێڕین تێر ئاو بخواتەوە ٠**

**کوڕ : بە عەزیای ناو کانی سارد**
**مەمانترسێنە**
**نێری تێر تێر**
**ئاوی چاوی تۆ دەخواتەوە .**
**« ئێ ، دێ ، دەلالێ »**

جووتێکی‌تر دێنە پێشەوە :

**کوڕ : لە دۆڵان زریانە**
**ڕوبار یەك پارچە شەختەیە .**
**کچەکە مێردم پێ بکە .**
**با ماڵێکی نوێ پێکەوە بنێین !**
**کچ : بۆ خۆت ، لە گوندێکی تر :**
**لە کچێکی‌تر بگەڕێ .**
**لــە حەوشەی ئێوە**
**کەو ناچێتە ناو کۆڵێتی مریشکان .**
**« ئێ ، دێ ، دەلالێ »**

هەموو چــەپڵە دەکوتن‌و پێ‌دەکەنن . شــەوی درێژی زســـتان بەم جۆرە دەبەنە ســەر .

ئەی «گۆرانی دڵداری» ی داغستان ! کــە کوڕە داوای لــە کچە دەکرد مێردی پێ بــکانامەردێك دەچوو هــەڵی دەگرت . کــە بــە ڕیزەوە لــە دەرگای ماڵی کچەیان دەدا یەکێکی‌تر لە پەنجەرەوە بازی دەدا ژووری .

ڕۆژگـــار دێ و دەڕوا بــەڵام گۆرانی هــەر دەمێنێ . گۆرانیبێژ گۆرانی دروست دەکاو گۆرانی گۆرانیبێژ دروست دەکا . ئایا زەماوەند بێ گۆرانی دەبی ؟ ڕۆژ بـــە بێ گۆرانی دەڕوا ؟ پیــاو بــە بێ گۆرانی دەژی ؟

لــە دەفەرەکەماندا دەڵێن : «ئەوەی هیچ گۆرانی نەزانێ نابێ لــە خانوودا بژی ، دەبێ لە کۆڵێتدا بژی . »

هەروەها دەڵێن : ئەو زەبەڵلاحەی دڵداری نەکرد بێ بەژنی ناگاتە پشتێنی دڵدارێك .

چیرۆکێك لـە مەحموود دەگێڕنەوە ؛ لـە کاتی شـەڕی یەکەمی جیهانی لـە سەنگەری (کارپاسی)دا لەگەڵ سوارەی داغستانی دا بوو . لەوێ بوو گۆرانی (مێرەم)ی نووسی‌و هەموو هاوڕێـکانی لــە کـاتی حەسانەوەدا دەیانچڕی . ئەمەش چیرۆکی گۆرانیەکەیە :

دوای شەڕێـکی گران هێزەکانی ڕووس گوندێکیان لـــە دەست نەمساویەکان دەرهێنا . مەحموود کە ڕاوی دوژمنی دەنا خـــۆی لـــە تەنیشت کلیسەیەك دۆزیەوە . نەمساویەکی زەندەق چوو لـە دەرگـاوە دەرپەڕی بەڵامکە چاوی بەم چیایە تۆقێنەرە کەوت خۆی لـە ژوورێ کوتایەوە . هەمووی چـەند ڕۆژێك بوو مەحموود برای کوژرا بوو . شێتی تۆڵە سەندنەوە بوو . بێ ئەوەی توزقاڵێ بیر بـکاتەوە خۆی لـە ئەسپەکەی فڕێ دایـە خـوارێ‌و خەنجەری هەڵکێشاو کـــەوتە دوای کـابرای نەمساوی بۆ ئەوەی پـــەل پەلی بـکا . خـــۆی کرد بە ناو کڵیسەکەدا ـ و هەڵوەستەیەکی کرد . دیتی کابرای نەمساوی چو بوە ســەر چۆك ، نوێژی بۆ پەیکەری مێرەمی پاکیزە دەکرد .

لە داغستاندا ، یەکێ لە کڕنۆش بردندا بێ کەس دەستی ناداتێ . بە تایبەتی ئەگــەر خەریکی نوێژ بێ . سەرباری ئەمەش ئەو ئافرەتەی کـابرای نەمساوی نوێژی لەبەردەمدا دەکـــرد ئەوەندە جـــوان بوو مەحموودی ڕاچەناند . مەحموود کت‌وبڕ (موی)ی خۆشەویستی هاتەوە یاد ـ چاوی ، خـەمی ناو چاوی ، ڕوخساری ، بەرگی . خەنجەری لـە دەست بەربووەوە . نازانـــم داخـۆ کـابرای نەمساوی ، پاشـــان ، چیرۆکەکەی چۆن گێڕاوەتەوە بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم چیایەتۆقێنەرە لە

ئەنیشت کابرا چۆکی داداو بە دانی دیانانی کەوتە نوێژکردن•پەنجەی لە هەنیەو شانو سنگی دا • مەحموود ئاگای لێ نەبوو کەی کابرای نەمساوی ڕۆیشت بەڵام کە هاتەوە سەرخۆی شیعرە بەناوبانگەکەی (مێرەم)ی نووسی کە باسی مێرەم دەکا • بەلای ئەوەوە (موی)و (مێرم) بیوونە یەك • لە بارەی (مێرەم)ی دەنووسی بیری لە (موی) دەکردەوە • لە بارەی (موی) دەنووسی بیری لە (مێرەم) دەکردەوە •

لەو ڕۆژە بە دواوە ، مەحموود لەم دونیایەدا تەنیا دانی بە یەك شت دەناو بەس : خۆشەویستی • دڵی هیچ گۆرانیتری قبوڵ نەدەکرد • لەناو گۆرانیبێژەکانی داغستان کەس نەبوە لە گۆرانیدا بگاتە بەرزایی سۆزو قووڵایی هەستی ئەوەوە • هەرگیز ئاگای لەوە نەبوە کە شیعری نووسیوە ، بە شیعر دواوە ، قسەی نەکردوەو گۆرانی گوتوە • وەك ئەوەی کە یەکیتر قسەی بۆکرد بێو گۆرانی بۆ گوتبێ وا بوە • هەموو سەرکەوتنی خۆی لە مویو هەستی بەرامبەر موی دەزانی • ئەگەر برادەرێك بێجگە لە موی باسی شتێکیتری بۆ بکردایە گوێی لێ نەدەگرت •

باوکم ئاوهای بۆ گێڕامەوە :

زۆر کەس دەهاتنە لای مەحموود ـ بەڵام تەنیا دڵدار هەستیان بە هێزی ووشەکانی کرد بوو • داوایان لێدەکرد شیعریان بۆ دابنێ • هەبوو یەکەم جاربوو کەوتبوە داوی دڵداری و نەیدەزانی چۆن بە بەر ڕووی خۆشەویستەکەی هەڵێنێ • هەبوو خۆشەویستەکەی مێردی بە یەکێکیتر کرد بوو کابرای دڵتەنگ نەیدەزانی چ لەگەڵ ئەم خەمو جەخارە بکا کە لێکی دەپچڕاندەوە • هەبوو حەزی لە بێوەژنێك دەکردو نەیدەزانی چۆن دڵی نەرم بکا • هەبوو تەفرە درا

بوو ، هەبوو لە خۆشەویستیدا شێوا بوو ، هەبوون بەشەڕ هاتبوون ، هەبوون لێك جودا ببوونەوە .

چەند کەس هەیە ئەوەندە دڵدارە هەیە . چەند خۆشەویستی هەیە ئەوەندە دڵدارە هەیە . قەت دوویشیان وەکو یەك نین . جا مەحموود شیعری وای دادەنا بۆ هەموو کەسێك و لەگەڵ هەموو بارێك دەگونجا . دڵدارو دڵخوازی پێك شاد دەکرد ، شەڕکەری پێكدەهێنانەوە ، دڵی بێوەژنی خەفەتبارو بێمناڵی نەرم دەکرد ، زاتی دەخستە بەر لاوان ، بێ ئەمەکی شەرمەزار دەکرد ، دڵی تەفرەدراوانی دەدایەوە .

یەکێ لێی پرسی : « تۆ چۆن دەتوانی شیعری وا دابنێی کە لەگەڵ میزاجی زۆربەی ئەم خەڵکە جیاوازە بگونجێ ؟ »

« بۆی هەیە چارەنووسی هەموو کەس لەناو یەك دڵدا بێ . بۆ چما ئەمن شیعر بۆ ئەوان دەنووسم ؟ بۆ خۆشەویستی ئەوان ؟ ئازاری ئەوان ؟ نەخێر ، من لەبارەی خۆمەوە دەنووسم . بە گەنجی ، کە کوڕی ڕەزووکەرێکی بێ نەوا بووم ، لە گوندی «بێتلی» حەزم لە (موی) کرد . بەڵام موی شووی بە یەکێکی‌دی کرد هەر وەخت بوو لە هەژمەتان دڵم بتەقێ . پاشان موی مێردی مردو بە بێوەژنی مایەوە دیسان دڵم حەجمانی لێ بڕا . بەڵێ من هەموو شتێ لە بارەی خۆشەویستیەوە دەزانم ؟ جا بۆ دەبێ شیعر لە بارەی خەڵکی ترەوە بنووسم ؟ »

هەروەها دەڵێن خەڵك داوایان لە مەحموود دەکرد شیعر لە بارەی ئەوانەوە بنووسێ کە مردوون یان لە شەڕدا کوژراون ــ دایك بۆ جگەرگۆشەی ، خوشك بۆ برای ، ژن بۆ مێردی . دەزگیران بۆ دڵداری . بەڵام مەحموود نەیدەتوانی شیعری وا دابنێ . دەیگوت : «من

کە تەنانەت لە کاتی شەڕیش شیعری دڵداریم دادەنا ئێستا لە گوندێکی هێمن و ئارام چۆن دەتوانم شیعر لەبارەی شەڕەوە بنووسم ؟ »

چاپیەکان دەڵێن : «تەنیا ئەو کاتەی کە شەڕ دێ ، بە ڕاستی گۆرانی ئاشتیت خۆش دەوێ • »

هەروەها دەڵێن : « بۆ ئەوەی خۆشەویستی خۆت تاقی بکەیتەوە بڕۆ ناو مەیدانی شەڕ • »

خەنجەر دوو دەمی هەیە : یەکێ خۆشەویستیە بۆ وولاتی خۆت ، ئەوەیتر ڕقە بۆ دوژمنان •

پاندووور دوو ژێی هەیە : یەکێ بۆ گۆرانی ڕقە ، ئەوەیتر بۆ گۆرانی خۆشەویستیە •

لە بارەی چاپیانەوە دەڵێن : کە دەستێك لە ملی خۆشەویستیان دەکەن دەستەکەی تریان لەسەر خەنجەرە • بەلاش نیە کە زۆر گۆرانی و چیرۆکی کۆن بە زەبرێکی خەنجەر کۆتاییان دێ • زۆریش کۆتاییان ئەوەیە کە چاپیەکە دەگەڕێتەوە گوندو کچێکی لە پێش خۆی سوار کردوە •

کە گۆڕی کۆن لە شاخان دەدۆزنەوە ، خەنجەرو شیریان تێدایە • « ئەدی بۆ پاندووریان تێدا نیە ؟ » « پاندور بۆ زیندوان بە جێ دەمێنێ تا گۆرانی بە پاڵەوانە مردووەکان هەڵبلێن • جا ئەگەر چەك قات بێ ، ئەگەر یەك خەنجەر نەمێنێ ، گۆرانی هەر دەمێنێ •

باوکم دەیگوت میوانی ئاسایی میوانی ماڵی تۆیە ، بەڵام میوانی گۆرانیبێژو سازندە میوانی سەراپای دێیە • هەموو کەس بە پیریەوە دەچێ و هەموو کەسیش بە ڕێی دەکا • بۆ نموونە ، مەحموود هەمیشە

لـه حـاكم گەرمتر بە خێر هاتنی دەکرا • ڕەنگە هـەر بۆیەش بێ کـە حاکم گۆرانیبێژی سەربەستیان خۆش ناوێ •

باوکم باسی دوو ڕێبواری داغستانی دەکرد • کە تاریك داهـات یەکێ بەوەیتری گوت : «وەختی حەسانەوەمان نەهاتوە ؟ شەو داهات • تۆش سەرماتەو ماندووی • ئەوەتە گوندێك با لابدەین و ئـەم شـەو لێرە بمێنینەوە • »

« ڕاستە ، سـەر مامەو ماندووشم • ڕاستت دەوێ نەخۆشیشم ، بەڵام من لانەدەمە ئەم گوندە • »

« بۆچی ؟ »

« گوندێکی کرێتە • کەس گۆرانی لێ نەبیستوون • »

ڕەنـگە ڕێبوار تووشی گوندی وا بین • بـەڵام کـەس ناتوانێ دەرهەق داغستان بڵێ : « با بە تەك ئەم وولاتـەدا بڕۆین و لانـەدەین • کـەس گۆرانی لەم وولاتە نەبیستوە • »

(بیستوژیف ـ مارلینسکی) لە کتێبەکەیدا گۆرانی داغستانی بـە نموونە هێناوە • بلینسکی دەیگوت ئەو گۆرانیانەلە کتێبەکە بە ترخترن• دەیـگوت بوشکین شەرمی بێ نەبوە بە هی خۆیان دابنێ •

لیرمەنتۆف بە لاوی ، لە تەمـەر خـان شورا گوێی لـە گۆرانی شاخـان بوو • هەر چـەندە زمانی ئێمەی نەدەزانی بەڵام زۆری تام لێوەردەگرت •

پرۆفیسۆر (ئوسلار) دەیگوت ئاوازەکانی «گونیب» خەڵاتی جوانین بۆ مرۆڤایەتی •

کێ‌و چی ئـەم دەنگ‌و گۆرانیانەی بـــە ئێمـــە بەخشیوە ؟ کێ چیایەکانی فێری ئەم هەستە کردوە ؟

هەڵۆو ئەسپ ، شمشیرو گیا ، لانك ، هەر چوار ڕوباری قۆیسوو قەزوینی سەربەست ، مێرەمی دڵخوازی مەحموود ، سەراپای مێژووی داغستان ، هەموو زمانەکانی ، تێکڕای داغستان •

« جارێکیان لە ئەبوتالیبیان پرسی : « چەند شاعیر لە داغستانـــدا هەن ؟ »

« ئاه ! سێ چوار ملێون دەبێ ! »

« شتی وا چۆن دەبێ ؟ بە هەمووتان یەك ملیۆنن • »

« هەر یەکە سێ چوار شاعیری تێدایە بـەڵام هەموو شاعـیرەکان گۆرانی ناهۆننەوە • هەموو کەسیش پێیان نازانێ • »

« لەگەڵ ئەمەش‌دا ، باشترین شاعیر کێیە ؟ »

« ئەوەی لە هەموانیش باشتر بێ ، یەك هەر هەیە لەو باشتر بێ • بەڵام ناوی یەکێکت دەدەمێ • »

« کێیـــە ؟ »

« دایکی داغستانی • چیایەکان بە گشتی تەنیا سێ گۆرانـــی دەزانـن ! »

« ئەمانە چین ؟ »

« یەکەم ئەو گۆرانیەیە کاتێ دایك منداڵی دەبێ لە تەنیشت بێشکەی دادەنیشێ‌و دەیچڕێ • »

« ئەدی دوەم ؟ »

« دوەم ئەو گۆرانیەیە کە کاتێ دایك کوڕی دەفەوتێ دادەنیشێو دەیچڕێ ٠ ٠ »

« ئەدی سێیەم ؟ »

« سێیەم هەموو گۆرانیەکانی‌تر ٠ ٠ »

بەڵێ ، دایك ٠٠ شایەدی ڕاستەقینەی ئەوەیە کە دەگەشێتەوەو دەپووچێتەوە ٠ دەبێو دەمرێ ٠ دێو دەڕوا ٠ دایك لانك ڕادەژەنێ ٠ منداڵ لە باوەش دەکا ٠ ئەو کوڕەی دەگرێتە هامێز کە هەتا هەتایە دەڕواو چاوی پێ‌ناکەوێتەوە ٠

ئەوەیە جوانی ، ئەوەیە ڕاستی ، ئەوەیە سەربەرزی ٠

خەڵکی خراپو چاك هەیە ٠ تەنانەت گۆرانیش چاكو خراپی هەیە ٠ بەڵام دایكو گۆرانی دایك هەمیشە هەر جوانن ٠

هەڵبەت ئەو لایلایانەم بە بیر نایە کە لەسەر پشتی لانك بۆیان گوتووم ، بەڵام پاشان لە زۆر گوندا زۆر گۆرانیم بیستوە ، گوێم لە لایلایەش بوە ٠ ئەمە لایلایەکە :

**کۆرپەکەم ! گەورە دەبی ، بەهێز دەبی ٠**
**گۆشت لە بن کەڵبەی گورگ دەردێنی ٠**
**کۆرپەکەم ، گەورە دەبی ، زرنگ دەبی**
**کۆتر لە ژێر چڕنۆکی پڵنگ دەردێنی ٠**
**کۆرپەکەم ! گەورە دەبی : هەموو شتت پێ دەکرێ ٠**
**گوێ لە یەختیاران ڕادەگری ، لەبرادەران دەگری ٠**
**کۆرپەکەم ! گەورە دەبی ، زیرەك دەبی ٠**
**جێت لەناو لانك نابێتەوە ٠**
**دەفڕیتە ئاسمان ٠**
**دەبی بە کوڕی من ، کوڕی دایکی خۆت**
**دەبی بە زاوای ئەو ژنە بیانیە ٠**

دەبی بە مێردی ژنێکی جوان ·
دەبی بە گورانی ئێستمانی بەنرخت ·

وای لەو بڕوایە ! دایك نیە گۆرانی نەزانێ ·

باوکم دەیگوت : دایك نیە لە ناخی دەروونەوە شاعیر نەبێ ·

بارانی هاوینێکی ووشكو برینگ
تۆی بچکۆلانەکەم !
خۆری هاوینێکی بە باران
تۆی بچکۆلانەکەم !
دوو لێوی وەك شانەی هەنگوین
تۆی بچکۆلانەکەم !
دوو چاوی وەك دووتلیە ترێ
تۆی بچکۆلانەکەم !
ناوی لە هەنگوین شیرینتر
تۆی بچکۆلانەکەم !
ڕوخساری بەر چاوان
تۆی بچکۆلانەکەم !
دلّی زیندووی خورپەدار
تۆی بچکۆلانەکەم !
کلیلی دلّی زینـــدوو
تۆی بچکۆلانەکەم !
سندووقی ناو کەف زیو
زێڕی ناو سندووق
تۆی بچکۆلانەکەم !
ئێستا نانێـکی خڕو بچووکی
بەلاّم دەبی بە گوللە ·
دەبی بە چەکوشێکی قوڕسو
بەرد دەهـاڕی ·
دەبی بە تیرێـکی تیژو
ئامـانج دەپێـــکی ·
دەبی بە سەماکەرێـکی ناسك ،
بە گۆیندەیەکی دەنگ خۆش ،
بە سەرتۆپی لاوانی هۆز ·

**دەبێ بە ڕاوکەرێکی بێ وێنــە ٠**
**بە شۆڕە سوارێــکی بێ هاوتاو**
**دۆڵاو دۆڵ تێیدەتەقێنێ**
**سمی ئەسپەکەت تۆز دەکاتو**
**وەك هەوری ڕەش بەری ئاسمان دەگرێ ٠**

باوکم دەیگوت : ئەوەی گوێی لە گۆرانی دایکی نەبوو بێ وەکو ئەوەیە بە هەتیوی گەورە بوو بێ ٠ ئەوەی لەسەر پشتی لانك گۆرانــی داغستانی بۆ بگوترێ ئەگەر بێ دایك‌و باوکیش بێ بە هەتیو داناندرێ ٠

کە دایك‌و باوك نەبێ کێ گۆرانی بۆ دەڵێ ؟

داغستان خۆی گۆرانی بۆ دەڵێ ، چیای سەرکەش گۆرانی بۆ دەڵێ، ڕوباری قەد شاخی بەرز گۆرانی بۆ دەڵێ ، جیاییەکان گۆرانی بۆ دەڵێن :

**کچەکەم کەلەفە دەزووی زێڕە ٠**
**کچەکەم گلۆڵە زیوە ٠**
**کچەکەم مانــگی سەر چیای بەرزە ٠**
**کچەکەم بزنی سەر چیای بەرزە ٠**

**نەوێرۆك لێمان دوورکەوە ٠**
**من کچیخۆم نادەمە پیاوی نەوێرۆك**
**قەلەزراو بەس بەر دەرگەمان بکوتەوە ٠**
**من کچی خۆم نادەمە پیاوی قەلەزراو ٠**

**کچی من گوڵێکی گەشی بەهاریە ٠**
**کچی من چەپکەگوڵێکی بەهاریە ٠**
**مافووری گیای ناسکە ٠**
**کچی نازداری من !**

**سێ کەری پەزم بدەنێ ،**
**برۆکانی نادەم ٠**
**سێ فەردە زێڕم بدەنێ**
**ڕومــەتی نادەم ٠**

سێ فەردە زێرم بدەنێ
خاڵی سەر گۆنای نادەم ٠

نایدەمە قەلەڕەشکان ٠
نایدەمە تاوسی بە فیز ٠
کەوەکەم ،
لەقلەقەکەم ٠

دایکێکیتر ئەم گۆرانیەی دەچڕی :

ئەوەی پلنگ بە زەبری دار بکوژێ
کچی خۆمی دەدەمێ ٠
ئەوەی بە مشتێ بەرد وورد بکا
کچی خۆمی دەدەمێ ٠
ئەوەی بە زەبری قامچی قەلا بگرێ ٠
کچی خۆمی دەدەمێ ٠
ئەوەێ وەك پەنیر مانگ لەت بکا
کچی خۆمی دەدەمێ ٠
ئەوەی وەك گول ئەستێرە بچنێ
کچی خۆمی دەدەمێ ٠
سێوی گولبەدەمی خۆمی دەدەمێ !

یان ئەم گۆرانیە :

کچەکەم پێش پشکوتنی گول
دەپشکوێ ٠
هێشتا ڕوبار نەڕۆیشتوە ،
ئەو بسکی شۆڕ بۆتەوە ٠
هێشتا بەفر نەتواوەتەوە ،
ئەو داخوازیکەری هاتوە ٠
ئەگەر هاتنە داخوازی
با یەك بەرمیل هەنگوین بێنن ،
با مەرو بەران بێنن
بەلام باوکیشی هەیە ،
با ڕەوە ئەسپێکی سەرگەشیش
بێنن ٠

فەرمـوون ، ئەمەش ئەو ئاواتەیـە کە لەسـەر بێشـکەی منـداڵ دەگوتـرێ :

**پێش جریوەی چۆلەکەی بەیان**
**کچی من لەسەر زەویە •**
**پێش واگا هاتنی تاقتاقکەرەی دارستانی دوور**
**کچی من لە ناو میرگ‌و میرغوزاری سەوزە •**
**کچی‌تر هێشتا لەبەر ئاوێنە خۆ دەڕازێننەوە**
**کچی من جەڕە لەسەر شان لە سەراوێ دێتەوە •**

ئەگەر لایلایە نەبوایە ڕەنگە هیچ گۆرانی لە دونیا پەیدا نەبوایە•ژیان هێندەی ئێستا ڕوناك نەبوایە • پاڵەوانێتی دەگمەنترو شیعر کەمتر بوایە •

یەکەم شاعیر دایکە • دایکە کە تۆوی شیعر لە وەردی دەروونی کوڕو کچەکانی دەوەشێنێ • ئەم تۆوە پاشان شین دەبـێ‌و گـوڵ دەرد دەکاو دەپشکوێ • پیاو لە ساتی هەرە سەخت‌و تەنگ‌و ناخۆشی ژیاندا ئەو گۆرانیانەی دێتەوە بیر کە بە منداڵی بیستوونی •

حاجی موراد بە جەنگاوەرێکی ترسنۆکی گوت :

« دیارە دایکت لە سەر پشتی لانك لایلایەی بۆ نەگوتووی ؟! »

کە حاجی موراد خۆیشی ناپاك دەرچوو و خۆی هاوێشتە باوەشی

قڕاڵ ، شامیل بە سووکیەوە گوتی : « دیارە لایلایەی دایـکی لە بیر نەمـاوە • »

ئەمـە بوو لایلایەی دایـکی :

**ڕۆڵە لایلایە ، ڕۆڵە لایلایە •**
**خەندەت لەسەر لێو بێ**
**بۆت بە پیاوێـکی ئازا هەڵدەلێم**
**ئازاو نەبەرد •**

**شیری لەبەر کەمەر بوو .**
**شەرەفی خۆی دەپاراست .**
**لەبای غارێ ، خۆی هەڵدەدا**
**سەر ئەسپو ڕایدەگرت .**

**وەك ڕوباری شاخان سنووری دەبڕی .**
**وەك بریسکەی دەمی شمشیر**
**پشتی چیای دەبڕی .**
**بە دەست دار چناری با دەداو**
**دەیکرد بە ئەڵقە**
**تۆش ، هەڵۆکەم ،**
**وەك ئەو پیاوە وا بە !**

دایکی تەماشای ڕوخساری خەنداوەری کۆرپەکەی دەکردو بڕواو متمانەی بە لایلایەی خۆی هەبوو . ئەو کاتە نەیدەزانی حاجی مورادی کوڕی تووشی چ دەردو چارەنووسێك دەبێ .

بەڵام کە زانی کوڕەکەی وازی لە شامیل هێناوەو پەنای بردۆتە بەر دوژمن . گۆرانیەکی تری دانا ، ئەم گۆرانیەی چڕی :

**لە ترۆپکی چیا هەڵدێرای ،**
**لە شوێنی بەرز نەدەترسای ،**
**تازە جارێکی تر**
**لەو هەڵەتە دەرباز نابی .**

**بە شەوی تار**
**لە غەزای نەبەردانە دەهاتیتەوە شاخان**
**ئێستا بووی بە پارووەکی چەور چەور**
**تازە هەرگیز نایەیتەوە ماڵێ .**

**ئیمامت سووك کرد ، قراڵت سووك کرد .**
**لەسەر کەوتن ڕا هاتبووی ،**
**چیاکانت سووك کرد ،**
**تازە هەرگیز نایەیتەوە ماڵێ .**

هەروەکو دەزانین ، پاشان حاجی موراد ویستی لە دەست قڕاڵ ڕا بکات و بگەڕێتەوە ناو کەس و کاری خۆی ، بەڵام لە عانی گەڕانەوەدا خۆیان گەیاندێ و کوشتیان • بە مردوویی سەریان لێ کردەوە • ئەو حەلە گۆرانیەکی‌تری دایکی حاجی موراد لە شاخان بڵاو بوەوە :

**شیریان باداو سەریان پەل دا •**
**بەڵام درۆیە**
**لە کۆڕی شەڕو تۆغرمی گران**
**پێویستمان بەم سەرەیە •**

**کە لەشی بێ سەریان لە دەم ڕێگا ناشت**
**بەڵام قسەی بۆشە •**
**لە شاخی سووتاوو تابلوقەدراوا**
**پێویستمان بەم دەستو شانەیە •**

**لە شیرو خەنجەری تیژ بپرسن :**
**ئایا نایبی شامیل مردوە ؟**
**بەرد بۆنی بارود هەڵنامژێ و**
**دووکەڵ زەوی داناپۆشێ**

**ناوی وەك هەڵۆ فرییە ئاسمان •**
**بریقەی دامردەوە •**
**شمشێر خوارایی ژیانی ڕاست دەکاتەوەو**
**شەرمو شوورەیی دەسڕێتەوە •**

گۆرانی دایك سەرەتایە • کانگای هەموو گۆرانی مرۆڤایەتیە • یەکەم خەندەو یەکەم ڕۆندکە •

گۆرانی لە دڵەوە پەیدا دەبێ • دڵ بە زمانی دەداو زمان بۆ دڵی هەموانی دەباو دڵی هەموانیش بە سەدەو چاخەکانی دادێی دەگەیەنێ •

جێی خۆیەتی کە لێرەدا نەختێ زیاتر باسی ئەم گۆرانیانە بکەین •



## گۆرانی دایکی شامیل

**بگرین ، دێنشینە چیاییەکان ،**
**بۆ مردوان بگرینو پێیان هەڵبلێین .**
**دوژمن قەڵای ئەخولگۆی گرتووە**
**کەس بە زیندوویی دەرباز نەبوە .**

★ ★ ★

« گۆرانی تەنیا دوو شتی تێدایە : یان خەندە یان ڕۆندك . لەم سەردەمەدا ، ئێمەی چیایی پێویستمان بە هیچێکیان نیە . ئێمە لە جەنگداین . هەر چەندە تەنگانەش بێ پیاوی ئازا لاوانەوەو گریان نازانێ . لە لایەکی تریشەوە هیچ دڵخۆشیمان بە دەستەوە نیە . دڵمان کەیلی خەفەتو تاڵیە . دوێنێ سەمایان دەکردو گۆرانیان دەگوت ... ئەوانە چرووکن . ئەگەر بەو شێوە بیانبینمەوە دیسان سزایان دەدەم . ئەگەر شیعرت دەوێ برۆ قورعان بخوێنەوە، فەرموودەکانی خۆشەویست بخوێنەوە کە لەسەر دەرگەی کابە هەڵکەندراون . »

ئیمام شامیل بەم قسانە گۆرانی لە داغستان قەدەغە کرد • ژن بـە گەسكو پیاو بە قەمچی سزا دەدرا • فەرمان فەرمانە • لەوان ساڵاندا زۆر گۆرانیبێژ تامی قەمچیان چەشت •

بەڵام کێ دەتوانێ دەنگی گۆرانی کپ بکا ؟ لەوانەیە گۆرانیبێژ سزا بدرێ ، بەڵام گۆرانی ــ نەء زۆر بەردەکێل دەبینین خەڵکی لە ژێر نێژراوە ، بەڵام کێ بەردەکێلی گۆرانی دیوە ؟

لەسەر بەردەکێلێك خوێندمەوە نووسرا بوو : « ئەمە مرد • خەڵك ئێستاش دەمرن • لە دوارۆژیش دەمـرن • » دەتوانـین لە بـارەی گۆرانیەوە بڵێین :

« نەمردوە ، ئێستا نامرێ ، لە دوارۆژیش نامـرێ • » لـەو رۆژانەی خەبات‌و تێکۆشاندا ، چ ماوە بە گۆرانی نەکرا بێ ؟ بـــەڵام گۆرانیەکان نەك هــەر ماون‌و پێمــان گــەیشتوون بەڵـکو بۆ گاڵتەی چارەنووس ، بە « گۆرانی‌یەکانی شامیل » ناسراون •

ئەدی گۆرانی دایکی شامیل ؟

دوژمن گوندی «ئەخولگۆ»ی داگیر کرد • ئەو شەڕە زۆر باڵەوانی خوڵقاند بەڵام هەموویان لە شەڕگەدا گیرسانەوە • ئەو برینداران‌ـــەی دەستیان نەدا خۆیان فڕێدایە ناو قۆیسۆی ئاڤاری • خوشکی شامیـل بە خۆ‌و بە منداڵەکانی لەگەڵ ئابلوقەدراوەکاندا بوو • لەم کاتە سەخـت‌و ناخۆشەدا ئیمامی شەکەت‌و بریندارچوەوە گوندی « گمری » خۆیان • هێشتا جڵەوی ئەسپیان لە دەست وەرنەگرتبوو کە گۆرانیەك یان بڵێین سەردووڵکەیەکی کەوتە بەر گوێ :

**بگرین ، دێنشینە چیاییەکان ،**
**بۆ مردوان بگرین‌و پێیان هەڵبڵێین •**

**دوژمن قەڵای ئەخولگۆی گرتومو**
**کەس بە زیندوویی دەرباز نەبوە •**

گۆرانیەکە ناوی هەموو شەهیدەکانی هێنا بوو • داوای دەکرد کە بەرگی شینو تازیە بپۆشن • دەڵێن ، لە چیاکاندا کە کانیەکان ئـەم هەواڵە جەرگبڕەیان بیست هەموو چکیان کرد • دەپاڕانەوە خوا چیایان چەپاڵە بدا • ئیمان بپارێزێ • دەست بە باڵی جەمالەددینی بیستو هەشت ساڵەی کوڕی شامیلەوە بگرێ کە لە سانت پترسبۆرگ مەروونەی بـەر دەستی قڕال بوو •

شامیل لەسەر بەردێك دانیشت • پەنجەی لە ڕدێنی بۆزو خەناوی وەرداو بە توندی تەماشای پیاوەکانی دەوروبەری خۆی کرد ، گوتی :

« یونس ، ئەم گۆرانیە چەند دێرە ؟ »

« سەدو دوو دێرە ، ئیمام • »

« بزانە کێ ئەم گۆرانیەی داناوە ، سەد قامچی لێ دە • دووی بۆ من بێلەوە • »

مریدەکە یەکسەر قامچی ڕاکێشا •

« کێ ئەو گۆرانیەی داناوە ؟ »

هەموو قوڕقاپیان کرد •

« دەڵێم ، کێ ئەو گۆرانیەی داناوە ؟ »

ئیمام دایکی خەمبارو پشت کۆماوی هاتـە لا • گەسکێـکی بـە دەستەوە بوو :

ڕۆڵە ، ئەو گۆرانیە من داماوە • ئەمڕۆ ، لـە ماڵی ئێمە تازیمانەیە ، هانێ ئەم گەسکەو فەرمانی خۆت بە جێ بێنە •

ئیمام نەختێ داما • ئینجا گەسکەکەی لـە دەست دایکی دەرهێنـاو

بە دیواری هەڵپەسارد : «دایە ، تۆ بڕۆوە ماڵێ ! »

دایکە سەیری کوڕەکەی کردو بایداوەو ڕۆیشت • هەر کە لە کۆڵانێ بزر بوو ، شامیل شیری داکەند ، پشتێنی کردەوەو چاکەتی فڕێ دا •

« دایکم نابێ لێدان بخوا ، من کە شامیلی کوڕی ئەوم سزای تاوانەکەی دەکێشم • »

تا کەمەر خۆی ڕووت کردەوە • لەسەر سەکۆیەك ڕاکشاو بە موریدەکەی گوت :

« بۆ قامچیت وەلا نا ؟ دەری بێنەو چیت پێ دەڵێم وا بکە • »

مورید دوودڵ بوو • ئیمام ڕووی گرژ کرد • موریدەکە لە هەموو کەس باشتر دەیزانی ئەم ڕووگرژیە چی بە دواوەیە •

کەوتە دارکاری کردنی ئیمام ، بەڵام بە هێدی لێی دەدا ، لە باتی لێدان هەر پێی دا دەهێنا • شامیل قیتبووەوەو نەڕاندی •

« لە جێی من ڕاکشێ • »

مورید بە ڕووتی لەسەر سەکۆکە ڕاکشا •

شامیل دەستی دا قامچیو سێ قامچی توندی لێدا • کابرا پشتی هەموو شووی بەست •

« لێدان ئاوهایە ـ تێگەیشتی ؟ ئێستا دەست پێکە ، نەکەی ڕەخاوەتیم پێ بکەی ، ها • »

مورید کەوتە دارکاری شامیلو دەیژمارد :

« بیستو هەشت ، بیستو نۆ ••• »

« نەء ، تازە بوو بە بیستو حەفت ، باز نەدەی ! »

کابرا ئارەقەی بە ڕوودا هاتە خوارێ ، بە قۆڵی چەپە سڕیەوە • پشتی ئیمام وەك ڕەوەزە شاخێك وا بوو ڕێگای لێك تیەڕیوی تێدا بێ ، وەك تەلانێك وا بوو کە ڕەوە ئەسپێك پێشێلیان کرد بێ •

دارکـــاری تەواو بوو • مورید لاکەوتو هـــەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا • شامیل جلی کردەوە بەروچەکی لە خۆی دا • ئینجا ڕووی کردە ئەوانەی دەوروبەریو گوتی : « چاینە ئیمە دەبێ شەڕ بـکەین • هیچ وەختـــی گۆرانی گوتنو هەقایەت گێڕانەوەمان نیە • با دوژمـــن گۆرانیمان دەرهەق بلێن • بــــە شمشیر فێری گۆرانیان دەکـــەین • فرمێسکتـــان بسڕنەوە ، چەکتان بسوون • ئەخولگۆمان لە دەست چــوو بەڵام داغستان ماوەو شـــەڕ هێشتا بەردەوامە • »

داغستان بیست و پێنج ساڵیتر جەنـگا • لــە دوا شەڕدا گونیب گیرا • لە گەرمەی شەڕی گونیبدا ، کە چەند ڕۆژێـکی خایاند ، ئیمـــام لـــە مزگەوت نوێژی دەکرد •

فاتیمەی ژنی گـــەورەی ئیمـــام گوتی : « داغستان قەت بەدبەختی وای نەدیوە ! »

« سەهووی ، فاتیمە ! داغستان پێشتر بەدبەختیەکی تری وای دیوە• »

« کامـــە ؟ »

« ئەوەی کە من ژنێـکی وەکو تۆم هەبوو ،چووم (شواینە)م بەسەر هێنـــای • »

ئیمام پێ کەنی • مریدە بریندارەکانی ، کە لە مزگەوت ڕاکشابوون لەگەڵی پێکەنین • داغستان کـــە بۆ یەکەم جار گوێی لـــە پێـکەنینی ئیمام بوو دەتگوت هەمووی پێدەکەنێ •

ئیمام لەم ساتە هەرە سەختەی داغستاندا پێ‌کەنی ، کە ئەو هەموو شتەی بە شانازیەوە دەستی خستبوو ، هەرەسی دەهێنا • چەند ساتێ پێش دیل بوونی پێکەنی • •

کت‌وپڕ ، شامیل هەیبەتی گرت • هەر سێ ژنەکەی لەسەر بەردێکی گونیب داناو پێی گوتن :

« ئەو گۆرانیەم بۆ بڵێن کە دایکی ڕەحمەتیم داینا بوو • • »

فاتیمەو نەفیسەو شوانە پێکەوە هەڵیان کردە گۆرانی :

**بگرین ، دێ‌نشینە چیاییەکان ،**
**بۆ مردوان بگرین‌و پێیان هەڵبلێین •••**

دوا ووشەی گۆرانیەکە بڕایەوە • مانگ هەڵات • ئیمام پەست بوو : «دووبارەی بکەنەوە • • »

دیسان فاتیمەو نەفیسەو شوانە گۆرانیەکەیان گوت • ئەمجارەیان گۆرانیەکە دوورتر ڕۆیشت • چیای ژێر تریفەی مانگ‌و شۆڕە بی‌و دارخۆخەکانی گونیب گوێیان لێ بوو •

شامیل هاواری کرد : «سێ بارەی بکەنەوە • • »

ئەمجارە گۆرانیەکە دوورتر فڕی • گوندە سووتاوەکانی نزیك گونیب ، گوندە کپەکانی ناو شاخە دوورەکان ، هەموو موریدە شەهید بوەکانی ئیمام لە ناو گۆڕ گوێیان لێ بوو • لەگەڵ گەردوگۆلی بەیانی دیسان گرمەی شەڕ ، دوا شەڕ دەستی پێ کرد • کە دەنگی چەك نەما ، گۆرانی کپ بوەوە •

دوژمن بە سەربەرزی لەگەڵ ئیمام جولانەوە • چەك‌و ئەسپیان دایەوە ، ژنیان دایەوە ، بەڵام داغستانیان نەدایەوە • هەڵیان دا بۆ باکوورە

داغستان تەنیا گۆرانی پیرە دایکی شامیلی بۆ مایەوە • یەکەم جار هەر سێ ژنی شامیل گۆرانیەکەیان بۆ دیلی سەربەرز چڕی ، پاشان مایەوە نەفیسەو شواینە ؛ پاشتریش کە شواینە پاش هەوێکانی ما بوو ، لە بیابانی دووری عارەبیدا گۆرانیەکەی بۆ شامیلی کۆچکردوو چڕی – دوا ژنو دوا گۆرانی •

خەڵك کە دەهاتنە سەر باسی شواینە ، باوکم دەیگوت : «جوانترین ئافرەتی ماڵی شامیل بوو • یەکەم خۆشەویستو دوا ژنی ئیمام بوو • ئیمام وەکو هەموو چیایەك بە پێی ڕەوشتی خۆمان ژنی دەهێنا • بەڵام ئەمەیان خەڵاتێکی ڕێکەوت بوو • کاتێ ئەخفەردیل محەمەدی نایبی هەرە ئازا هەڵمەتی بردە سەر (مۆزدۆك) کچە بازرگانێکی ئەرمەنی بە دیل گرت (ئانا)ی نازداری بە یەخسیر گرت• (ئانا) تەنیا چەند ڕۆژێکی ما بوو بۆ دەزگیرانەکەی بگوازرێتەوە • مورید ئەم دەسکەوتەی لە کەپەنك پێچاو بۆ کۆشکی ئیمامی برد • کە لە سەریان هەڵدایەوە ، ئیمام چ ببینێ باشە ؟ دوو چاوی گەورەو شینی وەك ئاسمانی داغستان • ئەو چاوانە ، یەکەو ڕاست ، بێ ترس لە چاوی ئیمام چەقین • بە پێڵاوی قاڵتاغو چەكو ڕدێنو چاوەکانی ئیمامدا گەڕان • ئەو کچە ئەرمەنیە ئیمامی وا دی کە نە گەنجەو نە قۆز بەڵام شتێکی وای لە نیگای چاوەکاندا بوو کچەکەی سەراسیمە کرد • کچە ، لەگەڵ هێزو توندیدا نەرمیو بەزەییشی لەو چاوانەدا بینی • چاویان بە چاوی یەك کەوت • جەنگاوەری نەبەرد لە دڵەوە هەستی بە بێ هێزی یەك کرد • ئەمەی پێ شتێکی سەیر بوو و ترسێکی کەوتە دڵەوە •

ئینجا فەرمانی دا :

« ئەم کچەت لە کوێ هێناوە ، ببەوە ئەوێ • »

« بۆچی ئیمام ؟ کچێکی جوانە ، هەموو شتێکی هەر لە خۆی دێ .»

« من خۆم دەزانم ! ئەسپەکەت زین کە . »

« بەرامبەر بەم کچە ، داوای چ فدیەیەك بکەم . »

« هیچ ، هەر وا ، بێ فدیە بیدەوە . »

ئەخفەردیل محەمەد سەری سوڕما . شامیل قەت بێ فدیە دیلی بەرنەداوە . بەڵام ئەوە ئیمامە ، پیلەکەی لەگەڵ ناکرێ . »

شامیل بە کچە بەخسیرەکەی گوت : « وا دەتنێرمەوە بۆ باوانت . کەیفیان پێ دێ . پێیان بڵێ شامیل جەردە نیە . »

کە قسەی شامیلیان لە (ئانا) گەیاند . ئانا بە سەرسامی تەماشای شامیلی کرد . لەو بڕوایەدا بوون کچە ئەوەندەی هەوەس بەو قسەیە دێ نەبێتەوە .

دوبارە پێیان گوت : «ئیمام ئەو ڕوداوەی زۆر لە دڵ گرانە ، بە بێ فدیە دەتنێرێتەوە . »

ئینجا کچە نەشمیلەکە ڕوی کردە شامیل‌و گوتی :

« سەرۆکی داغستان ، کەس منی بە خورتی نەهێناوە ، من خۆم بۆ تۆ هاتووم ، هاتووم ببم بە بەندەی تۆ . »

« چۆن ؟ بۆچی ؟ »

« هاتم ئەو پاڵەوانە ببینم کە هەموو قەوقاس‌و سەراپای دونیا باسی دەکا . چ دەکەی بکە ، بەڵام من بۆ هیچ شتێ واز لەو دیلایەتیە ناهێنم کە خۆم هەڵمبژاردوە ، هەنگاوێك لێرە دوور ناکەومەوە . »

« نەخێر ، وا باشە بچیتەوە . »

« شامیل ، ئەوە تۆی قسەی وا دەکەی ، کە هەموو کەس بە پیاوی ئازات دەزانن ؟ »

« فەرمانی خوایە ! »

« خوا فەرمانی وا نادا . »

« خوای من و خوای تۆ فەرمانیان جودایە . »

« سەرۆکی داغستان ، من دیلی تۆم ، کۆیلەو بەندەی تۆم ، لەمەولا خوای تۆ دەبێ بە خوای من . لە دەوری منداڵیەوە گۆرانیم لەبارەی تۆوە بیستوە ؛ ئیستاش گۆرانیەکم لەبیر ماوە ، لە ناخی دڵم چەسپاوە .

ئەو کچە ئەرمەنیە هەڵی‌کردە گۆرانی ، گۆرانیەکی خۆشی بە زمانی بیانی چڕی . مانگ لە پەنا شاخی بەرزەوە هەڵات و کچە ئەرمەنیەکە هەر گۆرانی لەبارەی شامیلەوە چڕی .

موریدەکە وەزووری کەوت :

« ئیمام ، ئەسپ زین کراوە ، کچەکە ببەم ؟ »

« لێی‌گەڕێ ، با گۆرانیەکەی تەواو بکا ، ئەگەر بە قەد هەموو ژیانیشی بخایەنێ دەبێ تەواوی بکا . »

پاش چەند ڕۆژێ مقۆمقۆ بە داغستاندا بڵاو بوەوە . خەڵك چرپاندیە گوێی خەڵك ، گوند چرپاندیە گوێی‌گوند چرپەی ئەهامەت:

« بیستوتە ، شامیل ژنێکی‌تری هێناوە . »

« ئیمامی ئیمانداری ڕاستەقینەمان کچە ئەرمەنیەکی هێناوە . »

« گاور مەندیلی ئیمام دەشوا ، ئیمام لە باتی نوێژ گوێ لە گۆرانی ژنەکەی دەگرێ . »

بەم جۆرە هەموو داغستان چرپاندی . چرپەچرپەکە ڕاست

دەرچوو • ئیمام سێیەم ژنی هێنا • ژنە بوو بە ئیسلام و بەرگی شاخانی کردە بەرو ناوێکی ئاڤاریان لێ نا • (ئانا) بوو بە (شواینە) • خۆشترین خواردنی ئیمام ئەوە بوو کـە ئەو ژنەی بۆی لێ دەنا • نەرمترین نوێنی ئەوە بوو ئەم بۆی ڕادەخست • ژوورەکـەی ئـەم لـە هەموو ژووران ڕوناکترو گەرمتر بوو • قسەی لـە هەموان خۆشتر بوو • ڕووی گرژی ئیمام نەرمو خـاو بوەوە ، لـە جـاران بـە ڕەحمترو میهرەبانتری لێ هـات • زۆر جار قاسیدی باوکی کچە لە (مۆزدۆك)ەوە دەهاتن تـکای باوکیان بە شامیل دەگـەیاند کـە شواینە بنێرێتەوە و بخوازی مـالی دونیایە • هـەموو جارێ شامیل بە شواینەی دەگوت بەلام شواینە هەموو جارێ یەك وەلامی دەدایەوە :

« ئیمام ، تۆ مێـردی منی ، حـەز دەکەی سـەرم ببڕە ، بەلام ناچمـەوە • »

ئیمـام وەلامەکەی دەدایەوە دەست قاسیدەکانی مۆزدۆك • پاشـان برای شواینە هـات • ئیمام بە خێر هاتنێـکی گـەرمی کـردو ڕێیدا شواینـە ببینێو قسەی لەگەل بـکا • خوشكو برا دوو سەعات بە تەنێ پێکەوە بوون • برا باسی خەفەتی باوکیو فرمێسکی دایـکی بۆ خوشکی کرد ، باسی ژیانی خۆشی مالەوەی بۆ کرد • باسی دەزگیرانی گـەنجی بۆ کرد کـە هێشتا هـەر خۆشی دەوێو بە تەمایەتی • بێ هوودە بوو • شواینە نەهاتە ڕایێو برای بە نائومێدی گەڕایەوە •

فاتیمەی ژنـە گـەورەی ئیمام ، دەرفەتێکی باشی قسەکردنی بۆ ڕەخسـا ، بە مێردی گوت :

« ئیمام ، وا خوێن دەڕژێ ، زەلام دەکوژرێ ، تۆ چۆن دەتوانی گوێ لە گۆرانی شواینە ڕابـگری کە پێت وەکو ویردو نوێژ وایـە ؟

تۆ خۆت گۆرانی گوتنت لە داغستان قەدەغـە کردوە • بـگرە گۆرانی دایـکی خۆیشت ڕەت کردەوە • »

شامیل گوتی : « فاتیمـە ، گۆرانی شواینە ، ئەو گۆرانیەیە کـە دوژمن لـە بارەی ئێمـەوە گوتوویانە ئەگـەر لێ بـگەڕابام گۆرانی فرمێسکاوی بڵاوبێتەوە ، دوژمـن دەیانبیستو بە جۆرێـکی دی تێمان دەگەیشتن • ئەو حەلە ڕووم هەڵنەدەهێنا تەماشای چاوی ئەو دایـکانە بـکەم کـە کوڕیان لەگـەڵ مندا بووو کوژران • بەڵام با دوژمنمان لـە بارەی ئێمەوە گۆرانی بڵێن • بە شادی گوێیـان لێ دەگرم • داوا لـە خەڵکیش دەکەم گوێیان‌لێ بـگرن •

فاتیمـە لەبەر ئەوە هەراسان نەبو چونـکە ئیمام گوێی دەدایـە گۆرانی ژنە بچووکەکەی ؟ بەڵـکو لەبەر ئـەوە هەراسان بوو چونکە هێندە ڕووی نەدەدایە ژنە گەورەکانی • زۆری پێ نەچوو :

« ڕۆژێـکیان بە ئیمامیـان گوت قراڵی زۆردار حـەز دەکـا جەمالەددینی کوڕی ڕەوانە بـکاتەوە کـە لە سانت پترسبۆرگ ، لـە کۆلێژی سەربازی (کادێت کۆرپس) دەیخوێند بەو مەرجـەی شامیلیش شواینە ئازاد بـکا • هەڵوێستێکی سەخت بوو • ئیمام ڕازی نەبوو بـەڵام لای کـەسی نەدرکاند کـە داوای شتی وای لێ کراوە لەگەڵ ئەمەشـدا فاتیمە پێی زانی ••• خۆی گەیاندە هەوێی بچووکی :

« شواینە ، هەرێم بدێ ، قسەیەکت لـە کن دەکەم لە خـوا زیاتر کەس پێی‌نەزانێ • »

« هـەرێت دەدەمێ • »

« خۆت لە من باشتر دەزانی شامیل بەم دوایە خەوی لێ حـەرام بوە • زۆر هەراسانو بە ئازارە • »

« دەزانم ، فاتیمە ، دەزانم • »

« نازانی هۆی چیە ؟ »

« نەخێر » •

« ئەمن دەزانم • ئەگەر مەیلت لەسەر بێ دەرمانی بە دەستی تۆیە • »

« پێم بڵێ چیە فاتیمە ، پێم بڵێ گیانەکەم • »

« بێ گومان باسی جەماڵەددینت بیستوە ، کە جگەرگۆشەی من و شامیلە • »

« بەڵێ ، بیستوومە » •

« گەڕانەوەی بۆ لامان بە تۆوە بەسراوە • هەڵبەت تۆ دایکی خۆت لە بیرە • منیش دایکم • دەساڵە کوڕی خۆمم نەدیوە • فریام کەوە • بۆ خاتری من نا ، بۆ خاتری ئیمام • »

« ئەوەی لە دەستم بێ بۆ شامیل تەخسیری ناکەم ، بەڵام من چیم لە دەست دێ ؟ ! »

« ئەگەر تۆ بچیتەوە کن دایك و باوکت قراڵ جەماڵەددینمان بۆ ڕەوانە دەکاتەوە • کوڕەکەم دەربازکە • خوا پاداشتت دەداتەوە ، هەتاهەتایە جێگەت بەهەشت دەبێ • تکام بگرە شواینە • »

« شواینە فرمێسکی لە چاوان قەتیس ما • »

« ئەوەی لە دەستم بێ دەیکەم ، فاتیمە ، دەیکەم • »

شواینە لە ژووری خۆی کەوتە سەر مافوور • زۆر گریا • پاشان هەڵی کردە گۆرانی خەم • شامیل هاتە ژوورەوە •

« شواینە ، چیتە ؟ بۆ وا هەراسان بووی ؟ »

« ئیمام ، ڕێم بدە بچمەوە لای دایكو باوكی خۆم • »

« بۆ ؟ »

« دەبێ بچمەوە • »

« ئێ ، ئاخر ، بۆ ؟ چ بوە ؟ تۆ چ دەڵێی ؟ تۆ خۆت ڕازی نەبووی بیچیتەوە ، ئێستاش ڕێت نادەم بچی • »

« شامیل ، بمنێرەوە ، هیچ چارەی تو نیە • »

« دیارە نەخۆشی ! »

« دەمەوێ تۆ بە دیداری جەمالەددین شاد بی • »

« ئێ ، ئەوەیە مەسەلە !! لێ ناگەڕێم بچیتەوە شواینە • ئەگەر کوڕم وا بکەوێتەوە بەر دەست کە سەودای پێ لەگەڵ ژنی خۆم بکەم ، با هەتا هەتایە بێ کوڕ بم • ئەگەر کوڕ کوڕی من بێ خۆی ڕێگای خۆی دەکاتەوەو دەگەڕێتەوە لای دایکیو وولاتی خۆی • بەلام بەو ڕێگایەی تۆ داتناوە ناگەمە کوڕەکەم • خۆم ڕێگایەکی بۆ دەدۆزمەوە کە لە منو لەویش بوەشێتەوە • ئەسپەکەم بۆ بێنە • »

شواینە ئەسپی ڕاکێشا فەنتەرەو قامچی لە سنگ کردەوەو دایە دەست شامیل •

لە هەموو هەڵمەتو هەموو گەڕانێك ، لە داغستان ، لە سانت پترسبۆرگ ، لە کالوگە ، لە عارەبستان ، شامیل تا مرد شواینەی ژنی هەر لە تەکی بوو ، لێی دوور نەدەکەوتەوە • تا ئەمرۆش ئەفسانەکان باسی ئەو ژنە جوانە دەکەن • دواجار یاریدەی گەڕانەی جەمالەددینی دا بۆ کن باوکی ـ بەلام ئەمەش چیرۆکێکی ترە •



# گۆرانی جەمالەددین

**ئەگەر گۆرانی لە داغستان نەبایە کەس وەکو ئێستا نەیدەناسی ٠ داغستان وەکو بزنەکێویەکی ویڵ وا بوو ، گۆرانی لە توولە ڕێی شاخاوی ڕێنمایی کردین‌و بە دونیای گـــەورەی گـــەیاندین‌و برادەری تۆ پەیدا کردین ٠**



جەمالەددینی هەشت ساڵ مەروونەی بەردەستی دوژمن گـەڕایەوە داغستان ٠ گەنجێـکی بیست‌و چـوار سـاڵی ٠ شامیل فێڵ‌و تەقەللاو خۆراگرتنێکی زۆری خستـە کـار تا کوڕەکـەی لای قڕالی زۆردار هێنایەوە ٠ شامیل زۆر دیلی ڕووسی خستە مەیدانی ئالوگۆڕەوە بەلام قڕاڵ بە گۆڕینەوە ڕازی نەبوو ٠ دەیەویست لە سانت پترسبۆرگ ئەو چیایە گەنجەی هـەر لـەبەر دەستدا بێ ٠ هـەڕەشەی کوشتنی لێدەکردو دەیەویست شامیل ناچار بکا دەست لە خەباتی بێ‌بەر بەربدا ٠ بەلام شامیل

گوێی بەم هەڕەشانە نەبزووت • نامەیەکی بۆ هات کە بە ناوی کوڕەکەی نووسرابوو ــ لەوانەیشە کوڕە خۆی نووسیبێتی ــ نووسیبووی قڕال بەهێزەو خۆڕاگرتن بێسوودەو هیچ ئومێدێك نیە • داغستان خوێنی لەبەر دەڕواو بەرگری لەمەودوای لە کەسەرو ماڵوێرانی چیتری بە بەرەوە نیە • بەڵام ئیمامی لاسار بڕوای بە هیچ نەکرد •

حاجی موراد لەگەڵ هەندێ موریدا خۆیان دایە پاڵ رووسەکان بەڵام خێزانی لە شاخان مایەوە ــ دایکی ، ژنی ، خوشکی ، کوڕی ••• بێگومان هەموویان لەبەر دەستی شامیلدا بوون • شامیل بۆ حاجی موورادی نووسی :

« ئەگەر نەگەڕێیتەوە (بۆلچی)ی کوڕت لەسەری دەدرێو سەرباز دایكو ژنو خوشكت هەتك دەکەن • »

حاجی موورادیش یەك بە باری خۆی لە ڕێگاو دەرەتانێك دەگەڕا خاوخێزانەکەی بێ دەرباز بکاتو دەستی بێ شەڕ لەگەڵ ئیمامی لامل بکا • لەو سەردەمەدا دەیگوت : « من بە پەتێك بەسراومەتەوە سەرەکەی لە مست شامیلە • » مەسەلەی فدیە نابێ • کە شامیل زانی کۆنە مریدەکەی بە تەمایە فدیە لە باتی خێزانەکەی بدا ، گوتی « دیارە حاجی موراد شێت بوە • »

بەڵام ئەگەر شامیل سەرەپەتێکی حاجی موورادی بەدەستەوە بوو ، حاجی موورادیش پەتێکی بە دەستەوە بوو ئەو سەرەکەی بە دڵی شامیلەوە بوو • پەتەکە جەمالەددین بوو • حاجی موراد چووە لای « فۆرۆنتسۆف »و تکای لێکرد : « وا بکە قڕال جەمالەددین بۆ باوکی بنێرێتەوە بەڵکو شامیل خێزانەکەم ئازاد بکا • تا ئەوان لەبەر دەستی ئیمامدا بن شەڕ کردنی من وەکو ئەوە وایە کە دایكو کوڕو ژنو هەموو

خاوخێزانەکەم بە دەستی خۆم بکوژم ٠ »

«فۆرۆنتسۆف» بۆ قڕالی نووسیو قڕال بڕیاری ئاڵوگۆڕی دا ٠ بۆ شامیلیان نووسی : «ئەگەر خاوخێزانی حاجی مورادبەر بدەی کوڕەکەت ڕەوانە دەکەینەوە ٠ »

هەڵوێستێکی ناخۆش بوو ٠ سێ شەو نە شامیلو نە خێزانەکەی خەویان لێنەکەوت ٠ بۆ ڕۆژی چوارەم ئیمام ناردیە دوو بولچی/ی کوڕی حاجی موراد :

« تۆ کوڕی حاجی مورادی ؟ »

« بەڵێ ئیمام ، کوڕی حاجی مورادم ٠ »

« دەزانی حاجی چی کردوە ؟ »

« بەڵێ دەزانم ، ئیمام ٠ »

« ڕات بەم ئیشە چیە ؟ »

« نازانم بڵێم چی ؟ »

« حەز دەکەی چاوت پێ بکەوێ ؟ »

« زۆر ، زۆر ٠ »

« ڕێگەتان دەدەم بە خۆتو دایکت و داپیرتو هەموو خێزانەکەتان بچنە لای ٠ »

« نەخێر ، ئیمام ، ئەمن ناچم ٠ شوێنی من داغستانەو ئەویش لە داغستان نەماوە ٠ »

« دەبێ بچی بولچی ، فەرمانی منە ٠ »

« قەت ناچم ، ئیمام ٠ لێرە لەسەر ئەم خاکە بمکوژە باشترە ٠ »

« دەبینم وەکو باوکت سەرکێشی دەکەی !؟ »

« ئیمە هەموو فەرمانبەرداری تۆین ، ئیمام • تەنیا ئەوەندە هەیە زۆرم لێ مەکە بچمە ئەوێ • بمنێرە شەڕ باشترە ، سووم لە ژیانی خۆم نیە • »

« دژی باوکت دەجەنگی ؟ »

« دژی دوژمنان • »

ئەو ڕۆژە شامیل خەنجەرێکی هەرە چاکی خۆی بە بولچی بەخشی •

بەم جۆرە ئالوگوڕەکە سەری نەگرت • نە کوڕی حاجی موراد چوە لای باوکی و نە جەمالەددینیش گەڕایەوە لای ئیمام •

شامیل هەنگاوێکی تری نا • قازی محەمەدی کوڕی نارد بە سەر قەلەمڕەوی میر تسیناندلی جورجیای دادا • لەم پەلامارەدا خاتوو چاڤچاڤادزێ و خاتوو ئوربیلیانێ و مامانێکی فەڕەنسی یەخسیر کران • موریدەکان (ئیکاتەرینا چاڤچاڤادزێ)ی خوشکی (نینا گریبۆیەدۆڤا )[1] یان بینی چوو بوە ناو کەلەنە داربەڕوویەك ، ڕایانکێشا دەرێ •

ئەو حەلە ئیمام توانی مەرجی خۆی بەسەر قڕالدا بسەپێنێ ؛ چونکە قڕاڵ ئامادە بوو لە پێناوی ڕزگارکردنی خاتوونە جۆرجی یەکان هەموو شتێ بەخت بکا • دوا قسەی شامیل ئەوە بوو : «تەنیا بە ناردنەوەی کوڕەکەم خاتوونەکانتان دەدەمەوە • »

ڕۆژی خۆی هات • ڕوبارێکی بەرین بوو • خاتوونەکان لەسەر کەنارێك ڕاوەستابوون چاوەڕێی ئازادیان دەکرد • کوڕی ئیمامیش هات گەیشتە کەناری ئەوبەر ، ئەفسەری ڕووسی لەگەڵدا بوون • شامیل بە سواری ئەسپ هاتە دەم ڕوبار •تەماشای زەلامەکانی ئەوبەری ڕوباری

(١) ژنی ئەلیکساندەر گرتیۆیەدۆڤ (١٧٩٥ـ١٨٢٩)ی نووسەری ناوداری ڕووسیە •

کرد بەڵکو جەمالەددینیان لەناو بدۆزێتەوە • لە مێژ بوو چاوی پێ نەکەوتبوو • ئاخۆ دەبێ کوڕو باب یەکتر بناسنەوە ؟!

ئەفسەرێکی ڕەقەڵەی ڕووسیان پێشانی ئیمام دا کە چاکەتێکی گەورەی بە کەتافەی لەبەر بوو ، قسەی لەگەڵ ئەفسەرە ڕووسەکانی‌دی دەکردو دەیگرتنە باوەش‌و مالاّوایی لێ‌دەکردن • پاشان چوە لای کچێکی عازەب ، کە نەختێ بەولا وە وەستا بوو ، دەستی ماچ کرد • هەر ناو بە ناویش سەرنجێکی لە باوکی دەدا کە بە سواری ئەسپێکی سپی وەستا بوو •

ئیمام چاوی لەسەر کوڕەکە هەڵنەدەگۆزی‌و دەیەویست هەموو هەڵس‌و کەوتێکی بەدی بکا ، پرسی :

« ئەوە کوڕەکەمە ؟ »

« بەڵێ ، ئەوە جەمالەددینە ! »

« چاکەتێکی چەرکەسی‌و چەکێکی خۆمانەی بۆ ببەنە ئەو بەر • تازە ئیتر ئەفسەری قڕاڵ نیە • بەڵکو جەنگاوەرێکی داغستانە • ئەو بەرگەی بەری فڕێ دەنە ناو ڕوبار نەوەك لێ‌ناگەڕێم لێم نزیك بێتەوە •»

جەمالەددین بە گوێی باوکی کردو جل‌و بەرگی خۆی گۆڕی • چەکی چیایی لەسەر چاکەتی چیایی لە خۆی دا • بەلاّم دڵ‌و سەری جەمالەددین لە ژێر چاکەت‌و تەپڵەدا هەروەکو خۆیان مانەوە • نەیتوانی دڵ‌و سەری بگۆڕێ •

ئەنجام ، جەمالەددین لە ڕوبار پەڕیەوەو چوە خزمەت باوکی •

« ڕۆڵەی ئازیزم ! »

« باوکە ! »

ئەسپێکیان دایـــە جەمالەددین • کوڕو باوك تا (فیدێنۆ) پێـــکەوە ڕۆیشتن • باوك جار جار لە کوڕی دەپرسی :

« پێم بڵێ جەمالەددین ، ئەم شوێنەت دێتەوە بیر ؟ ئـەم شاخانەت لەیاد ماوە ؟ گوندی (گمری) مانت لەبیرە ؟ ئەخولگۆت لەیاد ماوە ؟ »

« بابە ، ئەو کاتە من زۆر بچووك بووم • »

« پێم بڵێ لانی کەم دوعایەکت بۆ داغستان کردوە ؟ خۆ نوێژت لە بیر نەکردوە ؟ سوورەتی قورعانت لە بیر نەکردوە ؟ »

جەمالەددین بە گرانی وەڵامی دایەوە : « ئەو جێگەی من لێبووم قورعانی لێنەبوو • »

« چ ؟ قەت کڕنۆشت بۆ خوای گـەورەو بە دەستەڵات نەبردوە ؟ دوعات نەخوێندوە ؟ ڕۆژیت نەگرتوە ؟ نوێژت نەکردوە ؟ »

« بابە ، قسەیەکی لێدەکەین • »
بەڵام شامیل ئەسپی دەنگ داو هاژوای •

بۆ بەیانی باشی ، ئیمام ناردیە شوێن کوڕەکەی : «جەمالەددین ، سەیری ڕۆژ بکە سەر لە بەنا شاخان دەردێنێ ، جوان نیە ؟ »

« با ، زۆر جوانە ، بابە • »

« ئامادەی ژیانت لە پێناوی ئەم شاخانە ، لە پێناوی ئەم ڕۆژە بەخت کـــەی ؟ »

« بابە ، قسەیەکی لێ دەکەین • »
« دەقسەکەت بکە ، دەی ! »

« بابە ، ڕووسیا گەورەیە ، دەوڵەمەندە ، بە دەستەڵاتە ، بۆچـــی

ئێمە داکۆکی لە هەژاریی چیاکانمان ، لە پیس و پلۆخیمان ، لە کوێرەوەریمان ، لە نەزانیمان بکەین ؟ ڕووسیا ئەدەبێکی گەورەو مۆسیقایەکی گەورەو زمانێکی گەورەی هەیە • ئەمانەمان بۆ دێ • داغستان قازانجی تەنیا لە خۆدانە پاڵ ڕووسیا دایە • وەختی ئەوە هاتوە روو بە رووی راستی بین و چەك دابنێین و برینمان ساڕێژ بکەین • بڕوام پێ بکە ، ئەمن لە تۆ کەمتر داغستانم خۆش ناوێ • »

« جەمالەددین !! »

« بابە ! لەداغستاندا ، گوند نیە بەلانی کەمەوە جارێك نەسووتا بێ ، چیا نیە زامدار نەکرا بێ ، بەرد نیە بە خوێن سوور نەکرا بێ • »

« دیارە ئامادە نی یان ناتوانی بەرگری لەم شاخە بریندارانە بکەی ؟! »

« بابە ! »

من باوکی تۆ نیم ، تۆش کوڕی من نی • مردوو گوێیان لەم قسەیە بێ گۆڕ هەڵدەتەکێنن ، ئەدی منی زیندوو کە گوێم لێ دەبێ چ بکەم ؟ دەبینی چیاکان چۆن ڕەش داگەڕاون ؟

شامیل ناردیە شوێن قەوم و قیلەو خێزان و پیاوە دڵسۆزەکانی :

«گەلۆ ، با پێتان بڵێم کوڕەکەم چ دەڵێ • دەڵێ ڕووسیا گەورەیە • دەڵێ دوژمنمان بەهێزە • دەڵێ وولاتی قڕاڵ فراوانە و ئێمە بێ هوودە دەجەنگین • دەڵێ کاتی ئەوە هاتوە چەك دابنێین و سەر بۆ قڕاڵ شۆڕ بکەین • لەو بڕوایە دا بووم هەر کەسێ نەك قسەی وا بکا بەڵکو هەر بیر لە شتی وا بکاتەوە نایەلم ساتێك لە داغستاندا بمێنێ • ئەمڕۆ وا ئەم قسانەم بیست • لە کوێ ؟ لە ماڵی خۆم • لە چ کەسێ ؟ لە کوڕی

خۆم ! باشــه ، چی لێ بــکەم • چ لەو کەسە بکەم کە قرِاڵ ناردوویە بۆ ئەوەی منو داغستان شەرمەزار بـکا ؟ خۆتان دەزانن چەند جار شـیری دوژمن دڵی منو داغستانی دڕیوە ؟ ئێستاش ئەو شیرەی خۆم دروستم کرد بوو وا قرِال ساوی داوەو لە دڵی چەقاندووم • چ بکەم ؟ »

خاووخێزانەکەی بــە داخو کەسەرەوە گوێیان دایە قسەکـانی شامیل • تەنیا دایـکی جەمالەددین بڕوای نەدەکرد • شامیل ڕووی کردە جەمالەددین :

« تۆ ، هــەی دوژمنی شاخان ، دەبێ بچیتە شوێنێکی وا گوێم لــە دەنگت نەبێ • تۆ بێ باوکی • داغستان داغستانی تۆ نیە • مــن خاتوونە جۆرجیەکانم بە تۆ گۆڕییەوە ، ئەدی تۆ بە کێ بگۆڕمەوە ؟ نازانم چ لە تۆ بــکەم ؟ »

« بابە ، چ لــە کوڕی خۆت دەکەی لێی بــکە • بمــکوژە ، بەڵام نەختێ گوێم لێ ڕابگرە • »

« بەسیەتی ، من هەمیشە فەرمانبەرداری خوا بوویم ، بەڵام ئەمڕۆ گوێدێری ئەویش ناکەم • خوا دەفەرموێ : «دوژمنت بکوژە» • منیش دەڵێم : « ئەوە دوژمن نیە ، کوڕی گومڕامە • » پێی دەڵێم مــن ناتوانم پەنجەی خۆم ببڕمەوە ••• کــەواتە بۆ خۆت بژی بەڵام ئەم خەنجــەرە دانێ • چــەك بۆ ئەو کەسانەیە کە دەست وەکەری دەکەن • »

شامیل کوڕەکەی ڕەوانەی گوندێکی دوور کرد • جەمــال لەوێ وەك گــەڵای وەریو دەژیا • لەبەر بیرو غایەڵەی ناخۆش داوەشا • لەبەر خواردنی خراپو هەوای تووش پووت بوو • دیقی کرد • ئیمــام نـــە گــەرمەی شەڕ بوو • کوڕیشی بە ئاستەم هەناسەی دەهاتو دەچوو •

به تەواوی دەبەری خستبوو • لەو کاتەدا ، بێ ئەوەی ئیمام بێ بزانێ فاتیمە بە دزی چوە سەردانی • هەندێ پەیکە نانی بۆ برد • هەبوو لە شێوەی خەنجەردا بوو ، هەبوو لە شێوەی هەڵۆدا بوو ، هەبوو لە شێوەی شمشیر • هەندێ دارو دووی لەو ناوە هێناو ئاگری لە ئاگردان جۆش دا فاتیمە پەیکەکانی گەرم کردەوەو بە چۆکی خۆی داهێنان‌و خۆڵەمێشی لێ پاك کردنەوە • یەکێکی شکاندو وەکو منداڵێکی ساوا دایە دەست جەمالەددین‌و گوتی :

« دایك ئەگەر مەمکی شیری تێدا نەبێ کۆرپەی شیرەخۆرەی لە شیری بزنە کێوی ڕادێنێ • »

جەمالەددین تەماشای دایکی کرد تاسێك بردیەوە • دەتگوت یەکەمجارە دایکی دەبینێ • یەکسەر ئەو کاتەی هاتەوە یاد کە دایکی جوان‌و جاحێڵ بوو ، ئەویش بچکۆلە بوو ، هەموو جارێ دایکی ئەم پەپکانەی دەدایە • لە تەنیشت لانکی ئەسپ شێوە دادەنیشت‌و لایلایەی بەو گەنجەدا هەڵدەگوت کە بە شیری شێر گەورە کرابووو خەنجەرێکی داری خرابوە ژێر سەرین •

جەمالەددین وەك سەردەمی منداڵی هاواری کرد :

« دایە !! »

فاتیمە گوتی : «جەمالەددین ، کوڕم ، بگەڕێوە لام • »

ئەو حەلە جەمالەددین هەستی کرد کە ئەمە بە ڕاستی دایکیەتی • دایکی لەبەر پەڕەنگی ڕوومردوودا خۆی دەسەر کوڕی نەخۆشی داهێناو لایلایەی بۆ گوت ، هەر وەکو چۆن کە کوڕی کۆرپە بوو لایلایەی وای بۆ دەگوت •

ئیمام به خۆو به مریدەکانی لە جێگایەکی دوور دەجەنـگا ، کەچی لێرە فاتیمەی ژنی گۆرانی ماڵاوایی بۆ نۆبەرەی جوانەمەرگی دەگوت کە لە سەرەمەرەگدا بوو .

جەمالەددین شڵپەی ئاوی ڕوبارێـکی شاخاوی نزیکی هـاتە بـەر گوێ . گۆلکێکی هاتە بەر چاو کە لەبەر دەرگـا لەسـەر قەسـەر پاڵی دابێتەوە . ماڵی خۆیانی لە «گمری» هاتەوە یاد . باوکی هاتەوە یاد . یەکـەم ئەسپی خۆی هاتەوە یاد . دایکی گۆرانی بە «دینگر دانگارچۆ»ی مەشرەبخۆش هەڵـگوت کـە بە داوەباران بە ئاسمان هەڵگەڕا .

**— دینگر دانگارچۆ ، بۆ کوێ دەچی ؟**
**+ دینگر دانـگارچۆ لە دارستان بوو .**
**— دینگر دانـگارچۆ ، بۆ لە دارستان بووی ؟**
**+ دینگر دانـگارچۆ چووبوە داران .**
**— دینگر دانـگارچۆ : بۆ چووبوویتە داران ؟**
**+ بۆ ئەوەی دینـگر دانـگارچۆ خانوو دروست بکا .**
**— دینگر دانـگارچۆ ، خانووت بۆ چیە ؟**
**+ دینگر دانـگارچۆ دەیەوێ ژن بێنێ .**
**— دینگر دانـگارچۆ بۆچ ژن دێنی ؟**
**+ بۆ ئەوەی دینگر دانگارچۆ قارەمانی ببێ .**
**— دینگر دانـگارچۆ قارەمانت بۆچیە ؟**
**— بۆ ئەوەی دینگر دانـگارچۆ شانازی پێوە بکا .**

ئینجا جەمالەددین شاخەکانی وولاتی خۆی لەبەر چاو قیت بوەوە . بەفر دەتوایەوەو سێلاو بەردی بانگەرۆز دەکردەوە ، هەور بە ناو زنجیرە شاخدا پێچی دەخوارد . ئەو داغستانەی لـە دەوروبەری خۆی بینی کە لە وولاتی بێگانان لە بیری کرد بوو . دایکیشی هـەر لە گۆرانی گوتن بەردەوام بوو . هەندێ گۆرانیوای گوت کـە بۆ لە دایك بوونی کوڕ دەگوترێن . هـــەندێ گۆرانی وای گوت کـە لـــە کاتی مردنی کوڕ

دەگوترێن • هەندێ گۆرانی وایش کـە دەڵێ ئەو کاتەی کوڕ دەمرێ گۆرانی لە پاش بە جێ دەمێنێ •

گۆرانی بە شامیل‌و حاجی موڕادو قازی محـەمەدو هـەمزە بەگ‌و خۆچـاری ئازاو پارتو فاتیمـــەو شـکانی نادرشاو بەوانەی چوونە ناو کوورەی شەڕو نەگەڕانەوە ، هەڵگوت •

هەندێ ئاگر لە ئاگرداندا ما بوو • داغستان لەناو ئاگری شـــەڕ بڵێسەی دەدا • ئێستا ئـــەم دوو ئاگرە لــــە ناو چاوی جـەمالەددیندا دەبریسکانەوە • گۆرانی دایـکی هوشیـــاری کردەوەو بزوانـدی • خۆشەویستی کوڕو بابانەی بەرامبەر داغستان واگا هات‌و کڵپەی سەند • بانـگی کردێ بۆ ئەوەی شان بە شانی باوکی بوەستێ •

« دایە ، من تازە گەڕاومەتەوە داغستان ، تازە بە خزمەت باوکم گەیشتووم • چەکەکانم بۆ بێنە • مـــن کوڕی شامیلم • نابێ لەبـــەر کوچکاگر دا بنیشم لێم گەڕێ بچمە ناو تەق‌و تۆقی شەڕ • »

بەم جۆرە گۆرانی دایـکی کارێکی وای لێ کرد ، نە بە قورعـان دەکراو بە فەرمانی باوکی •

بەڵام ئەمـە تەنیـــا تروسکەیەکی وەختی بوو • گۆرانیەکـانی دایـکی جەمالەددین نەیانتوانی گۆرانیەکانی دیکەی لە دڵدا بخنکێنن • جەمالەددین سانت پترسبۆرگی لـە بیر نەکرد کە لەوێ گەورە ببوو • بە زمـــانی بیـانی هــــەندێ قسەی دەکرد چایەکانی داغستان تێی نەدەگەیشتن :

**دەستگردی پترس ، خۆشم دەوێی •**
**دیمەنی تورت‌و نازداری تۆم خۆش دەوێ •**
**ئاوی ڕەوانی نیڤاو**

کەناری گرانیتیم خۆش دەوێ ٠
شوورەی نەخشی ئاسنینو
شەوی تروسکەداری بێ‌مانگی تۆم خۆش دەوێ ٠
کـە لە ژوورەکەم بم ٠
بێ چرا دەنووسمو دەخوێنمەوە ٠
شەقامە چۆڵەکانت ڕوناکن ٠
بورجی دوورپانی بینای ئەدمیرالی
دەدرەوشێتەوە ٠

بە ڕاستی ئەم ووشانە زۆر سەیر لـەم زنجە تەنیایەی گوندێـکی چیایدا دەنگیان دایەوە ٠ جەمالەددین شـــەو خـــەونی دەدی ٠ وای دەزانی لە کۆلێژی سەربازی (کادێت کۆرپس)ە و لە تەنشیت دیواری (باغی‌هاوین) تووشی (نینا)ی پەری جورجی دەبێ ٠

جەمالەددین دوو هەڵۆی لە دڵدا بوو هـەر یەکە بۆ لای خـــۆی ڕایدەکێشا ٠ دوو گۆرانی لە دڵدا بوو ٠ (نینا)ی دڵبەری لێ دوور بوو ٠ ڕووبارێکی بەرینیان بەین بوو ٠ نامـــەی لێ‌نەدەپەڕیەوە ٠ ئەفســەری ڕووس ، کوڕی ئیمامی داغستان ، لەم ڕووبارەدا دەخنـــکا ، هـــەموو خەونەکانی ڕادەپێچا ٠ خۆشترین خەونی جەمالەددین ئەوە بوو پردێك لەســەر ئەم ڕووبارە بەرینە دروست بـــکا هـــەر دوو بەری پێکەوە ببەستێتەوە ٠ بۆ ئەوەی میهرەبانیو دۆستێتیو ژیان بخاتە جێـــگەی شوومی شەڕو کوشتاری بێ ویژدانانە ٠

جەمال‌لە گۆرانیە چیایەکانی دایـکی دەگەیشت بەڵام لە گۆرانی پوشکینیش دەگەیشت ٠ دوو گۆرانی لەناو یەك دڵدا بوون ٠ وای ئەگەر باوکی پێی دەزانی !؟ وای ئەگەر خەڵك تێی دەگەیشتن ؟! وای ئەگەر ئەو دوو گۆرانیە لێك حاڵی دەبوونو یەکتریان خۆش دەویست ؟!

بەڵام گۆرانیەکان وەکو شمشیر وا بوون ، لـــە هـــەوادا پێك

دەکەوتن‌و پرۆشکیان دەهاویشت • داغستانی زامدار گۆرانی لـەبارەی خوێن‌و مەردی نەبەردو چاوی قەڵکۆلیوو حیلەی کەحێل‌و ترنـــگەی خەنجەرو ئەو ئەسپەی بە پرتاوی دەگەڕێتـــەوە ماڵێ‌و سوارەکەی لـــە شەڕگەدا بە جێ دێڵێ ، دەگوت •

بەڵام ئەگەر گۆرانیەکان لە یەك گەیشتبان ، خەڵـکی کەنارێك لە گۆرانی خەڵـکی کەنارەکەی دی گەیشتبان، تەقە دەوەستا • خەنجـەر چیـدی پێك نەدەکەوتن • خوێن چیدی نەدەڕژا • دەستی بەرزەوەبووی تۆڵە سەندن دەهاتە خوارێ • لەناو دڵدا ڕك جێی بۆ خۆشەویستی چۆل دەکـــرد •

**ڕووداوێك :**

لـە شەڕێـکی دەم ڕوباری (فالیریك) مـەلا محـــەمەدی موریدی شامیل بریندار کرا و ڕووسەکان بە دیلیان گرت • لـە گوندی وایان زانی کوژراوەو تازیەیان بۆ دانان ؛ بەڵام دوای مانگێك بە ساغ‌و سەلامـــەتی هـاتەوە • خـەڵك‌و دراوسێ واق‌وڕمـــاو لێیان پرسی چۆن‌توانیویە ڕا بکات • مەلا لەم پرسیارە ڕقی هەستا :« وا تێ نەگەن مـــەلا محـەمەد بە درۆو کوسکێشی خۆی قوتار کردوە • من ترسنۆك نیم • »

« دەزانین تۆ مریدێـکی دلێری • دیارە بە شمشیر ڕێی خـــۆت کردۆتەوە • • »

« چ شمشیرم پێ نەبوو • پێشم بایە بە کەلکم نەدەهات • • »

« ئەدی کـەوا بوو کوو ڕزگار بووی ؟ »

« فڕێیان دامـە زیندان‌و دەرگایان لەسەر کلیل دام • »

« لەوێ هەستت دەکرد وەکو چی وای ؟ »

« وەکو بزنەکیویەك کــە بــە تەلــەوە بووبێ • بەڵام لـــەو زیندانەدا کتوپڕ گۆرانی (عەلی)م هاتە یاد کــە برا قوڵتەبازەکانی لەسەر شاخێکی بەرز بەجێیانهێشت • گۆرانیەکم چــڕی • پاشــان گۆرانیترم گوت : گۆرانی ئــەو باڵندانەی بەهاران دێن، گۆرانی ئەو قورینــگانەی پایزان لــە شەقەی باڵ دەدەنو دەڕۆن ، گۆرانی ئەو مامزەی نۆ جـــار بـــە دەستی ڕاوکەرێــکی دڵڕەق بریندار بوو ، گۆرانی پایز ، گۆرانی زستان ، گۆرانی وام گوت پێشتر نەگوترابوو • سێ ڕۆژ هیچم نەکرد هــەر گۆرانیم گوت • پاسەوانەکان دەمکوتیان نەکردمەوە • گۆرانی هەر گۆرانیە • ئەگــەر مانای ووشەکانیشی نەزانی هەر گۆرانیەو هـــەموو کەس گوێی بۆ شل دەکا •

تا ڕۆژێکیان ئەفسەرێــکی گەنج هـــات بۆ بەســـەر کردنەوەی پاسەوانەکان • گوتم ڕۆژی پێ بچم ئەمڕۆیە • کابرایەکی لەگەڵدا بوو زمــانی ئیمەی دەزانی ، پێی گوتم ، « ئەفسەر دەیەوێ بزانێ تۆ گۆرانی لەبارەی چــەوە دەڵێی ؟ گۆرانیەکەت دوو گاڕکی بکەوە ! » تێم هەلکرد گۆرانیم لە بارەی داغستانی سووتاوەوە گوت • داوای گۆرانیەکی تریان کرد • گۆرانیم بە دایکی هـــەزارو ژنی خۆشەویستم هەڵــگوت •

ئەفسەرەکە گوێی ڕاگرتو سەیری شاخــە ســەر بە هەورەکانی کردو فەرمانی بــە پاسەوانەکان کرد کــە بەرم بدەن • ئەو کابرایەی زمــانی ئیمــەی دەزانی گوتی : « ئەم ئەفسەرە بەرت دەدا • بۆیە بــەرت دەدا بچیتەوەماڵی خۆت چونکە گۆرانی تۆی زۆر پێ خۆش بوو • »

لەو کاتەوە بیر دەکەمەوە : « باشتر وا بوو داغستان هەمیشە هــەر گۆرانی بچڕێ ، نەك خوێنی خۆی بڕێژێ • »

بەڵام شامیل بە موریدی لە بەند دەرباز بووی گوت : « من گۆرانیم

قەدەغە کردوە . تۆ بۆچ گۆرانیت چڕی ؟ »

« ئیمام ، تۆ گۆرانی گوتنت لە داغستان قەدەغە کردوە ، نەك لەوێ . »

شامیل گوتی : «وەلامەکەتم زۆر بە دڵە . » دوای نەختێ بیرکردنەوە گوتی : « مەلا محەمەد ، ئیزنم دای ، بڕۆ هەر گۆرانی بڵێ . »

لەو کاتەوە ، مەلا محەمەد وا ناسراوە دەڵێن ئەو محەمەدەی بە گۆرانی ڕزگار بوو . داغستان گۆرانیەکی دەویست ڕزگاری بکا ، بەڵام ئاخۆ هەموو کەس وەکو ئەو ئەفسەرەتێگەیشتنیان دەبوو ؟ ئەدی ئەوە کێ بوو ؟ ئینسگن لیرمەنتۆف نەبوو ؟ ئەویش بەشداری شەڕی (ڤالیریك) بوو .

**ڕووداوێکی تر :**

دوای هێرشێکی سەرکەوتوانە بۆ سەر تەمەرخان شورا ، حاجی موراد لەگەڵ زەلامەکانی بەرەو ماڵ دەبوونەوە . لە دارستانێکدا ، سێ سەربازی ڕووسیان لە دەم ڕێگادا دی . بە هێمنی دەوریان لە ئاگر دابوو و گۆرانیان دەگوت .

حاجی موراد ، لە پیاوەکانی خۆی لە یەکێکی پرسی کە نەختێ ڕووسی دەزانی ، گوتی : « ئەمانە گۆرانی دەربارەی چ دەڵێن ؟ »

« دەربارەی دایکیان ، دەربارەی دەزگیرانیان ، دەربارەی ئەو بارانەی بەسەر وولاتی دووریاندا دەبارێ . »

حاجی موراد ماوەیەکی باش گوێی بۆ گۆرانیە ڕووسیەکان شل کرد ، ئینجا بە نەرمی گوتی :

« ئەم پیاوانە دوژمن نین ، ئاشتییان لێ تێك مەدەن ، لێیان گەڕێن با گۆرانی بە دایکیان هەڵبلێن » .

بەم جۆرە گۆرانی گوللەی لە خەڵك گێڕایەوە . ئەگەر بێت و ئەم خەڵکە لەیەك بکەن داخۆ چەند گوللە دەگەڕێتەوە !!

**ڕووداوی سێیەم :**

مەحەچی قومیساری شۆڕشگێڕی داغستان نامەیەکی گرنگی بە مەحموودی شاعیر بۆ پارتیزانەکانی خونزاخ ناردو گوتی : بە پاندوور ڕێگات بکەوە نەك خەنجەر » .

مەحموود لە گوندی «تسادانیخ» گیراو خرایە زیندانەوە ، نامەکەی مەحەچیان لێ گرت . خەریك بوون گوللە بارانی بکەن ، بەلاَم ، لەو زیندانەدا مەحموود گۆرانیەکی لەبارەی خۆشەویستەکەیەوە گوت ، سەراپای دێ هات گوێی ڕاگرت ، بگرە لە گوندەکانی تریشەوە هاتن . نەجمەددین گۆتسنسکی کە ئەمەی دی گوتی : «ئەگەر ئەمڕۆ لەسەری ئەم گۆرانیێژە بدەم سبەینێ هەموو خەڵکی چیام لێ هەڵدەگەڕێتەوە» . ئیدی شاعیرەکەی ئازاد کرد .

ئیرچی کازاك دەیگوت کە دوورخرامەوە سیبریا ئەگەر گۆرانی نەبایە لە داخان شەقم دەبرد .

زۆر چیروکی لەم بابەتە هەن . دەبێ بڕوایان پێ بکەین . گۆرانی ژیانی خەڵکی ڕزگار کردوە ، پیادەی کردۆتە سوار ، پیاوی ترسنۆك وا بوە کە گۆرانی لە بارەی ئازایەوە بیستوە ، هەموو جۆرە ترسێکی لە خۆی داڕنیوە .

ئەم چیرۆکەیەم لە ئەبوتالیب بیست :

کە لە هیند هاتمەوە ، ئەبوتالیب زۆر پرسیاری لەبارەی ئەو وولاتە لیٚ کردم ، منیش بۆم باس کرد چۆن دەرویٚش‌و مارگری هیندی بە بلویٚرلیٚدانی تایبەتی وەکو کچە سەماکەر کوبرا دەخەنە تیتلە سەما .

ئەبوتالیب گوتی : « جا ئەوە سەیر نیە ، شوانەکانی ئیمە کە شمشاڵ لیٚ دەدەن بزنە کیٚوی لەسەر شاخی بەرز دەخەنە سەما ، من خۆم دیومە ترسنۆکترین شوور بەو پەڕی شادیەوە شویٚن دەنگی مۆسیقا کەوتوە ، دیومە وورچ وەك باشترین پاڵەوانی سەر تەناف لەگەڵ فیقەی زوڕنا هەڵپەڕیوە ، » ئەبوتالیب تۆزیٚ وەستا ، ئینجا گوتی : « زۆر جار لە ژیانما ئاواز بە هانامەوە هاتوە ، ڕەنگە بزانی من زوڕنام لە هەموو شتیٚ خۆشتر دەویٚ ، فیقەی دوور دەڕوا ، زوڕنا پیٚشوازی لە دایكبوونی کوڕو گەڕانەوەی برادەرو ئاهەنگ‌گیڕان دەکات ،

کە یەکیٚك لە زۆرانیٚ دەیباتەوە یان لە تەڕادانیٚ یەکەم دەبیٚ زوڕنا مزگیٚنی پیٚ‌دەدا ، دەنگی زوڕنا مزگیٚنی هەموو خۆشیەکە لە داغستان ، زوڕنا شای هەموو ئامیٚرە مۆسیقەکانی ترە ، سەبارەت بە شتیٚکی‌تریشە من مۆسیقام خۆش دەویٚ سەبارەت بەوەیە کە لەسەردەمی لاویدا تیٚری کردووم ، دەمەویٚ بۆت بگیٚڕمەوە جاریٚکیان چی بوو :

« تازە هەڕەتی لاویم بوو ، لە گوندیٚکی دووری شاخاویدا ، لە زەماوەندیٚك لە دووم گەڕابوەوە ، زستان بوو ، بەفر کلۆ کلۆ دەهاتە خواریٚ ، ڕیٚ وەکو ژمارە دوو ، سیٚ ، پیٚنج‌و بگرە هەشت پیٚچی دەکردە ماندوو بووم ، لەسەر بەردیٚك دانیشتم بۆ ئەوەی پشوویەك بدەم ، زۆرم ما بوو کیسە تووتنەکەم تەواو بکەم ، لە پڕ ، لە پیٚچیٚکی ڕیٚگا ، زرنگەی زەنگوڵم هاتە بەر گویٚ ، دیم بەیتوونیٚك هات سیٚ زەلامی تیٚدا بوو : ئیٚر و تەسەل ، ئازا ، مەست ، سەر گەرم‌و خەندان ، دیار بوو

دەوڵەمەند بوون • ئەسپێکیان سپی وەك بەفر بوو • ئەوەی‌تر ڕەش بووو نەخشێکی سپی لە ناوچەوانی دا بوو :

« السلام علیکم »

« وعلیکم السلام »

کە زانیم بۆ عەینی زەماوەند دەچن داوام لێ‌کردن لەگەڵ خۆیان هەڵم بگرن ؛ بەڵام ئەوانیش وەکو شوفێری لاساری ئەم عەیامە هەڵیان نەگرتم‌و گاڵتەیان پێ‌کردم : « گوێ مەدێ بۆ زەماوەندێکی‌تر پێ ڕادەگەی • با ئەم زەماوەندە بێ تۆ بکرێ • »

منی شەکەت‌و تووڕە ، زوڕنام دەرهێناو فووم پێدا کرد • پێشتر زوڕنای وام لێ نەدا بوو • سەیر ئەوە بوو کە ئەسپەکان گوێیان لە فیقەی زوڕنا بوو ، لە شوێن خۆیان چەقین ، دەتگوت ڕەگیان لە زەوی داکوتاوە • کابرای هاژوەر تێی‌ڕاخوڕین‌و قامچی لێدان ، بێ هوودە بوو • ئەسپەکان نەجولانەوە • ئاشکرا بوو کە دڵبەندی ئاوازی منن • ئا هەراو پڕکێشی زۆری خایاند • ئەسپەکان لای من بوون • ئیدی ناچار بوون سواری پەیتونەکەم بکەن • بەم جۆرە زوڕنام دەهانامەوە هات • هەر گۆرانیش بوو کە لە زیندان بەرزی کردمەوە بۆ بەرزە ڕێی شەڕەف‌و ڕێزو سەربڵندی • »

لە ئەبوتالیبم پرسی : « تۆ بلوێر لێ‌دەدەی ، زوڕنا دەژەنی ، هەموو چەشنە شمشاڵێك بەکار دێنی • نەك هەر دەتوانی لێیان‌بدەی بگرە لە هەموویان وەستای • ئەدی بۆ نازانی کەمان لێ بدەی ؟ چیایی زۆر حەزیان لەم ئامێرەیە • »

« پێت بڵێم بۆچی کەمان لێ‌نادەم ؟ گوێ بگرە • کە گەنج بووم،

لێم دەدا • تا ڕۆژێ ئاڤارێکی شەکەت و بەدبەخت هاتە گوندی لەکیمان• لـە گوندی خۆیان زەلامێکی لـە دەست زەڕ ببوو دەرکرا بوو • ئەوەی لـە گوندی خۆی دەر بکرێ دەبێ لـە پەڕگـەی ئاوایی زنجێك بۆ خۆی دروست بـکا • کەس سـەری لێ ناداو ئەویش ناچێتە سەردانی کەس • بەڵام مـن کـە نەختێ ئاڤاریم دەزانی جاروبار دەچوومـە لای • ئێوارەیەکیان بە خۆم و بە کەمانچەمەوە چـووم • کـابرا لەبەر ئاگردان دانیشتبوو ، بەردەسێلی لێ نابوو • دەستم بە کەمانژەنین کرد • ئاڤـاری سەوداسەر لە ئاگرەکە نز بوەوەو بە کڕی هەستی ڕاگرت • پاشان لـە هیکڕا کەمانەکەی لە دەست دەرهێنـام • تەماشەیەکی کرد • هەڵـگێڕو وەرگێڕی کرد • نەختێ ڕێـکی خست و دەستی پێ کرد ئاوازێکی لێدا •

وای ڕەسوول ! چۆنی لێدا !! هـەتا ماوم ئەو ئاوازەم لـە بیر ناچێتەوە • (کا) لەناو ئاگرداندا دەسوتاو پڕوشـکی گەشی دەهاویشت و چـاوی ڕون دەکردینەوە • فرمێسکمان لەچاو دەهـات • کـەمانم بۆ کابرای ئاڤاری بەجێ هێشت و گەڕامەوە ماڵێ • بۆ ڕۆژی پاشی وەشاخان کـەوتم و گوندەکەیانم دۆزیەوەو چوومە لای دوژمنە خوێنخۆرەکانی • لەگـەڵ خۆم هێنامن • بە ڕۆژ لـە ماڵی من بوون و شەو دەمبردنە مـاڵی کابراو گوێیان دەدایە کەمانچەلێدانی دوژمنی خوێنیان • سێ شەو لەسەر یـەك چووین • ڕۆژی چوارەم لـە دوژمنەکەیان خـۆش بوون و پێیان گوت : « وەرەوە ماڵێ ، ئێمە لێت خۆش بووین • »

کاتێ کابرای ئاڤاری هـات بڕوا ویستی کەمانەکەم بداتەوە ، بەڵام من لێم وەرنەگرتەوە • پێم گوت : « قەت وام لێ نایـە بتوانـم وەکو تۆ کەمان بژەنم • ناشمەوێ خراپتری لێ بدەم ، بۆیە کەمان چیتر بەکەڵك مـن نایـە • »

لەو کاتەوە هیچ کەمانم هەڵنەگرتوە • بەڵام قەت ئەو ئاوازەم لـــە یاد ناچێ کـــە ئەودوژمنانەی پێك هێنایەوە • زۆر جار بیر دەکەمـەوە • ئەگـەر هەموو کەس ئەو جۆرە ئاوازەی لە کەمـــان بیستایە کـــەس خرابەی نەدەکردو هیچ ڕقو دوژمنداری لە دونیادا نەدەما • »

ئێستا دوو چیرۆکی کورتتان لە بارەی باوکمەوە بۆ دەگێڕمەوە :

حاجیەکی گوندی «گۆتساتلی» ئوتێلێـکی لـە خونزاخ کردەوە • بانـگی باوکمی کردو گوتی :

« تۆ لەم چیایانە باش ناسراوی گۆرانیەك لە بارەی ئوتێلەکەمەوە دابنێو قسـەی باشی دەرهەق بـکە بۆ ئەوەی بناسرێ • بۆ هــەقیش ئەوەندەی زارت هەڵدەگرێ دەتدەمێ • »

باوکم بە ڕاستی شیعرێـکی لەسـەر داناو بەڕاستیش وای کـــرد ئوتێلەکـەی بناسرێ ، بەڵام وەکو شوێنێـکی پیسو پلۆخو ناتـەواو • باشـان خەڵك پەنجەیان بۆ ئۆتێلو خاوەنەکەی درێژ دەکردو دەیانگوت: « ئەمە بوو کە هەمزە ڕسوای کرد • »

کە خاوەنی ئوتێلەکە بەم شیعرەی زانی تەنـگاو بوو • گفتی بـــە باوکم دا ئەگـەر وا بـکا شیعرەکەی بڵاو نەبێتەوە ئەسپێکی بە زینـــەوە پێشکەش دەکا • بەڵام ووشـە هەر هێندە لە دەم هاتـە دەرەوە ئیـــدی دەگاتە سەراپای چیاکـانو هیچ هێزێ نیـە بەربەستی بـکا • هـــەموو گوندیەکـان ئەو شیعرەیان بیست کـە باوکـم لەسـەر خـاوەن ئوتێلی چارەڕەش دای نابوو • ئێستا شیعرەکە بە گۆرانی دەگوترێ • حاجیش ناچار بوو ئوتێلەکەی دا بخات •

جارێکیان گۆشتیڕانی مەڕێکمان لـە ماڵەوە بزر بوو • نەمـانزانی

چۆن بیدۆزینەوە و لە کوێ بەسەری بگرینەوە • بەڵام لەو کاتەدا لـــە گوندی بوو بە مقۆمقۆ گوایە هەمزە گۆرانیەکی لەسەر دزەکان داناوە • هــەر چــەندە باوکم بە تەمای دانانی گۆرانی وا نەبوو بەڵام هــەر ئــەو ڕۆژە گۆشتەکەیان فڕێدایەوە بالکۆنی ماڵێ •

هەندێ جار بووکو زاوای نوێ بەشەڕ دێن • ئێواریێ برادەرێکیان، بە تایبەتی برادەری زاوا ، دەچێتە بـــەر پەنجەرەیانو چونــگوریان بۆ لێدەدا • ئاوازی چنگورەکە هەموو شەڕو دەمەقاڵێەك لە بیر بووكو زاوا دەباتــەوە •

منیش برادەرێــکی دڵسۆزم هەبوو • سازندەو نیگارکێش بوو ، ناوی ئەمین چەتۆییف بوو • کــە تازە ژنم هێنا بوو زۆر جار دەهاتە بەر پەنجەرەکەمانو ئاوازی بۆ لێ دەداین •

ئەریێ ئەمین چەتۆییف ! بۆچی دەست نادەیتە کەمانو بچی لەبەر پەنجەرەی دونیا بیژەنی بەڵــکو شەڕو لێـــکدانی ئــەم سەدەیەمان دابمرێنـــەوە ؟

جارێکیان ، لە شیکاگۆ ، لەگــەڵ هاوڕێیەکی ئەمەریکی لێم بوو بە دەمەتەقێیەکی گــەرم • وێ نەدەچوو بـــگەینەیەك • کتوپڕ کــابرای ئەمەریکی هــەندێ شیعری برای خوێندەوە کــە لە جەنگی ڕابردوودا ، لــە ئەلەمانیا کوژرا بوو • منیش شیعری برایەکی خۆم خوێندەوە کـــە لەو کاتەدا شەهید کرا بوو • دەمەتەقێ بڕایەوە • مایەوە شیعرو بەس • ئاخ ! ئەگەر هــەر یادی مردوانمان بکردایەوەو زیاتر ئاوڕمان لە شیعرو گۆرانی بدابایەوە !

باوكو باپیرانی ئێمە زۆر جارپەلاماری جۆرجیای دراوسێیان دەدا،

له پەلامارێکدا داڤید گۆرامیشڤیلی/ی لاویان قۆڵبەست کردو هێنایانە چیاکانی ئاڤاری ، هەو بوو پاشان بوو بە نووسەرێکی کلاسی جۆرجی .

دیلی غەمبارو دڵ بەکەسەر کە لە شاخان ، لە (ئونتسوکول) خرایە زینـدان ، دەستی بە گۆرانی جۆرجی کرد . هەر لەوێش ملی دایــە شیعردانان . پاشان لە ئونتسوکول ڕای کردو چوە ڕوسیاو ئینجا چـوە ئۆکرانیـــا .

لــە یۆبیلی ئەم شاعیرە مەزنەدا چوبومە تبلیسی . کە نۆرەی قسەم هـات بە گـالتەوە گوتم : داڤیـد گۆرامیشڤیلی/ی شاعیری گـەورەی جۆرجیا قەرداری ئێمــەی داغستانیە . ئەگەر ئێمە نەمانگرتباو نەمانهێناو نەمانخستبا ناو زیندان لەوانەیە قەت شیعری دانەنابا و نەچووبایە ڕوسیاو ئۆکرانیا . ڕەنگە سەراپای ژیانی بە جۆرێـکیتر بایە . بەڵام پاشـــان ئەوەندەشم گوت : « کـە باوکو باپیرانمـــان ئەم شـــازادەیان گرت نەیانزانی شاعیرێکیان گرتوە ئەگەر نا ئیشی وایان نەدەکرد . بـەڵام ئەوەی بوو بوو . هــەر چەندە ڕۆژێ لە ڕۆژان داڤید گۆرامیشڤیلی دیلی داغستان بوە بەڵام ئەمڕۆ داغستان دیلی شیعرەکانی ئەوە . تەماشا کـەن ڕۆژگار چۆن دەگۆڕێ . »

ئەمڕۆ گۆرانی نوێ دەگوترێ بەڵام ئێمە گۆرانی کۆنمان لـــە بیر نەکردوە . ئێستا ئەم گەنجینەیەی داغستان بەر هـــەموو کـــەس دەکـــەوێ .

سروشت لە چیاکاندا سەختە . لــە زەمـــانی کۆنـدا منداڵ زۆر دەمردن ، بەڵام ئەوەی بژیبـا زۆر دەژیا . ســەد ساڵ پتر دەژیا . ئـەو گۆرانیانەی گوتراون هــەموو نەماون ، بەڵام ئەوەی ماوە هەتا هـــەتایە هـــەر دەمێنێ .

ئەو منداڵانەی بە ساوایی دەمردن زۆربەیان کوڕ بوون لەوە دەچوو کچ توانای بەرگرییان زیاتر بێ •

دەربارەی گۆرانیش هەمان شتە : نازانم بۆچی گۆرانی پیـــاوان ، گۆرانی شەڕو جوامێریو نەبەردی ، گۆرانی هێرشو پەلامار ، گۆرانی جەنگو گۆڕ ، گۆرانی تۆڵـەو خوێن و دلێری و سەرکـــەوتن پێش گۆرانی ئەوینو دڵداری دادەمرکێنەوە •

هەموو گۆرانیە کۆنەکانمان پێشەکی بوونو پێشەکین بۆ مۆسیقای نوێی داغستان • پاندووری کۆن ژێی نوێی تێدەخرێو پەنجەی نەرمی ژنە چیاییان لەسەر کلیلی ڕەشو سپی پیانۆ دێو دەچێ •

من لە ماڵێـکی پڕ گۆرانی لە دایك بوومو پێگەیشتم • بە ترسەوە قەلەمم گرتـە دەست • دەترسام دەست لـە شیعر بدەم بەڵام پێم نەدەکرا خۆی لێ لا بدەم • هەڵوێستم ناخۆش بوو •

پاش هەمزە تساداسا ، کـە ڕەسووڵ هاتە مەیدان ( لـــە گوندی تسادا ) ـ هەمان گوندو هەمان ماڵو هەمان داغستان بوو •

لـە هـەر کوێ بووبم ، هـەر کاتێ بۆ خەڵك دوا بم ، تا ئێستاش کـە ڕدێنم ماشو برنج بوە ، لە هـەموو شوێنێکدا دەڵێن : ئێستا نۆرەی ڕەسووڵە ، ڕەسووڵی کوڕی هەمزەی خۆمان • بێ گومان کەم نیە پیـاو کوڕی هەمزە بێ ، بەڵام من دەمەوێ خۆم بم ، ئەمەش شتێکی ئاسان نیە•

جارێکیان چوومە شاخانو سـەرم لـە هەندێ دێ دا • تەنیا گوندی (تسوما) ما بوو • لە دوورەوە دیم حەشامەتێـکی زۆر لە پەرگـــەی دێ زاوەزاویان بوو • فیقـــەی زوڕناو چریکـەی گـۆرانی دەگـەیشتە کەشکەلانی فەلەك • دیار بوو بۆ پێشوازی یەکێ کۆ ببوونـەوە ، لـە

منیش زیاتر کــەس نــەبوو پێشوازی بــکەن ٠ خۆش بوو بــەڵام جێیسەرسامیش بوو ٠ دەمـــزانی هێشتا وام لێ نەهاتوە بـــەم جۆرە پێشوازیم بـکەن ٠ کە لێیان‌نزیك کەوتینەوەو ڕامان‌گرت‌و لــە ترومێل دابەزین‌و چووینە لایان ، پرسیان : «ئەدی کوا پیرە هەمزە ؟! »

« هەمزە لە مەحەج قەلایە ٠ قەت بە تەما نەبوە بێ ٠ من هاتووم ٠ ڕەسووڵی کوڕی هەمزەم ٠ ٠ »

« تواهو !! بیستبوومان هەمزە دێ ٠ ٠ »

هەموو پەرتەیان کرد ٠ تەنیا چــەند گەنجێــکم لــە کن مایەوە٠ ئێمەش دەستمان کرد بــە گۆرانی گوتن ـ زۆرمــــان گۆرانی گوت ٠ هەندێ گۆرانی خەڵك دایانناپوو ، هەندێك باوکم دای نابوون ، بــــگرە گۆرانیەك لەوانە بوو کە خۆم دام‌نابوو ٠

ئەم گۆرانیەی من وەکو منداڵێــکی بچووك وا بوو کـــە قامچی بەدەست بێ‌و لە دوای باوکیەوە کە زینی هەڵگرتبێ ، بەسەر قادرمــــە بـــکەوێ ٠

ئەی پاندووری چیایم ! هـــەتا گــەورەتر دەبم و زیاتر لـــە ژیان‌و خــەڵك‌و دونیا دەگەم زیاتر بە ترسەوە دەتگرمە دەست ٠ هەزار ســـاڵە ژێیەکانت بەستراون‌و ئاوازیان لێ‌هەڵدەستێ ٠ هەزار گۆرانییش دەنگ‌و ئاوازی خۆشیان پێ لێ‌داوی ٠

کــە دەست دەبەم ژێیەکانت توند بــکەم ، دڵم دادەخورپێ ٠ ئەگەر تاکــە ژێیەك بپسێ وا دەزانم دڵم دەتەقێ ٠ کــە ژێیەك بپسێ مانای وایــە گۆرانیەك ســەری دەبڕێ ٠

بـــەڵام چـــی دەبێ با ببێ ٠ من دەتگرمە دەست ٠ ئاوازت پێ لێ‌دەدەم‌و گۆرانی خۆم دەڵێم ٠ با لەناو گۆرانیەکانی داغستان وون ببێ٠

دەنگی من لە دەنگی گۆرانیبێژە کۆنەکان ناکا • بەڵێ ، گۆرانیەکان جوودان •

« چما کەس پاشی مەحموود نەکەوتۆتە داوی دڵداری ؟ »

نازانم بۆچی ئیستا هیچ گۆرانی دڵداری ناگوترێ • بەڵێ هەیە دەکەوێتە داوی دڵداری بەڵام بۆ گۆرانی دابنێ ؟ پێویست بەوە نەماوە گۆرانی لەبەر پەنجەرەی موی لێ بدەی یان موی هەڵبگری • موی خۆی دێ •

« چما پاشی شامیل چ پیاوی نەبەردو ئازا هەڵنەکەوتوە ؟ » نازانم بۆچی لەبارەی پیاوی مێرخاسو شەڕی بێئامانەوە گوێمان لە گۆرانی نابێ !؟ »

هەڵبەت پیاوی ئازا هەیە ، بەڵام بۆچی ئەمڕۆ گۆرانی لەبارەی شەڕەوە بگوترێ کە شمشیریش داوای ئاشتی دەکا • »

چ دەبێ ئەگەر من دەنگم لەناو دەنگەکانی تری داغستان وون بێ ؟ ئەوەی نەمگوتوە ، ئەوانەی دوای من دەیڵێن و تەواوی دەکەن •

پیری ، زۆر خۆشی ژیان لە پیاو حەرام دەکا • هێزی دەبا • چاوی کزو گوێی گران دەکا • پەردەیەکی دەخاتە سەرچاوو لە دونیای دادەبڕێنێ • وای لێ دێ ناتوانێ بادەی شەرابیش بەرز کاتەوە •

بەڵام من ترسم لێی نیە • چونکە هەموو شتێکیشم لێ بسەنێ ، گۆرانیم هەر دەمێنێ • مەحموودو باتیرایو پوشکینو هێنیو بلۆکو هەموو گۆرانیبێژە گەورەکانم دەمێنێ ، گۆرانیبێژێکی گەورەی وەکو داغستانم دەمێنێ • تا داغستان هەبێ حاڵمان خراپ نیە • تا داغستانمان هەبێ نافەوتێینو بزر نابین •

یاریەکی مندالانە لە گوندە شاخاویەکان هەیە ، دەتوانین پێی

بڵێن : « ئەوەی بگەڕێ دەیدۆزێتەوە ، ئەوەی بیدۆزێتەوە بۆ خـــۆی دەبێ • »

جارێکیان بە شداری ئەم یاریەم کرد •

لە ژوورێـکی‌تر چاوی کوڕێـکی بچـکۆلە دەبەستنەوە • کچێك خۆی دەشارێتەوە • ئینجا کوڕەکە دێو بە دوای کچەکەدا دەگـەڕێ • لەگـەڵ گـەڕانی ئەودا هەموو بە کۆڕس گۆرانی دەڵێن : « ئێ ، دێ ، دەلالێ • » کـە کوڕەکە سـارد بێ گۆرانیەکە کز دەبێ ، کە کوڕەکە گـەرم بێ گۆرانیەکە توند دەبێ • کـە کوڕەکە کچەکە دەدۆزێتـەوە هـەموو دەیـکەنە چـــەپڵە ڕێزانو سەمایان پێ دەکەن • بەم جـــۆرە گۆرانی ڕێنوێنی کوڕە چـــاوبەستراوەکە دەکاتو ڕێـگای ئامـــانجی دەدۆزێتـەوە •

من لە ماڵێکی گۆرانیبێژ ، لە داغستانی گۆرانیبێژ ، لـە وولاتی ڕووسیای گۆرانیبێژ ، لە دونیای گۆرانیبێژ لە دایك بووم •

دەزانم گۆرانی چەند بەهێزە • چـەند بە نرخە • ئەگەر گۆرانی لـە داغستان نەبایە ، کـەس وەکو ئێستا نەیدەناسی • داغستان وەکـو بزنەکێویەکی ئاوگەلە وا دەبوو • بەڵام گۆرانی لە توولەڕێی شاخـاوی ڕێنمایی کردینو بە دونیای گـەورەی گـەیاندینو برادەری بۆ پەیدا کـــردین •

ئەبوتالیب پەندە(۱) باوەکەی خۆمانی هەڵدەگێڕایەوەو دەیـگوت : « گۆرانیـــەکم بۆ بێژە ، پێت دەڵێم تۆ کێـی » داغستان گۆرانی گوتو دونیـــا ناسی •

---

(۱) پەندەکـە دەڵێ : « پێم بڵێ برادەرەکـانت کێن ، پێت دەڵێم تۆ کێی » !



# کتێب

**ئەوەی کتێب هەتك بکا ، کتێب هەتکی دەکا .**

**« پیاو پێویستی بە کتێبە تا خۆی بناسێ . پێویستی بە کتێبە تا خەڵك بناسێ » .**

**« گەلی بێ کتێب وەکو پیاوی چاو بەستراوە وایە دونیای پێ نابینرێ ، وەکو پیاوی بێ ئاوێنە وایە ڕووی خۆی پێ نابینرێ » .**

★ ★ ★

ووشەی (تیخ)ی ئاڤاری دوو مانای هەیە ـ کەوڵەمەڕو کتێب .

دەڵێن : دەبێ هەموو کەس سەری خۆی‌و پەپەخای سەر ئەو سەرەی بپارێزێ . پەپەخا لە کەوڵەمەڕ دروست دەکرێ . سەدان ساڵ بوو سەری چیایان کتێبێکی نەنوسراو بوو . کۆگای زمانمان ، مێژوومان ، ڕۆمان‌و چیرۆکمان ، کەلەپوورو ڕەوشتمان بوو ـ کە سەراپای بیری خەڵکە . سەدان ساڵ بوو کەوڵەمەڕ ئەم کتێبە نەنووسراوەی ـ کە سەری چیایانەو لە بارەی داغستانە ـ دەپاراست‌و گەرمی دەکردەوەو بەرگری لێ دەکرد . زۆر شت ماوەتەوەو بۆمان

هاتۆتە خوارەوە ، بەڵام زۆر شتیش لـە ڕێـگادا لە بیر کراونو هەرگیز جێگەیان پڕ نابێتەوە • هـەندێ پەڕەی ئەم کتێبە وەکو قارەمانان لـەناو ئاگری شـەڕدا لەناو چوون ، (چونـکە پەپەخـــا گوللـەو شمشێری بێناگەڕێتەوە) کـــەچی ئەوانەی دی وەك ئـەو ڕێبوارە بەدبەختانەی هەڵەتە دەبن ، ئاوا زریان شەپرێوەیان دەکا • دەکەونە ژێر هەرەسی ڕنیـە بەفر ، لە هەڵەمۆتێکدا هەڵدەدێرێن ، جەردەو ڕێگر دەیانکوژن •

ئەوەی وون بێو لە بیر بچێ ، خەڵـکی لـــە هەموو شتێکی بـە چاکتر دەزانن •

ئەگـەر تۆ شیعرێك بخوێنیتەوەو دێرێـکی لێ لە بیر بکەی ئـەو دێرە لە هەمووان گرنگتر دیارە •

کـە مانـگایەکی مردووت دێتەوە یاد ، دڵنیای کـــە باشتـرینو چەوترین شیری پێـداوی •

باوکی مەحموود یـــەك سندووقە نووسینی کوڕە شاعیرەکـــەی سووتاند ، دڵنیا بوو کـە شیعر بوو کوڕە قەت ـ چاکە ـ نەکردوەکـەی بەرەو ڕووخان برد •

ئستا هـەموو کەس لەو بڕوایە دان باشترین بەرهەمی مەحمـوود ئەوەیە کـە فەوتاوە •

باتیرای کـە گۆرانی گوتبا هەرگیز دووپاتی نەدەکردەوە • بـــە زۆری لە زەماوەندا کـاتێ هـەموو لا مەست دەبوون ، گۆرانی دەگوت • ئەم گۆرانیانە نەپارێزراون • ئێستا هەموو کەس دەڵێن ئەمانە باشترین گۆرانی بوون • ئێرجـی کـازاك لـە بارەگـای شامخاڵدا زۆر گۆرانی چڕی • بەڵام کەمیان لـە دیوارە بڵندەکانەوە پەڕینەوە لای خـــەڵك •

ئیرچی کازاك خۆی گوتویە : « هەر گۆرانیەکی حەزت لێەبیچرە ، نە شامخالێك تێت دەگاتو نە کەرێك »• دەڵێن ئەو گۆرانیە ونیوانەی ئێرچی کازاك باشترین گۆرانی ئەو بوون •

نە دەنگی پاندوری سوتاومان بۆ هاتۆتە خوارێنە ئاوازی ئەو چونگورانەی فرێ دراونەتە ناو ڕوبار • ئەمڕۆش من تازی بۆ هەموو بزرو مردوویەك دادەگرم •

بەڵام کە ئەوە دەبیسمو دەخوێنمەوە کە بۆمان ماوەتەوە دڵم گۆرانی دەڵێو منیش سوپاسی ئەو هەموو چاپیە هەزارانە دەکەم کە کتێبە بەهادارو نەنووسراوەکانیان پێگەیاندووین •

ئەم چیرۆکو گۆرانیانە بەم کتێبانەی ئەمڕۆ لەسەر کاغەز نووسراونەتەوە دەڵێن :

« ئێمەی نەنووسراو سەدان ساڵ بەناو لافاوو گەرداودا سەرمان هەڵگرتوەو بۆ ئێوە هاتووین • ئاخۆ ئێوە کە هێندە بە جوانی چاپ کراونو بەستراون ، بە نەوەی داهاتوو دەگەن ؟ » • دەڵێن : « دەبینین ، داخۆ کامەیان پارێزەری ڕاستەقینەی کتێباتە ـ کتێبخانەو کۆگای کتێب ، یان دڵی بنیادەم » •

زۆرشت لە بیر دەکرێ • لە سەد دێر یەکێك دەمێنێ ، بەڵام ئەم دێرە سەردەمێکی زۆر دەژی •

زۆر جار گوتوومە لە ڕۆژگاری دێریندا گەلێ کۆرپە لەسەر پشتی لانك دەمردن •

ئیمام فەرمانی بە بریندارن کرد خۆیان باوێنە ناو ڕوبار • پیاوی

سەقەت سوودیان نەبوو ، شەڕیان پێ نەدەکرا ، بەڵام دەبا خواردنیان بدرێتێ •

ڕۆژگار گۆڕاوە ، کۆڕبە بە دختۆرو داوو دەرمان گەورە دەکرێن • بریندار تیمار دەکرێن • بەلی دەستکرد لێ دەندرێتەوە • گەلێك ئەم گۆڕانانەی بەسەردا بێ ، پێی دەڵێن گەلی شارستان‌و پێشکەوتوو •

بەڵام ئاخۆ بیری سەقەت‌و شیعری لاوازو سۆزی نیوەگیان‌و گۆرانی تازە کوورەش هەمان شتیان بەسەر نایە ؟ هەموو شتێك لە نێو کتێباندا دەمێنێتەوە • هەموو شتێك دەخرێتە سەر کاغەز ، هەموو شتێك لە کتێبخانان هەڵدەگیرێ‌و دەپارێزرێ •

دەڵێن : « پەیفی سەر زار دەفەوتێ ، هی نووسراو دەمێنێ » • با بەو ئومێدە بین قسەکەمان لێ‌نەبێتە پێچەوانە •

بەڵام وا نەزانی من دژی کتێب‌و نووسینم • ئەمانە وەکو ئەو ڕۆژە وان کە لەسەر شاخان هەڵاتبێ‌و ڕوناکی بە نێو دۆڵدا بڵاو بکاتەوەو تاریکی‌و نەزانی بڕەوێنێتەوە •

دایکم چیرۆکی ڕێوی‌و باڵندەی بۆ گێڕامەوە :

هەبوو نەبوو ، باڵندەیەك هەبوو لەسەر درەختێکدا دەژیا • هێلانەیەکی مکووم‌و گەرمی هەبوو بێچووەکانی تێدا بەخێو دەکرد • هیچ لە گۆڕێدا نەبوو • تا ڕۆژێکیان ڕێوییەك چوە ژێر درەختەکەو هەڵی کردە گۆرانی :

**دەبینم لەسەر درەختی من ،**
**هێلانەت لەسەر چلێك هەڵناوە •**
**ئەگەر ئێستا بێچووەکم نەدەیتێ**
**بۆ ئەوەی واز لەوانی دی بێنم**

**ئەم درەختە بە تەورەکەم دەبڕمەوەو**
**هەرچی بێچووت هەڵێناوە هەڵیان دەلووشم •**

باڵندەی داکانە بۆ ئەوەی درەختو هێلانەکەی بپارێزێ ، بۆ ئەوەی بێچوەکانی دی بپارێزێ ، بچووکترین زەڕنەقووتەی بە ڕێویەکە بەخشی •

بۆ ڕۆژی پاشی ، دیسان ڕێویەکە هاتەوەو هەمان گۆڕانی چڕی • باڵندەکە ناچار بوو بێچوویەکی دی بکاتە بەلاگێڕ • تا وای لێهات ماوەی تازی داگرتنی نەما • یەك لە دوای یەك بێچووەکانی فەوتان - هەر ڕۆژە یەکێك •

باڵندەکانی دی بە دەردیان زانی لە شەقەی باڵیان دا هاتنە لای و پرسیان مەسەلە چیە ؟

باڵندەی گەمزە بۆی گێڕانەوەو باڵندە ژیرەکانیش گوتیان :

**سووچی خۆتە**
**تۆ باڵندەیەکی کەودەنی ، مێشك بۆشی •**
**کە ڕێوی فێڵباز هات**
**هەرچی گوت پێت بڕوا کرد •**
**ڕێوی چۆن دەیتوانی دار ببڕێتەوە ،**
**تەنیا ، ئەگەر کلکی بەکار بێنایە •**
**نەیدەتوانی دەست بداتە بێچووەکانت ،**
**ئەگەر بە کلکی پێیان بگەیشتایە ؟**

بەڵام ڕێوی هیچ ئاگای لەم کسەین و بەینە نەبوو ، دیسان هاتەوە بۆ ئەوەی باڵندەکە بترسێنێ و هەڕەشەی لێ بکا • داوای بێچوویەکی دی لێ کرد ، گوتی درەختەکە دەبڕمەوەو هەموو بێچووەکان دەکوژم • بەڵام ئەو هەڕەشەو گوڕەشەی باڵندەکەیان تۆقاند بوو ، ئەم جارە بە بێ نرخیان تێگەیشت و وەڵامی دایەوە :

**ئەم درەختە ڕەگی لە زەوی داکوتاوە .**
**خۆت مەگنخێنە : بێلێك بێنەو هەڵی کۆڵە .**
**ئەم درەختە قەڵایەکی شوورەبەندە .**
**جا تەورێك بێنەو بکەوە کار .**
**دەتەوێ بە هێلانەی بەرزم بگەی ،**
**کەواتە پێ پلکەیەك بێنەو وەرە تاقی بکەوە .**

بەم جۆرە ڕێویەکە ناچار بوو بە برسێتی بڕوات‌و ئیدی نەگەڕایەوە . باڵندەکەش تائێستا بە شادومانی ڕادەبوێرێ‌و بێچەوەکانی بەخێو دەکات . بێچوەکانی گەورە دەبن‌و گۆرانی دەخوێنن .

داخۆ داغستان لەبەر دواکەوتن‌و نەزانینەوە چەند بێچووی لە دەست چوە ! پیاو پێویستی بە کتێبە تا خۆی بناسێ ، پێویستی بە کتێبە تا خەڵك بناسێ . گەلی بێ کتێب وەکو پیاوی چاو بەستراوە وایە دونیای پێ نابینرێ ، وەکو پیاوی بێ ئاوێنە وایە ڕووی خۆی پێ نابینرێ .

ڕێبوارەکان لە بارەی ئێمەوە نووسیویانە : « چیایی نەزان‌و دوواکەوتوون . » ئەم ووشانە ڕاستیان پتر تێدایە تا لووت‌بەرزی‌و دوژمنداری . بێگانەیەك نووسیویە : « ئەمانە وەکو منداڵی بە کەلەش‌وان» دوژمنەکانمان گوتوویانە : «خوێندەواریان نیە دەتوانین سوود لەمەوە وەربگرین » .

جەنەڕاڵێك گوتوویە : « ئەگەر ئەم گەلە هونەری شەڕکردنیان بزانیایە کەس نەیدەوێرا دەستیان لەبەر ڕاست بکاتەوە . »

چیاییەکان دەڵێن : « وای ، ئەگەر لەگەڵ ئەم زانستەی ئەمڕۆ نەبەردی حاجی موورادو بەهرەی حاجی مەحموودمان دەبوو ! » جارێکیان حاجی موراد لە شامیلی پرسی « ئیمام ! ئێمە بۆ دەبێ

ڕاوەستین ؟ دڵمـــان دەجۆشێ ، خەنجـەری دەبانمان بـە دەستەوەیە ، چاوەڕوانی بۆ چیە ؟ با بۆ پێشەوە مل بنێین‌و ڕێـگای خۆمان بکەینەوە ». « هێواش ، حاجی موراد ، پەلەت نەبێ . ڕوباری بەلەز قەت ناگـاتە دەریا . پرس بـە کتێب دەکـەم‌و ئەویش تێم دەگـەیەنێ . کتێب حیکمەتی هەیە » .

« ئیمـام ، دەشێ کتێبی تۆ حیکمەتی تێـدابێ ، بەڵام ئەوەی ئێستا پێویستمان بێ ئازایەو ئەویش بەسەر شمشێری تیژو پشتی ئەسپەوەیە » .

« کتێبیش دەشێ ئازا بێ » .

کتێب ... پیتـە ، دێرە ، پەڕەیە ، پـەڕە کاغەزێـکی پانە ، بەڵام ئاوازی ووشـەو گۆرانی زمـان‌و بیری تێدایە ، منی تێدایە کە نووسیومە، خەڵـکی دی تێدایە کـە من دەربارەم نووسیون ، ئەوانەش کە دەربارەی خۆیان نووسیوە . گەرمایی هاوین و زریانی زستان‌و ڕووداوی دوێنێ‌و خـەونی ئەمڕۆو کردەوەی بەیانی تێدایە .

مێژووی جیهانیش وەکو ژیانی هـەر کەسێك دەبێ بـکرێتە دوو بەش : پێش کتێب‌و پاش کتێب . ماوەی پێشەوە شـەوە ، ماوەی پاشەوە ڕۆژی ڕووناکە . یەکـەم دۆڵـکی تەنگ‌و تاریـکە ، دووەم دەشتێکی پانە ، یان تەپکە شاخە .

باوکم دەیگوت : « مادام مێژوو بە هۆی نەزانینەوە ئەو ماوە دووڕو درێژە وا بە توندی سزای داوین بە ڕاستی دەبێ نەزانین تاوان بێ » .

دوو سەردەم ـ بە کتێب‌و بێ کتێب . لەسەردەمی ئێستاماندا کتێب زوو دەکەوێتە بەر دەستی خەڵك . خەڵك کە تازە پێ دەگرێ‌و فێری ڕۆیشتن دەبێ کتێبی پێ دەگات . بەڵام کتێب کاتێك هاتە داغستان کـە

ئەمەنی هەزار ساڵ بوو • ڕاستی ، داغستان ، درەنگ فێری خوێنــــدن‌و نووسین بوو •

سەدان ساڵ بوو ئاسمــان لاپەڕەی چیــایان بوو • ئەستێرە پێنیان بوو • هــەوری تار مەرەکەبدانیان بوو • باران مەرەکەبیان بوو • زەوی کاغــەزیان بووو درەخت‌و گیــاو گوڵیش پیتی ســەر کاغــەزەکە بوون‌و چیاکانیش داهاتبوونەوە سەر ئەم لاپەڕەیە بۆ ئەوەی بیخوێننەوە • تیشکە سوورەکانی خۆر قەڵەم بوون‌و مێژووی ئێمەیان بە گەڵێ هەڵەوە لەسەر شاخان دەنووسی • لەشی پیــاو مەرەکــەبدانی بوو • خوێنی مەرەکــەب بوو ، خەنجەری پێنووس بوو • کتێبە نووسراوەکەش کتێبی مــــردن بوو • هەموو کەس لە زمانی دەگەیشت‌و پێویستی بە وەرگێڕان نەبوو •

چەوساندنەوەی ئافرەت مەرەکەبدانی بوو • فرمێسکی مەرەکەب بوو • ســـەرینی لاپەڕە بوو • کتێبەکەش کتێبێ ئازار بوو • بەڵام کــەم کەس خوێندیانەوە • چونــکە ژنە چیایی فرمێسکەکانی خۆی پێشان نادا •

کتێب ، نووسین ••• ئەمانە ئەو دوو گەنجینەیەن کــە ئەو وەختەی قاسیدی خوا زمانەکانی پێ بەخشین لــە بیر کرابوون •

کتێب پەنجەرەی والآی خانوون • بەڵام ئێمــە لەناو کوێرە دیوار دانیشتبووین • دەمانتوانی لــە پەنجەرانەوە دەشتی هەراوو دەریای بێ پایان‌و کەشتی عاجباتی بەردەم پیلان بەدی بــکەین • ئێمە وەکو ئـــەو باڵنــدانە بووین کــە زستان بمێننەوەو دەنووك لــە پەنجەرە بدەن‌و بـــە دوای گەرمایدا بگەڕێن • لێوی چیاییەکان ووشك‌و بە بار بوو • چاویان برسی‌و داگیرساو بوو •

« ئەگــەر بمانتوانیایە کاغەزو قەڵەم بەکار بێنین ئەوەندە بە زۆری خەنجەرمان بەکار نەدەهێنا » •

ئێمە هەرگیز لە زین‌کردنی ئەسپو بازدانە سەر خانەی زین‌و هەڵکوتانە مەیدانی شەڕ دوا نەکەوتووین • بۆ ئەمە کەس شەل‌و کەڕو کوێر نەبوە • کەچی لە فێر بوونی ئەم پیتە ووردو بەچاو بێ‌نرخانە زۆر دواکەوتین • کاتێکیش کە بیر لەنگ دەبێ هیچ تاقمێکی پسپۆری (ئونتسوکول) داد نادا •

هەزارو پێنج سەد ساڵ بەر لە ئێستا (میسروپ ماشتۆتز)ی جەنگاوەری بەناوبانگی ئەرمەنی ئەو بیرەی بۆ هات کە نووسین لە چەك بە هێزترە • ئەوە بوو ئەلف‌و بێی ئەرمەنی دانا •

چوومە ماتێنەدەران کە دەستنووسی کۆنی تێدا هەڵگیراوە • لەوێ زۆرم بەزەیی بە داغستاندا هاتەوە کە هەزار ساڵی بێ کتێب‌و نووسین لە دەست چوە • مێژوو بەناو بێژنگی زەمانەدا ڕۆیشت‌و بێجگە لە گۆرانی‌و ڕەوشتی بێ متمانە هیچ دەوسی لێ بەجێ نەما ، ئەویش دەم بە دەم‌و دڵ بە دڵ هاتۆتە خوارێ •

**لە هەقایەتان ،**
**زەمانی کۆن کۆنمان دێتەوە یاد**
**لە هەقایەتەکانی دایکم**
**یەکێکم لە بیرە**

**چیاییەکی نەبەرد لە گوندێکا هەبوو**
**ئیشی مەردانەی دەکرد •**
**ڕۆژی لە ڕۆژان**
**خانی زۆردار بانگی کرد •**

**چیاییەکە ناوی سەلیم بوو**
**چوە ناو کۆشك**
**هەموو دەرگاکانیان**
**یەك یەك بۆ کردەوە**

خان مافوورو گلۆپو فیچقەو
ئاوی وەك مرواریو
هـەرچی گەنجینەی هەبوو
پێشانی دا ٠

چیایی ئەوەندەی شت بینی
نایەتە ژمــــار ٠
هەرچی لەسەر ڕووی زەوی هەبێ
لە کۆشکی خاندا هەبوو ٠

خـانی پیرو بە ساڵا چوو ،
بە مێوانی ئازیزی گوت :
« هەرچی ئەقڵت دەیگرێو دڵت دەیخوازێ
پێشکەشت بێ بیبە !

ئەم شتانە هەموو شتی چاکن
بەڵام لە بیر نەکەی
لە کاتی هەڵبژاردندا پەلە نەکەی
تا پەشیمان نەبیتەوە ٠

بەڵام چیایی ئازاو نەبەرد
زۆر بە هەیبەت وەڵامی دایەوە :
« شیرێکو خەنجەرێکو
ئەسپێکی بە بەزم دەوێ ٠ »

ئەم سندووقانە وێنەیان نیە
بەڵام من نامەوێن ؟
شیرو ئەسپم هەبێ
ئەوانەیشم پێ پەیدا دەبێ ٠

ئاخ ٠ چیاییەکە ! چیاییەکە !
ئاخ ، باپیرە ! چ تاوانێکت کرد
کـە ئەسپو شیرت ویستو
خۆت لـــە کتێب نەگەیاند ٠

**ئاخ باپیرەی ساویلکە**
**کوو ، کاغەزێکو**
**قەڵەمێکت**
**نەخستە ناو هەگبەکەت .**

**باپیرە ، دەروونت پاکو**
**سەرت بەتاڵ بوو .**
**ئەگەر شتێکی وات بکردایە**
**کتێب لە پۆلا سوودی پتر دەبوو .**

**کە چارەنووسی خۆمان نایە دەستی**
**ئەمـــان دەزانی ؛**
**ووشە لە دەمی شیر تیژترەو**
**لـە ئەسپ بلندترو بەهێزترە .**

**جوانیی حیکمەتو**
**حیکمەتی جوانی تێدایە**
**باپیرە ، تۆ وات کرد**
**سـەدان سـاڵ دوا بکەوین .**

**وەك ئـەوەی**
**قوتابیەك درەنگ بـگاتە پۆلو**
**لـــە مێژ بێ**
**دەرز خوێندرابێ .**

جۆرجیا ، نزیکە . تەنیا زنجیرە شاخێکمان لە نێواندایە . بەر لـە سەدەیەك شۆتا ڕوستاڤێلی شیعرە نەمرەکەی خۆی لەبارەی شۆڕە سواری ناو پێستی پڵنگ‌نووسی . ماوەیەکی زۆر لە گۆڕەکەی گەڕانو سەراپای ڕۆژ هەڵاتیان پشکنی . ئافرەتێك گوتی :

« گۆڕی لـە هیچ شوێنێکدا نیە بەڵام دڵی زیندووی لـە هـەموو شوێنێکدا لێ دەدا » .

سەرابای مرۆڤایەتی چیرۆکی پرۆمیسوس دەخوێنێتەوە کــە لــە قەوقاس بە زنجیر لە چیایەك بەسرابوەوە • عارەب هەزار ساڵ بەســەر لاپەڕەی شیعردا گریاون • پێش هــەزار ساڵ هیندەکان هەڵەو ڕاستی خۆیان لەســەر گەڵای دارخورما نووسیەوە • بە دەستی لەرزۆکــەوە دەستم دایە ئەو گەڵایانەو لــە چاوی خۆم نزیك کردنەوە • ئەدی شیعرە سێ دێرییە خۆشەکــانی یابان !! ئــەدی چینی کۆن کــە هەر پیتێك یان هیرۆگلیفێك بیرێکی تەواو دەگەیەنێ !!

ئەگــەر شایەکــانی ئێران شمشیرو ئاگریان نەهێنابایە داغستان ، بەڵــکو حیکمەتی فیردەرسیو ئەوینی حافزو دلێری سەعدیو بیرقوڵی ئیبنی سینایان بهێنایە ناچارنەدەکران بە ڕاکردن بگەڕێنەوە •

لــە نیسابور ســەرم لــە گۆڕی خــەییام دا • لەوێ ئــەو بیرەم بۆ هات : « خەیامی هاوڕێ ! ئەگــەر تۆ لە باتی شا بهاتیتایە وولاتەکەمان ، خەڵــکی چیاکان چەند بە شادومانی پێشوازیان دەکردی !!! »

جــەبر پەیدا ببوو ، ئێمــــە هێشتا شتمــان پێ نەدەخوێندرایەوە • شیعری بەرز باوی هەبوو ، ئێمە هێشتا نووشتەیەکمان پێ نەدەنووسرا •

یەکەم جار سەربازی ڕووسمــان ناسی پاشــان شاعیری ڕووس • ئەگــەر چیایەکانمان پوشکین‌و لیرمەنتۆڤیان بخوێندایەوە ڕەنگە مێژوو خۆی ڕێچکەیەکی دی بگرتایە • چیایەك کە گوێی لە (حاجی‌موراد)ی تۆلستۆی بوو بە دەنگ خوێندرایەوە گوتی : کتێبێ وا ژیرانە هــــەر تەنیا بە خوا دەنووسرێ ، نەك بە بنیادەم » •

هــەر شتێکی بۆ کتێب پێویست بێ هەمان بوو : ئەوینی بەسۆز ، قارەمانی بە جەرگ ، کارەسات ، سروشتی سەخت ـ بەڵام هیچ کتێبمان نـــەبوو •

**چەندمان کارەسات بینی •**
**چەند پیاوی نەبەردو دلێرمان هەبوو •**
**چەند دەست دەمی چەقۆی دەگرتو چەند سنگ ناڵەی دەهاتو**
**لە دیدمونای چیایی نزیك دەکەوتەوە •**

**سەدان ساڵە**
**چەند کەس لە شاخان هاتو چوون**
**وەك هاملێتو ئۆلیفیاو جولێت**
**بەڵام شەکسپیرمان نەبوو •**

**چەند ئاوازو مۆسیقا لە شاخان دەنگی دایەوە !**
**چەند خورەی ڕوبارو جریوەی چۆلەکەمان بیست !**
**بەڵام هیچ (باخ)ی چیاییمان نەبووو**
**چ (بتهۆفن) سمفۆنیای نەنووسی •**

**کە ڕێگای کورتی جولێت دوایی دەهات**
**دەبوو بە مەرگو مردن**
**چاو بە خوێنەکان ، نەك شاعیرەکان ،**
**بە گوللە ، نەك بە ووشە : یادیان دەکردەوە •**

کاتێ چیاییەکان دوای شەڕێکی سەخت دژی جەردەکانی تەیمور لە نزیك کوموخ کەوتنە کۆکردنەوەی دەسکەوت • کتێبێکیان لە گیرفانی کوژراوێك دۆزییەوە • پەڕەکانیان هەڵدایەوەو تەماشای پیتەکانیان کرد • بەڵام کەسی وا نەبوو بتوانێ بیخوێنێتەوە • جا ویستیان بیسووتێننو مشکیەکەی بە با بکەن • لەو کاتەدا ژنێکی ژیر هاتە پێشەوە ، کە پارتو فاتیمەی ئازا بوو ، گوتی : « لەگەڵ ئەو چەکانە هەڵگرن کە لە دوژمن دەستمان کەوتوون • »

« چ پێویستمان پێ دەبێ ؟ کەس ناتوانێ بیخوێنێتەوە ! »

ئەگەر خۆشمان پێمان نەخوێندرێتەوە ، منداڵەکانمان یان نەوەکانمان

دەیخوێننەوە • ئێمە نازانین چی تێدایە • ڕەنگە چارەنوسی خۆمانی تێدا بێ • »

لەو شەڕەدا کە ( سوراکات )ی (تینووس)ی لەگەڵ عارەباندا کردی • عارەبێکی یەخسیر کرد • عارەب ئەسپو چەکو زرێی دانا بەڵام نەیوست ئەو کتێبە دابنێ کە لەسنگی خۆی شاردبوویەوە• سوراکات چەکو ئەسپی دیلەکەی دایەوە ، بەڵام فەرمانی دا کتێبەکەی لێ‌بستێنن • گوتی :

« ئێمە ئەسپو شمشێرمان گەلێ زۆرە ، بەڵام هیچ کتێمان نیە •

عارەبینە ! ئێوە کتێتان زۆرە • بۆچی بە کتێبێك ڕەزیلیمان پێ دەکەن • »

جەنگاوەرەکان پێ‌کەنینو بە سەرکردەکەیان گوت : « ئێمە چ پێویستمان بە کتێبە ؟ پێمان ناخوێندرێتەوە • بگرە نازانین چۆن دەگیرێ • ماقووڵە ئەمە لە باتی ئەسپو چەك بگێڕینەوە ؟!»

« ئەو کاتە دێ کە بخوێندرێتەوە • ئەو کاتە دێ کە بۆ چاپی لە چاکەتو پەپەخاو ئەسپو خەنجەر زۆر بە کەلکتر بێ • »

شای ئێران کە پەلاماری داغستانی داو خرابی بۆ هات ئەو گەنجینەیەی شاردەوە کە هەرگیز لێی‌جودا نەدەبووەوە • شەپکەیەکی لەسەر جێگاکە دانا کە ناڵێکی لەسەر هەڵکەندرابوو • ئەوانەش کە لە دیار بوون هەموو بە فەرمانی شا لە سەریان درا • لەگەڵ ئەمەشدا مورتەزال ـ خان شوێنەکەی دۆزیەوە • سندووقە زێڕو زیوو مرواریەکان و هەموو تالآنێکی شای کەوتە بەردەست • بیست بارە ئێستر بوو • گەنجینەکە هەندێ کتێبی فارسی تێدا بوو • ( سورخات )ی یەك قۆڵی باوکی مورتەزال ـ خان ،

گەنجینەکەی کۆلیەوە ، گوتی :

« کورم ! گەنجینەیەکی گەورەت دۆزیوەتەوە • بەسەر جەنگاوەرەکانی خۆتی دابەش بکە • ئەگەر حەزیش دەکەی بیفرۆشە • لە هەردوو باردا دەتوێتەوە • بەڵام دوای سەد ساڵی دی چاپیەکان دوڕو گەوهەری ناو ئەم کتێبانە دەدۆزنەوە • مەیانچوێنە • لە هەموو گەوهەرێك بەنرختزن •

شامیل سکرتێرێکی هەبوو ، محەمەد زاهیری کەرخی ، قەت قەت لێ نەدەگەڕا بچێتە شەڕ • محەمەد زاهیر ئەمەی زۆر لە دڵ گران بوو •

گوتی : «تۆ بڕوا بە من ناکەی ، ئیمام؟ لێم گەڕێ بچمە شەڕ •»

« ئەگەر هەمووش بفەوتێن ، دەبێ تۆ هەر بمێنی • ئەو پیاوەی بە شمشێر دەجەنگێ یەکێ دەبێ جێی بگرێتەوە • بەڵام مێژوونووس نە• • تۆ کتێبێك لە بارەی شەڕەکانمانەوە بنووسە » • محەمەد کتێبەکەی تەواو نەکرد بوو عەمرێ خوای کرد • بەڵام کوڕەکەی کارەکەی باوکی تەواو کرد • ئەو کتێبە ناوی « بریسکانەوەی شیری ئیمام لە هەندێ شەڕیدا » یە •

شامیل خۆیشی کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو • بیستو پێنج ساڵ بوو لە دە ئێستراني بار دەکردو لەگەل خۆیدا لە شوێنێکەوە دەیگواستەوە شوێنێکی دی • بە بێ کتێبخانە نەدەژیا • کاتێ کە لە چیای ( گونیب ) بە دیل گیرا داوای کرد شمشێرو کتێبەکانی بدەنەوە • پاشان کە لە ( کالوگە ) بوو بە هەموو دەمێ داوای کتێبی دەکرد ، دەیگوت ، « شمشێر گەلێ شەڕی دۆڕاندوە ، بەڵام کتێب هیچی نەدۆڕاندووە • »

کاتێ جەمالەددین لە رووسیا هاتەوە ، ئیمام ناچاری کرد جلو

بەرگی چیاییانەی خۆمان لەبەر بکات بەڵام دەستی لەکتێبەکانی نەدا • بەوان کەسانەی گوت کە دەیانەویست ( کتێبی گاوری ) بخرێتە ناو ڕووبارەوە : « ئەم کتێبانە تەقەیان لێ نەکردووین‌و کەسیان نەکوشتوە • ئەوەی کتێب هەتك بکا ، کتێب هەتی دەکات • »

زۆرم مەراقە بمزانیایە ئەو کتێبانە چی بوون کە جەمالەددین لە سانت پترسبورگ لەگەڵ خوێدا هێنابوون •

داغستانییەکان نووسینی تایبەتی خۆیان نەبوو • زۆر جار ووشەیان بە زمانەکانی دی دەنووسی • ئەمانە لەسەر بێشکەو لەسەر خەنجەر ، لەسەر تەختەی سایتەو لەسەر بەردەکێڵ هەڵکەندرابوون • بە زمانی عارەبی‌و تورکی‌و جۆرجی‌و فارسی بوون • ئەم دەستنووسە ڕازاوانە زۆر بوون‌و کەمیان کۆکراونەتەوە ، بەڵام هیچێکیان بە زمانی تایبەتی خەڵك نەنووسراونەتەوە • چاپیی کە نەیدەزانی ناوی خۆی بنووسێ وێنەی شمشێرو ئەسپ‌و باڵندەو چیاکانی دەکێشا •

هەندێ نووسینی سەر قەبران مانایان بەم جۆرەیە :

« ژنێك لێرەدا ڕاکشاوە کە ناوی ( بوگب بای )یە • عەمری خۆی تەواو کردو لە تەمەنی سەد ساڵیدا مرد • »

« کوبا ـ عەلی لێرەدا ڕاکشاوە کە لە تەمەنی سێ سەد ساڵیدا ، لە شەڕێکی دژی ( ئاجار خان )دا مرد • »

کەلەپارچەی بێ نموود • لە باتی کۆمەڵە بەرگێك مێژوو کەمێك ووشەو دەستەواژەمان بۆ ماوەتەوە •

کاتێ کە لە ئامۆژگای ئەدەبدا دەمخوێند • پیرەمێردێکی چاکی ردێن بۆز کە ناوی (سیرجی ئیڤانۆڤیچ راتسیگ) بوو ، ئەدەبی کۆنی

گریـکی پێ‌دەداین • هـەموو دەقە کۆنەکانی لەبـەر بووو بەشی زۆری هـەر بە گریـکی دەخوێندەوە • ئەشقی گریکە کۆنەکان بوو • حـەزی لێ بوو هـەستی خۆیان بەرامبـەر دەربڕێ • کـە ئەم‌شیعرانـەی دەخوێندەوە بە جۆرێکی وا دەیخوێندەوە دەتگوت نووسەرەکان خـۆیان دانیشتوون‌و گوێیـان لێ گرتوە دەترسا نەوەك هـەڵەیەك بـکات وەکو موسلمانێکی ئیماندار وابوو کـە بە ترسـەوە ئایەتی قورعان بخوێنێتەوە نەوەك هەڵەیەك بـکات • وای دەزانی ئەو شتانەی بۆمان باس دەکـات لـە مێژە دەیانزانین • هەرگیز بە خەیاڵی دانەدەهات کـەس هـەبێ ئۆدیسەو ئیلیادە نەزانێ • وای دەزانێ ئەو گـەنجانەی تازە لەشـەڕ هاتوونەتەوە ئەم چوار ساڵە هیچیان نەکردوە هـەر هۆمەرو ئەسخیلۆس‌و یۆربیدس یان خوێندۆتەوە • ئـەو ڕۆژەی کـە بۆی دەرکەوت ئێمـە ئەوەندە کەم‌زانین هەر وەخت بوو لە هەژمەتان بگری •

لە هـەموویان پتر سـەری لە من سوڕما بوو • ئەوانەی دی بەلانی کەمـەوە شتێکیان دەزانی ، بەڵام کـاتێ کـە لە منی پرسی باسی هۆمـەر بکەم من بە بیرم هـاتەوە کـە مەکسیم گۆرکی بـە (سلێمان ستالسکی) گوتبوو هۆمەری سـەدەی بیستەم ، ئیدی دەستم پێ کرد باسی سلێمانم بۆ کرد • پرۆفیسۆرەکە زۆر بە کەسەرەوە تەماشای کردم : « تۆ لـە کوێ گـەورە بووی ئۆدیسەت نەخوێندۆتەوە ؟ » پیم گوت مـــن لـە داغستان گەورە بوویم کە تا بەم دوایە کتێبی بـە خۆیەوە نەدیوە • بۆ ئەوەش تاوانەکە لەسـەر خۆم سووك بـکەم بە ئاشکرا خۆمم بە چیـایی کێوی دایە قەڵەم • پاشان پرۆفیسورەکە قسەیەکی وای کرد قەت لـە بیرم ناچێتەوە :

« گەنجۆ ! تۆ ئەگەر ئۆدیسەت نەخوێندبێتەوە ، دیارە لـە کێوی خراپتری ، بەربەری ، دڕندەی » •

ئێستا کــه دەچمــه یۆنانو ئیتالیا هەمیشه پرۆفیسۆرەکەی خۆمــم دێتــەوە یاد ـ ووشەکانی ، هەستی بەرامبەر ئەدەبی کۆن •

بەڵام مــن کــه به حاڵ دەمتوانی به ڕووسی بنووسمو بخوێنمەوە ، چۆنم بتوانیایه هۆمــەرو سۆفوکلیسو ئەرەستۆ و هیسیۆ بناسم ؟ لـــەم دونیایەدا ، داغستان زۆر شتی به دەست نەدەگەیشت له زۆر گەنجینــه بێ بەش بوو • زۆر جــار ئەوەم باس کردوە چـــۆن (ماکســاکۆڤا)ی گۆرانیبێژ کاتێك کـــه گوێی له (تاتام موراد‌ۆڤ) بوو گۆرانی دەڵێ ، گریا • موراد‌ۆڤ قــەت هیچی نەخوێندبوو • ئەو کــاتە تەمەنی شەست ســـاڵ بوو • هـــەموو دەیانزانی دەنــگی گۆرانیبێژەکە ماکساکوڤای بزواندوە ، بەڵام خۆی گوتی : « من له داخان دەگریم • دەنگی چــەند خۆشه ! ئەگــەر له وەختی خۆی مامۆستای هەبایه دونیای شێت دەکرد تازە تێــەڕی » •

هــەر کاتێ کــه بیر لــه چارەنووسی داغستان دەکەمەوە ئەم قسانەم دێتــەوە بیر • ئەمــانه هــەر تەنیا لەگــەڵ حــاڵی (تاتام)دا ناگونجێن • چەند گۆرانیبێژو جەنگاوەرو هونەرمەندو زۆرانباز ، بێ ئەوەی دونیـــا بــه بەهرەیان بزانێ چوونەتـــه ناو گۆڕەوە ، ناویان لـــه بیرکراوە • بێگومان ئێمـــەش چالیاپنسو پۆدوبنیس/ی خۆمــان هەبوە • عوسمان عەبدوڕەحمانۆفی هەرقەلمان ، ئــەگەر شان به شانی ئەو هێزو تاقەتەی که هەیبوو ، کارامەیی هونەریشی هــەبایه دەبوە زۆرانبازێکی نەبەزو بــێ وێنــه • بەڵام ڕاهێنەری نەبوو • ئێمه هیچ ئامۆژگایەکی مۆسیقا ، شانۆ ، کۆلیج ، ئەکادیمیاو بــگرە قوتابخانەشمان نەبوو •

**تابلۆی پیرۆزمان نیه باسی ڕۆژگاری کۆن بکا**
**وای لەم زیانه ، بەڵام ڕێــگا مان دوایی نایه •**
**ئەو چیرۆکەی باپیرە گەورەکانمان به شیر دەستیان پێکرد**
**من وا به قەڵەم تەواوی دەکەم •**

چاپی نەیاندەزانی قەلەم بگرنو ووشە جنجە بکەن • بیانویستایە تەسلیم بن وەك زابارۆجەکان پەنجەی ئەسپێ کوژەیان دەخستە بەینی شادە نوێژەو دۆلە درێژەو بەم جۆرە بەرزیان دەکردەوە • یان شتێکی لەمە جوانتریان ڕەسم دەکێشاو بۆ دوژمن دەچوون •

چاپیەکان نەیاندەزانی چۆن قەڵەم بگرن ؟ پیتەکان چۆن بنووسن ؟ کە دوژمن داوایان لێ دەکردن خۆیان بە دەستەوە بدەن یان ئاڵایەکیان هەڵدەکردیان شتێکی ئاشکراتریان دەردەهێناو ڕەوانەیان دەکرد •

لەبارەی داغستانەوە گوتراوە : « وەکو گۆرانیەکی نەنوسراوو نەگوتراو وایە کەوتۆتە نێو سندووقە بەردێکەوە • کێ دەری دێنێ ؟ کێ دەینووسێتەوە ؟ کێ دەیبێژێ ؟ »

پیت و ووشە و کتێب ـ کلیلی تۆپی ئەو سندووقەن چ دەستێك کلیلی قوفڵی قورسو کۆتی سەر داغستانی هەڵگرتووە ؟

زۆر کەس لە قوفڵەکە نزیك بوونەوە • هەندێ جار پەلکەی سەر قوفڵەکەشیان لادەدا بۆ ئەوەی تەماشای ژووریّ بکەن • داغستانیەکان خۆیان هێشتا نەیاندەتوانی قەڵەم بە دەستەوە بگرن کە زۆر مێوانو ڕێبوارو زانا بە زمانەکانی دی وەك عارەبیو فارسیو تورکیو یۆنانیو جۆرجیو ئەرمەنیو فەرەنسیو ڕووسی دەربارەیان دەنووسین •

داغستان ! لە کتێبخانە کۆنەکاندا لەناوی تۆ دەگەڕێمو لە زۆر زمانانەدا دەیدۆزمەوە • ناوی دەربەندو کوباچیو چیرکێو خونزاخ هاتوە • سوپاسم بۆ ئەو ڕێبوارانە • ئەگەرچی نەشیانتوانیوە لە ئالۆزیو قووڵیت بگەن • بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکەم کەس بوون ناویان بۆ ئەو دیو شاخان بردیت • ئنجا پوشکینو لیرمەنتۆف قسەی خۆیان کرد •

**به قرچەی نیوەڕۆ ، لە ژێر ڕەوەزە شاخێکی داغستان**
**کەوتبووم ، بە گوللە پێکرا بووم‌و بە ئاستەم هەناسەم دەهات**

دێری جوانن ! (بێستۆژێف مارلینسکی)یش ـ ئەممالەت بەگ ـی خۆی نووسی • ئەو کێلەی لەسەر گۆڕی دەزگیرانەکەی چەقاند لە گۆڕستانی دەربەند هەر ماوە •

ئەلکساندەر دۆماس سەری لە داغستان دا • هەروەها پۆلیجایف کە شیعری (ئەرپێلی)و (چیریورت)ی نووسیوە • هەریەکە بە شێوەی تایبەتی خۆی لە بارەی تۆی نووسی ، بەڵام هیچێکیان وەکو لیرمەنتۆڤی گەنج‌و لیو تۆلستۆی بەختیار وا بە قووڵی تێت نەگەیشتوون • سەری بۆزم لە پێش ئەوانە کۆت دەکەم‌که گۆرانیان بۆچڕیت • موسلمان چۆن قورعان دەخوێنێتەوە ئاوها ئەم کتێبانە دەخوێنمەوە •

ئەو ڕۆژەی کوڕ ناوی لێ دەندرێ ڕۆژی خۆشییە • داغستان ! ئەو ڕۆژەی کە یەکەمجار ڕۆلەکانت بە زمانی خۆیانە لە بارەی تۆیان نووسی لەوە کەمتر نیە •

هەلەی خۆمم لە بیرە ، کاتێ کە (ڤێراڤاسیلێڤنا)ی یەکەم مامۆستام بانگی کردمە لای تەختەو داوای لێ‌کردم ناوی تۆ بنووسم • نووسیم Daghestan • ڤێراڤاسیلێڤنا شروڤەی کرد کە داغستان ناوی شوێنەو دەبێ پیتی یەکەمی بە شێوەی گەورە بنووسرێ • جا نووسیم Ddaghestan وام زانی هەر دووکیان گەورەکن • جاری سێیەم ڕاستم کردەوە Daghestan •

تۆش وات لێ‌نەهات ، داغستان ! کە فێر بووی ناوی خۆت بنووسی ؟ زۆر جار ناچار دەبووی لەسەرەتاوە دەست پێ‌بکەیتەوە • پیت‌و ئەلف‌وبێت هەڵدەبژارد • بە پیتی عارەبی‌و لاتینی‌و ڕووسیت

نووسی – تووشی زۆر هەڵە بووی .

کە شوێنێك پیتی گەورەی بویستایە بە پیتی گچکەت دەنووسیو کە شوێنێك پیتی گچکەی بویستایە بە هی گەورەت دەنووسی . داغستانەکەم ! تەنیا بۆ جاری سێیەم بوو کە توانیت بە ڕاستی بنووسیت . ئەمانە ناوی یەکەم کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامەکانی داغستانن :

ئەستێرەی بەیان ، تیشکی نوێ . چاپی‌سوور . جەیران . پەندی چیا . ئەفسانەی کومیك . ئاوازی لەك . چیرۆکی دارجین . شیعری لازجی . داغستانی سوڤیتی . هەموو بە زمانی زگماك بوون . ئەمانە بەس ناوونیشان‌نین ، پەڕو باڵن .

سالی ١٩٢١ ، پاش ئەوەی لینین لەگەڵ وەفدی داغستانی راوێژی کرد . سێ شتی لە هەموو شتان پێویستری بۆ وولاتە شاخاویەکەمان نارد : گەنم ، قوماش ، چاپ . داغستان ئەسپو خەنجەری هەبوو . لینین کتێبو گەنمی بۆ نارد . شۆڕش خۆی دەسەر لانکی داغستان داهێنا . داغستان دەریای بینی ، خۆی بینی ، ڕابردووو ئاییندەی خۆی بینیو لەبارەی خۆیەوە دەستی بە نووسین کرد . سلێمان ستالسکی لە مەکسیم گۆرکی کرد : « ئێمە هەردووکمان پیرین . ژیانی خۆمان بردە سەرو دیناماندی . هەردووکمان کتێبمان هەیە . بەڵام تۆ خوێندەواری‌و لەسەر کاغەزت نووسیوە . کەچی من گۆرانی دەڵێم ، چونکە نازانم بنووسم . ئێمە ڕەمزی داغستان‌و ڕووسیاین . رووسیا خوێندەوارە . لە داغستاندا زۆربەی خەڵك هێشتا نازانن ناوی خۆیان بنووسن . لەباتی ئیمزا پەنجەمۆر دەکەن . ناتوانی تیپێك نووسەری رۆشەنبیرمان بۆ بنێری بۆ ئەوەی باسی ئێمە بۆ سەراپای وولاتو تێکڕای دونیا بکەن ؟ » .

ئەفەندی کەپاییف تەرجومانی نێوان سلێمان ستالسکیو گۆرکی بوو • گۆرکی هـەرێی دا سلێمـان چی دەوێ بۆی بـکا بەڵام گوتی : (مـەبەستیشی کـەپاییف بوو) ئێستا نەوەیەکی گـەنجو بەهرەداری ڕۆشنبیر لـە داغستان پێگەیوە ••• ئەگـەر داغستانیەکان خۆیان بـە هـەموو زمانەکانی کۆمارەکە لە بارەی وولاتی خۆیانەوە بنووسن زۆر زۆر باشترە چونکە گۆرکی گوتی - ئێمـە پەندێکمان هـەیە دەڵێ - دۆخی ماڵ لە نێو دیوارەکانیەوە باشتر دەزاندرێ •

ئەو نەوە گەنجەی گۆرکی باسی کردوە ئێستا پێگەیوەو کەوتۆتە سالانەوە • زۆر کتێبیان لـە بارەی داغستانـەوە نووسیوە و هێشتـاش دەنووسن • لەسـەر دەمی کۆندا - باوك شیرو پاندوری بۆ کوڕی بـە میرات بەجێ دەهێشت • ئێستا قەڵەمو کتێب بەجێ دێلی • ڕۆژ نیـە لـە داغستاندا کوڕێك بەسـەر دونیـا نەکەوێ • ڕۆژ نیە کتێبێك دەرنەچێ • هـەر بابایە لـە بارەی داغستانی خۆیەوە دەنووسێ • باوکم پەنجا سـاڵی زیاتر نووسی • تەمـەنی درێژ نەبوو • ئێستا من دەنووسم ، بەڵام منیش ئەو هەموو شتەی دەمەوێ پێم نانووسرێ • بۆیە لەباتی خەنجەر قەڵەمێك و دەفتەرێك لـە سەرینگانی منداڵەکانم دادەنێم • منو باوکم یەك داغستانو عەینی داغستانمان هەبوو ، بەڵام داغستان لە زمانی پێنووسەکانماندا زۆر جودایە !

هـەر کەسـە دەستخەتی خـۆی ، پێتی خۆی ، شێوازی خۆی ، ئاوازی خـۆی هـەیە • بەم جۆرە گالیسکەکە دەڕواو لە ڕێـگەی دوورو درێژی خۆیەوە لیخوڕەکانی دەگۆڕێ •

باوکم دەیگوت : « لە بارەی ئـەو شتەوە بنووسە کـە دەیزانی ، ئەوەی دەتوانی لەبارەیەوە بنووسی ، بەڵام ئەوەی نایزانی لە کتێبی خەڵکی تردا بیخوێنەوە • »

## کتێب

**دۆستێنی کتێب بکە ، لاپەڕە پیرۆزەکانی**
**چاوەڕێی نیگای تۆن • کتێب زۆر دڵسۆزتە •**
**چ هێندەی خان دەوڵەمەند بیو چ فلسێکت نەبێ**
**کتێب ناپاکیت لەگەڵ ناکاو تەفرەت نادا •**

**هەنیە دابێنەوە سەر لاپەڕەکانی •**
**هەموو دێرێکی پڕ هەنگوینی حیکمەتە •**
**ڕۆڵە ئەشقی زانین بە ، ئەگەر لەم هەنگوینە**
**نەخۆیتەوە نەمێشکت تێراو دەبێو نە بە ئامانج دەگەی**

**کتێب چەکی تۆیە • فرێی مەدە •**
**هاوڕێی دڵسۆزی تۆیە •**
**چ بیشکێنی چ پێی هەڵبلێی چ پشتگوێشی بخەی**
**قەت لە تەنگانە ڕسوات ناکا •**

**بە برادەری زانین • ماڵی دەوڵەمەندە •**
**بەخشیشی زۆرە • باخچەی ڕازاوەیە ،**
**تۆش مێوانێکی ئازیزی ئەم باخچەیەی**
**برۆ ، بەری گەییوی بۆ خۆت بڕنە •**

**خەونو ژیانت بخەرە ناو کتێب**
**شاعیر بێ پرس دەچێتە ناو دڵان •**
**هەر چیت لە دڵدایە بۆ شیعری بدرکێنە •**
**وەڵامی هەموو شتێ لە خەندەی سەر لێوی شعر دایە •**

کە شاعیرە لاوەکان شیعری خۆیان دەهێنایە لای باوکم باوکم یەکەم جار تەماشای دەست خەتی دەکردن چونکە « خەتە جوت چۆن بێ جوتیار وا دەبێ » • ئینجا هەڵەکانی ڕاست دەکردوەو خاڵبەندی دەچەسپاند • سەری بادەدا وەك ئەوەی بڵێ : فێر بن بە ڕاستی بنووسن• هەندێك بە دوو دڵییەوە باسی ئەوەیان دەکرد کە «هۆمەری سەدەی

بیستەم » نەخوێندەوار بووە • باوکم وەڵامی (هۆمەر)ەی لاوەکەی دەدایەوە « دەنا من نەمزانیوە ! » تا ئەمڕۆش زۆر هۆمەری وا لە داغستاندا هەن• باوکم لە بچووکترین هەڵەی زمانەوانی زۆر تووڕە دەبوو • کە شیعرێکی لە ڕۆژنامە چاپ بووو دیتی زۆری هەڵە تێکەوتو ئەم شیعرەی لەسەر دانا :

**گۆرانیەکەم تووشی نەگبەتی خۆی هات •**
**کتو پڕ**
**لە جەژنی داغستاندا**
**بۆ ڕۆژنامەم نارد**

**کە دیتم ، دەتگوت هەرزنە**
**کوتراوە •**
**دەتگوت لە ڕێگادا**
**تۆپزکوتیان کردووە •**

**یان تووشی تاقمێ**
**سەرخۆشی خوێڕی هاتوە**
**شاییان لەسەر پشتی**
**دابەستوە**

**یان چۆتە سکۆتلاند**
**چۆتە مەیدانی شەڕە بۆکس**
**خۆی پێچاوەتەوەو**
**بێ بەشیان نەکردووە •**

**لە چوارینەکانیان داوم**
**پشتیان شکاندووم**
**کەس**
**لە مانایان ناگات •**

**بۆ ئەوەی تەواوی کەمن**
**قامچیکێشیان کردووە**
**گیانی تێدا نەماوە •**

**وا ئاوزنگ دەدا •**

**ئـەی کەللەی کلۆل ،**
**ئەوەندەت پۆرگ‌و شوو پێوەیە نایەتە ژمار**
**دانـی پێـــدا دەنێم •**
**ئـەم کارە کارێکی نابەجێیە •**

**گۆرانیەکەم هیچ پەراسووی ساغی نەماوە •**
**بە دوو چـاوی لێلەوە دەڕوانێ •**
**وەك مستەوا بەرەللای خۆمـان**
**کـە لـە بن داران پان بوەوە •**

**ئەگـەر لەیەك تاکـە ژمارە**
**دە (قوربانی) واتان هەبێ**
**لە هەموو جێگایەك ناو دەردەکەن !**
**ئەی پاڵەوانانی هەڵەی چاپ !**

**بەڵام ڕەخنەی خۆیی**
**دەتوانێ دەردەکە سووکتر بـکا •**
**جا تـکایە ، ئەم شیعرەیشم**
**بۆ بڵاوبکەنەوە •**

باوکم هەموو ئەوانەی کـە ناسیویانە ، هەر یەکە بیروباوەڕی خۆی دەرهـەق هەبوە •

بێ‌گومان باوکم زەوی دەکێڵاو دروونەی دەکردو قرشەی لـــە عارەبانە بار دەکردو ئەسپەکانی ئالیك دەداو سواریان دەبوو • بەڵام مـن دەبینم تەنیـا کتێبی بە دەستەوەیە • بە هەموو دەمێ کتێبەکەی وا دەگرت دەتـگوت جۆلەکەیەو دەترسێ نەوەك لـە شەقەی باڵ بدا • ئەگەر چی پێی خۆش بوو مێوانی بێ بەڵام کـە یەکێ بهاتایەو لـە خوێنـدنەوەی بکردایە زۆر پەست دەبوو • دەتگوت نوێژێـکی پیرۆزو بەنرخیان لێ بڕیوە • ئـەو کـاتەی کـە باوکم دەیخوێندەوە دایـکم لەسەر پەنجەی

پێ هـاتو چۆی دەکردو پەنجەی بۆ لێوەکانی بەرز دەکردەوە • وای لێدەکردین بە چپـە بدوێین •

« گاڵە مەکەن • باو ئیش دەکات • »

ڕاستی دەکرد • نووسەر ئیشی خوێندنەوەیە •

دایـکم جاروبار خۆیشی سـەری لە ژووریَ هەڵدەکێشا بۆ ئەوەی بزانێ نەوەك باوکم شتێکی پێ بوێ بۆی هـەبوو مەرەکەبی لــە کورتی بدایە • دایـکم سەرنجێکی تیژی لە مەرەکەبدانەکەی دەداو قـــەت لێنەدەگەڕا چك بێ •

ئەگـەر ژیانی باوکم دوو ڕۆژی خۆشی تیـدا بووبێ سەبارەت بـــە کتێب بوە • ئەگـەر ژیانی باوکم دوو ڕۆژی ناخۆشی تیـدا بووبێ هـەر سەبارەت بە کتێب بوە •

ئەو کتێبانەی دەیخوێندنەوەو ئەوانەی دەینووسین •

خەڵـکی داوای هـەر شتێکیان لێبـکردایە دەستی بـــە ڕووەوە نەدەنان • بەلایەوە درۆیەکی زلو تاوانێـکی گـەورە بوو ئەگەر شتێکی هەبێو بڵێ نیەتم • بەڵام ئەگـەر کتێبێکی نازداریان لێبخواستایە زۆر پێ تێك دەچوو • کتێبەکەی دەکەوتە بەر دەستان کـەچی باوکم هــەر دەستی بۆ درێژ دەکرد • ئەگـەر کتێبەکـە تا ماوەیەکی زۆر نەگەڕاباوە باوکم بۆ کتێبخوازەکەی دەنووسی : « زۆر غەریبی ئەو کۆنە برادەرەم دەکـەم کـە تۆ لەگەڵ خۆتدا بردت • ئەرێ بیر لە هاتنەوە ناکاتەوە » • باوکم تاقـە برای حەفت خوشـکان بوو • زوو هەتیو کەوتن • باوکم بە منـداڵی گوندی خۆیانی بە جێ هێشت ، چونکە ئەو مامەی هەتیوەکانی بەخێو دەکرد هەمزەی لەجێگایەکی دی خستە مەدرەسەوە • دەیـگوت

ئەقڵوحیکمەت لــە گوندی گەورەدا زیاترە • لەو کاتە بە دواوە باوکم دێ بە دێ دەگەڕا • دوو بوخچــەی بەسەر شانەوە بوو • یەکێ کتێبی تێــدابوو ، ئەوی دی ئارینۆك •

باوکم کــە هاتەوە سامانێــکی زۆری هێنایەوە • لــەو گــەڕانەدا لەزانیاری زۆر دەوڵەمەند بوو لــە گۆدێکانی دێدا پێیان گوت : « ئەگەر بەهرەو زانینت لە گالیسکەیەك بخرێ دوور دەڕۆی • » ڕاستیان دەکرد باوکم ناوێــکی باشی دەرکردوە و زۆر دێرە شیعری بوونەتە پەند •

باوکم زۆری بۆ گەوران‌و منداڵان نووسی • بۆ ئەوانەی تازە دێنە دونیــاوەو بۆ ئەوانەی ماڵاوایی لێ دەکەن • شیعرو شانۆگەری‌و داستان‌و چیرۆکی نووسی • دەستخەتی ڕێك‌و ڕەوان بوو • زمانەکەیشی هــەر وا بوو • هــەمزە کــە لاو بوو ، ئەوانەی دەیانزانی خەتی خۆشــە داوایان لێ‌دەکرد دۆکەمێنت‌و بڕیاری گرنگیان بۆ ڕونووس بکات ، کە ئاراستەی هــەموو ڕەمــەکی خەڵك دەکرا • باوکم بە زۆر ئەلف‌و بێی جۆر بـــە جۆری دەنووسی : بە عــارەبی‌و بە لاتینی‌و بە رووسی • لــە ڕاستەوە بۆ چــەپەو لە چەپەوە بۆ ڕاســتەی دەنووسی • لێیان پرسی : «بۆچی لـــە چەپەوە بۆ ڕاستە دەنووسی ؟ »

« دڵ‌و ئیلهامم لــەلای چــەپەیە • هەر شتێکی بە لامانەوە ئازیز بێ توند بەلای چەپەی سنگمانەوە دەیقرسێنین • »

« ئەدی بۆ لە ڕاستەوە بۆ چەپە دەنووسی ؟ »

« پیــاو هێزی لــە ڕاستەدایە ، لــە دەستی ڕاستەدایە • تۆ تەنیــا بە چاوی ڕاستە سێرە لە نیشانە هەڵدەگری • »

بێ‌گومان ئەمە نوکتە بوو ، بەڵام فێربوونی ئەو هەموو ئەلف‌و بێیە

جۆر بە جۆرە نوکتە نەبوو • راستە ، باوکم هەمیشە شیعرەکانی بە زمانی زگماکی ئاڤاری دەنووسی ، بەڵام هەندێ شیعری بە عارەبیش دەنووسی• ئەمانە بە گشتی شیعری زۆر تایبەتی بوون ، لە ماڵێ کەسمان پێی نەدەخوێندرایەوە • بەڵام زۆر کەم بوون • هەمزە لە بنەڕەتدا دژی ئەم جۆرە شیعرانە بوو • دەیگوت : «شیعر نابێ بە جۆرێکی وابێ کە دایكو کچو خوشك پێیان نەخوێندرێتەوە • ڕاستی قەت حەز لەو فلیمانە ناکەم کە ناشێ منداڵی لە شازدە ساڵ بەرەو ژێر بیانبینن • »

باوکم خەتی عارەبی لە هەموو خەتەکانی دی زیاتر بەکار دەهێنا• پیتەکانو شێوەی پیتەکانو جوانی پیتەکانی خۆش دەویست • لە نووسینی شڕ پەست دەبوو • جارێکیان نامەیەکی لە برادەێکی دێرین بۆ هات بە عارەبیەکی ناڕێك نووسرابوو ، ئەویش بە گاڵتەوە بۆی نووسی :

پیتێکت دەهۆڵێکی دراوەو
خاڵی ناوی کەرپووچێکی گرانە
پیتێکی ترت کەلاوەی بێ ساپیتەیەو
تەنیا کۆڵەگەکانی بە پێوە ماون •
ئەم پیتە کلۆڵەش لەبن بەردی زل
ووردو خاش بوە •
پێم بڵێ چۆن ئەم بارە قوڕسەت لێناوە ؟
پیتێکی دیش تەپڵەی تاسەر بڕۆیان هاتوە •
هەر دێرێکت لاپەڕەیەکی داگرتوە •
ئەرێ ئەوە لەباتی قەلەم بە چڕنووکی پشیلەت نووسیوە ؟
پیتت وەکو درەختێکی چڵ بڵاو وایە
لاپەڕەت وەکو دارستانێکە •
ڕەشەبا لێی دابێو
کەوتبێتە بەر تەوری دارکەران ،
سەیرە ! ئەم نووسینە لە کوێ فێر بووی ؟

ئەو کاتە زۆر کەس بەم شیعرە تووڕە بوون ـ هەندێك بۆیە تووڕە بوون چونکە باش تێی نەگەیشتنو هەندێکیدیش چونکە زۆر باش

تێی گەیشتن • هەندێ وا تێ دەگەیشتن هەمزە گاڵتە بەپیتە عارەبیە شڕەکان ناکا ، بەڵکو گاڵتە بە نووسینی عارەبی دەکا •

بەڵام باوکم بە بیریدا نەدەهات ڕەخنە لە ئەلف‌و بێیەکی وا بگرێ • بەردی دەهاویشتە باخچەی ئەو کەسانەی کە لە کەمتەرخەمیدا فەوتاندبویان ، ئەوانەی گوێیان پێ نەدەدا • بە گشتی ، قەت قسەیەکی خراپی بە هیچ ئەلف‌و بێیەك نەدەگوت • ئەوەی وایشی بکردایە بە سەریدا دەڕۆیشت •

باوکم دەیگوت : «ڕاستە ، عارەب پەلاماری داغستانیان دا بەڵام نابێ نووسین‌و کتێبی عارەبی سەبارەت بەمە لۆمەی بێتە سەر • »

پاش شێوکردن ، گوندیەکان بە زۆری لەسەر بانی خانووی ئێمە خڕ دەبوونەوە و باوکم چیرۆکی بەتامی بۆ دەگێڕانەوە یان شیعری بۆ دەخوێندنەوە ، شیعری عارەبی جوت‌ئاواز هەڵدەڕژا •

باوکم ڕووسی نەدەزانی دەبا بە عارەبی چیخەف‌و لیۆ تۆلستۆی بخوێنێتەوە • ئەو کاتە چاپیەکان هێچیان دەرهەق ئەوانە نەدەزانی • باوکم چیخەفی لە هەمووان خۆشتر دەویست بەتایبەتی چیرۆکی (مارمیلۆك)ی کە زۆر جار خوێندنەوەی دووپات دەکردەوە •

بەگشتی ، زمانی عارەبی زۆر بڵاو بوو • هەندێك بۆیە بە عارەبی دەیاننووسی چونکە داغستان هیچ زمانی نووسراوی خۆی نەبوو • هەندێکی دی ، چونکە وا تێ دەگەیشتن عارەبی لە زمانەکانی داغستان ڕەوانترو بە پیت‌و بەرکەتترە •

هەموو فەرمانێکی میری هەر بە عارەبی دەنووسرا • هەروەسا نووسراوی سەر بەردەکێلان • باوکم باش دەیتوانی بیانخوێنێتەوە و مانایان لێك بداتەوە •

جا ئەو سەردەمە هات کە زمانی عارەبی بوو بە پاشماوەیەکی بورژوازی سەردەم تێپەڕیو • ئەوانەی بە عارەبی دەیاننووسی‌و دەیانخوێندەوە کەوتنە ئازارەوە • هەروەها کتێبی عارەبیش •

سەراپای ئەو کتێبخانانەی کە بە کۆڵەمەرگی لە لایەن ڕۆشنبیرە داغستانییەکانی وەکو (عەلی بەگ تاخۆ ـ گۆدی)و (جەلال کۆرماسۆف) کۆ کرابوونەوە لەناو چوون • (جەلال) لە (سۆربون) خوێندبووی • دوازدە زمانی دەزانی‌و برادەری ئەناتۆل فرانس بوو • زۆر کۆنە کتێبی لە گوندە شاخاویەکان کۆکردەوە • بە چەك‌و ئەسپ‌و مانگاو دوایش بە چەنگە ئاردێك‌و پارچە کوتاڵێك دەیکڕین • گەلێ دەستنووسیش بن‌گوم بوون بە ڕاستی زیانێکی تاڵەو تۆڵەی نایێتەوە ! •

کتێبی ئازارخواردەی داغستان ! تۆ بە زۆر دەستخەت ، بە زۆر زمان نووسرا بووی • بۆیە تۆیان نووسی چونکە دەبوا بتنووسن • زۆر لەخۆبوردوانە نووسیان • چاویان لە پاداشت نەبوو • ئەو کتێبەش لەلایەن شۆڕشەوە بڵاوکرایەوە •

ڕۆژنامەی (چیایی‌سوور) دەرچوو • پاشان بوو بە (چیایی)و ئینجا (چیایی بولشەفی) • ئەم ڕۆژنامەیە بوو کە یەکەمجار شیعرەکانی باوکمی بڵاو کردەوە • چەند ساڵ بوو باوکم نەك هەر لەم ڕۆژنامەیەدا دەینووسی ، بەڵکو سکرتێریشی بوو • ئەو حەلە پێم سەیر بوو چۆن شیعرەکانی وا زوو چاپ دەبوون • سەیرەکەش لەوەدا بوو ئەوەی ئەمڕۆ دەمدی دەینووسیتەوە بۆ بەیانی‌چاپ دەبوو • پاشان شیعرەکانی کۆدەکرانەوەو دەکرانە کتێب • هەموو ژیانی باوکم ، هەموو بەرهەمەکانی چوار بەرگی ئەستوور بوو •

باوکم لە ژوورەکەی خۆیدا مرد • لەناو کتێبەکانی ، لە تەك

قەڵەمپاندان و قەڵەمڕەش ، لە تەك کاغەزی نووسراوو نەنووسراو ، کە ماوەی نەمابوو بیانووسێ . باشە ئەوانەی دی بۆی تەواو دەکەن .

داغستان دەخوێنێ . داغستان دەخوێنێتەوە . داغستان دەنووسێ . ئێستا پێتان دەڵێم من خۆم چۆنم خوێند ـ یان ووردتر بڵێم چۆنیـــان پێ خوێنـــدم .

ئەو حەلە تەمەنم پێنج ساڵان بوو . سەراپای داغستان لەسەر کورسی خوێندن دانیشت بوو .

قوتابخـــانەی گشتی و قوتابخانەی هونەری یەك لـــە دوای یـــەك دەکرانەوە . پیرو منداڵ ، ژن و پیاو ، هـــەموو دەیانخوێند . هـــەڵمەتی نەهێشتنی نەخوێندەواری بوو . هـــەڵمەتی ڕۆشنبیری بوو . یەکـــەم سیارەی خۆمم لەیادە ، یەکەم دەفتەرم لە بیرە کـــە باوکم بۆی کڕیم . باوکم خۆیشی لە گوندان دەگـــەڕاو خەڵکی هان دەدا بچنە بەر خوێندن .

یەکـــەم ئەلف‌وبێمان بەدەرکەوت ـ باوکم پێشوازیەکی گـــەرمی کرد . هەمیشە بە قووڵی هەستی دەکرد کە بێبەش بوونمان لـــە زمانێـــکی نووسراوەوە ، داغستان لە ڕۆشنبیری گەورەی ڕووسیا دادەبڕێنێ .

دەیگوت : « داغستان پارچـــەیەکی وولاتی گـــەورەمانە . دەبێ بیناسین . کتێبی ژیانی بخوێنینەوە . دەستخەتەکەی لێـــك بدەینەوە » .

«ڕێگای نوێ» «ڕوناکی نوێ» «گەلی نوێ» ـ ئەمانە دروشمی ئـــەو سەردەمە بوون . باوکم منداڵەکانی خۆی نارد بەدەم بانـــگەوازی ڕۆژی نوێوە بچن . نوێیەکە بە ئاسانی ڕێچکەی خۆی پێ نەدەشکا . زۆر کەس بەردیان بەســـەردا بەردایەوە . زۆر پەنجـــەرەی قوتابخانەکانی زوو شکێنران . دوژمنانی خوێندەواری دەیانگوت : «ئەوە چ جۆرە دونیایە کە

شوان کتێبان بخوێننەوە ؟ و ئاشەوان فێرە دەرس بن ؟ ئەوانە دەبێ پــەز بلەوەڕێنن‌و گــەنم بهاڕن • » شتی خراپتریش هــەبوو ، لە بیرمــە گوللەیەکیان لە مامۆستا گرت‌و بە نەخشەی‌سەر دیوارەکە کەوت • باوکم گوتی : «ئەو پیاوکوژە وەخت بوو بەو گوللەیە دونیا بریندار بکات • »

لەو سالآنەی زوودا ، لــە گەلێ دێدا هــەوڵیان دەدا فێرکردنی نوێ لەگــەڵ فێرکردنی کۆنی ئایینی بە یەکەوە ببەستنەوە • جاری وا هــەبوو هــەر دووك تێکەڵ دەکران • زەحمەت بوو بزانی دوکان لە کوێیەو بازاڕ لە کوێیــە ؟ عــەلی لە کوێیەو عومەر لە کوێیە ؟ برا گەورەکـانم چوونــە قوتابخـــانەی لاوانی کۆمۆنیست • من بەخیلیم پێ دەبــردن • بەڵام دڵی خۆم بــەوە دەدایەوە هــەموو ڕۆژێ بە تاسەوە چـــاوەڕوانم دەکردن بگەڕێنەوە • زۆر تەنــگاو بووم دەست بە خوێندن بکەم • بەڵام هێشتـــا حەفت ساڵم تەواو نەکردبوو •

پاشان قوتابخانەیەك لە گوندەکەماندا بۆ ئەو کەسانە کرایەوە کــە نەیاندەویست منداڵیان بنێرنە قەلآی خونزاخ • ئــەم قوتابخانەیە نیمچــە ئایینی بوو • پێیان دەگوت قوتابخانەی حەسەن •

حەســەن پیاوێــکی باش‌و میهرەبان بوو • بیروباوەڕی ســـەیری هــەبوو • لەو بڕوایە دا بوو دەبێ شتی کۆن‌و نوێ پێکەوە ببەسترێتەوە • هــەر خوا دەزانێ چۆنی توانی بوو لــە مێشکی خــۆیدا بەیەکـــەوە بیانبەستێتەوە • لەیەك کاتدا کۆمسۆمۆلی دێیەك‌و مەلای دێیەکی دی بوو • ئەنجامی ئەم کـارەش هێندە بزر نیە • لە مەلایەتی دەرکرا چونکە لــە کومسۆمۆل بوو لە کومسۆمۆلیش وەدەرنرا چونکە مەلا بوو • لە شەڕی نیشتمانیدا پارتیزانی سوور بوو •

ئــەم پیــاوە بوو کــە چارەنووس کردی بە یەکەمین مامۆستای من •

جـا لەبەر ئەوەی گوناح نیە پیـاو کەمێ باسی یەکەم مامۆستای خــۆی بـکات ، سێ کورتە چیرۆك دەگێڕمەوە کـە وێنەیەکی ئەم پیـاوە پێشان دەدەن :

**١ ـ حەسەنو بەندی :**

جارێکیان پارتیزانەکان سەربازێکی دژی شۆڕشیان بە دیل گرت . دەبوو ڕەوانەی بارەگای (موسلم عەتاییف)ی بـکەنو ئەم کارەیان بــە حەســەن سپارد . لە سەرەتاوە ئیش باش ڕۆیشت . بەڵام کــە وەختی نوێژ داهــات حەسەن لەسەر گۆمێك وەستاو دیلەکەی لە تەنیشت خـۆی لەسەر بەردێك داناو دەستی بە نوێژ کرد . دیلە تـکای لێ‌کرد دەستی بـکاتەوە بۆ ئەوەی ئەویش بتوانێ نوێژەکەی بە چاکی بکات . حەســەن شاش ما : « تۆ نوێژت بۆ چیە ؟ تۆ سەر بە قڕاڵیت . هــەر چـەندە نوێژ بکەی عەینی شتە . هــەر دەچیتە دۆزەخ . »

« هــەر هیچ نەبێ موسلمانم . بکەومە بەر دەستی موسلم عەتاییف لەسەرم باز نادا . یەکســەر بە دیوارەوەم هەڵدەواسێ ، کەواتە لێم گەڕێ دوا نوێژم بکەم ! »

حەسەن دەستی دیلەکەی کردەوە ، گوتی :

« سەیرکە ، تۆ جوێنت بە هێزی سۆڤێتی دەدا ، دەتگوت لێ‌ناگەڕێ موسلمان بڕوا بە خوا بێنن . فەرموو تا حەز دەکەی نوێژ بکە . »

ئینجا حەسەن زۆر لـە نوێژەکەیدا نقووم بوو کــە ســەلامی دایەوە ، دیتی بەندیەکەی هەڵاتوە .

بە تووڕەیی نەڕاندنی : «سوێندم بە خــواو بــە شۆڕش ، دەبێ بتگرمەوە !! »

له کێلگەیەکدا کـــابرای دۆزیبەوە • چۆنی پێ سـپاردرابوو ئاوا گەیاندیە بارەگا •

## ٢ ـ نوێژو گۆرانی :

لـە سالأنی سەرەتای هێزی سۆڤێتیدا حەسەن سکرتێری (سۆڤێت)ی لادێ بوو • مۆری سۆڤێت بە ماوەیەکی کەم سواو لووس بوو چونـــکە حەسەن دەستی لێ نە دەپاراست لە هەموو پارچە کاغەزێکی دەدا •

ئەگـەر مەسەلەیەکی گرنگ‌و ئالۆز بهاتایە گۆڕێ ، دەیـگوت :

« دەبێ پرس بە مـەلاو بە لیژنەی ڕاپەڕاندنی ناوچە بـکەم • • هەولی دا ڕۆژی سانەوە (پشوو) بگۆڕێ‌و لە یەك شەمەوە بیکاتە هەینی• بەبێ کەمتەرخەمی باسی بڕیارەکـــانی لێپرسراوانی ســـۆڤێتی دەکردو پڕۆپاگندەی بۆ دەکردن‌و بـــە جێشی دەگەیاندن • لە هـــەمان کاتیشدا مزگەوتی دێی چاك کردەوە کە لە شەڕی نیشتمانیدا کاول ببوو •

مزگەوت چـاك کرایەوەو ڕۆژی کردنەوەی دەست نیشان کرا • دەق لـەو کاتەدا تیپێکی گەورەی ڕۆشنبیری گەیشتە ناوچەکە نووسەرو هونەرمەند گۆیندەو سازندەی تێدا بوو • تیپەکـە ڕەوانەی ئەو دێیـە کرابوو کە حەسەن خۆی بۆ کردنەوەی مزگەوت ئامادە دەکرد •

میوانەکان بە خێرهاتنێکی گەرمیان کرا • سوارسوارانێ‌و زۆرانێ‌و شەڕەکەڵەبابیان بۆ کردن • ئەوانیش بەش بـە حـالی خۆیان ووتاریان خوێندەوەو باسی پلانی ئابووریان کردو ئاهەنگێکی مۆسیقایان گێڕا •

لـە گـەرمەی ئاهەنگەکەدا بوون (موەززین ـ مەلا) چووە سـەر ترۆپـکی منارەو بانـگی ئیماندارانەی مەغریبی دا • حەسەن هەستایەوەو ڕووی کردە میوانەکان :

« سوپاستان دەکەین کە گەورەتان کردین‌و لە ڕۆژێکی وا پیرۆز هاتن کە ڕۆژی کردنەوەی مزگەوتەکەمانە • سوپاس بۆ ئەم ئاهەنگەتان • ئێستاش ئێمە دەچینە نوێژێ • ئێوەش یان لە ئاهەنگەکەتاندا بەردەوام بن یان بوەستن تا ئێمە دێینەوە یان لەگەڵ ئێمە وەرن ـ کەیفی خۆتانە • »

خەڵکی دێ هەندێك چوونە مزگەوت‌و هەندێك خۆیان دا پاش بۆ ئەوەی گوێ لە گۆرانی تیپەکە رابگرن‌و هەندێکی دیش پێیەکیان کەوتە پاش پێیەکیان کەوتە پێش • ئەندامانی تیپەکە شپرزە بوون بەڵام لەو کاتەدا ئاراشیل‌و عومەرو قازی محەممەدی گۆرانیبێژ لەگەڵ فاتیمەی گۆرانیبێژی مللی (کەگەر) لەسەر ئەو بانە دەرکەوتن کە کرابوە شانۆ • سێ پەپەخاو یەك دەسرۆك • سێ پاندورو یەك تەپڵ • گۆرانیەکی نوێ زرنگایەوەو لە شاخاندا دەنگی دایەوە • گۆرانییەکە لە بارەی لینینەوە بوو ، لە بارەی ئەستێرەی سوورەوە بوو ، لەبارەی داغستانی سوورەوە بوو •

گۆرانیەکەیان گوت • هەندێ جار پاندورو تەپڵیان بەرز دەکردەوە سەر سەریان‌و هەندێ جاریش بە سنگی خۆیانەوە دەنووساندن •

هەندێ لەوانەی نوێژیان دەکرد ، گۆرانییەکە ڕایکێشانە دەرەوە بۆ سەرجادە وهەندێکی دیش بە پێچەوانە ، ئاهەنگیان بە جێ هێشت‌و چوونە مزگەفت •

ئەم چیرۆکە خۆشە تا ئێستاش لە گوندەکەی حەسەندا دەگێردرێتەوە •

« هەمزە تساداساەی باوکیشم لەگەڵ تیپەکەدا بوو کە منی لە

پێش خۆی سواری خانەی زینی کرد بوو ، بەڵام ئەو کاتە هیچ فـــامم نەدەکرد •

مێوانەکان وەکو دیاریيەکی ماڵاوایی گرامافۆنێك‌و بڵندگۆیەکیان بۆ گوندەکە بە جێ هێشت •

**٣ ـ حەسەن‌و بڵندگۆ :**

نازانم بڕیاری کێ بوو ، لەوانەیە هی حەسەن بێ ، بەڵام ئەوەندە دەزانم بڵندگۆکە لـە تەنیشت مزگەوتێ بەسەر ئەستوندەی تەلەفۆنـەوە هەڵواسرابوو • لـە بەیانیـەوە تا ئێواریٚ دەنـگی ڕادیۆ لــــە گوندی دەهات • فیقـەو گۆرانی دیدەوانەکان‌و مۆسیقاو قسەو ژاوەژاوی بــــە شاخەکانی ئەو دەروبەرە دەگەیاند •

هەندێ جـار دەنـگی (موەززین‌ـمەلا) بانگدانی ســـەر منارەو دەنگی ڕادیۆ تێکەڵ دەبوون‌و دەبوە هـەراو هۆریاو هیچی دی •

ڕۆژێکیان دەق ئەو کـاتەی کـە دەبوو موززەین لەسەر منارە بێتە دەرێ • رادیۆ کپ بوو • یەکێ بە مەفتووقی وایەری سەر ئەستوندەکەی بڕی بوو • کـە ئیماندار نوێژیان تەواو کرد حەسەن بەسەر ئەستوندەکە هەڵـگەڕاو وایەرەکەی چاك کردەوەو بڵندگۆکە کەوتەوە بڵاو کردنەوە•

ڕۆژی پاشی دیسان لە هەمـان کاتدا وەستا • کە لە نوێژی جەماعەت بوونەوە حەســـەن یەکسەر چاکی کردەوە • ئەم بەزمە دەوامی کرد • هــەموو ڕۆژێ دووبارە دەبووەوە • کە لە ئەنجامدا دەرکەوت حەسەن خۆی وایەرەکەی خراپ دەکرد هەموو لا سەرسام بوون •

حەســـەن دوو هێــزی تێـدا لە جەنگ‌دابوون : نوێژو گورانی • حەسەن هەوڵی دەدا لەگەڵ یەکتریان بگونجێنێ • لەو باوەڕە دابوو دەبێ

قورعان‌و دەستووری سۆڤیتی لێك نزیك بنەوە • لە مزگەفت کوڕو کچی لە یەك مارە دەکردو پاشان دەیبردنە بارەگای سۆڤیتی لادێ‌و تۆمـــاری دەکردن •

لە لێکۆڵینەوەی سروشتدا ڕێـگای تایبەتی خۆی هەبوو  دەوەستاو تەماشای ئەستێرەیەك یا شاخێـکی دەکرد ــ چـەند سەعاتێك دەوەستا • ئەگـەر بە ئێش بچووبایە شوێنێك داوای لە ژنەکەی دەکرد لە جێگاکەی بوەستێ • هەندێ جار داوای لە منداڵی وەکو ئێمەش دەکرد •

لە قوتابخانەدا باسی تەنە ئاسمانیەکانی بۆ دەکردین • زۆر جـار باسی بومەلەرزەو مانگ گیران‌و ڕۆژگیران‌و ئاوهەستانی بۆ دەکردین‌و بە تامیشی دەخست بەڵام سـەیر لەوەدایە ئـەم چیرۆکـــانەم هیچ لەبیر نەمـاوە •

لە پرۆگرامی دەرس گوتنەوەدا هەموو شتێکی تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو ــ عارەبی‌و ڕووسی‌و لاتینی • پیتی گەورەی عارەبی لەسەر شەپـکە دارێك نەخش دەکردو دەیگوت :

« فێر بن ئـەم پیتـــانە نەخش بـکەن • باوکتان بە درێژایی ژیان نووسین‌و خوێندنەوەیان بەم پیتانە بوو • »

ئینجا پیتی گەورەی ڕووسی نەخش دەکرد ، دەیگوت : « ئەمـــانە بخوێنن ، باوکتان لە تەمەنی عەینەك لە چاوکردندا فێریان بوون • بــە کەلکتان دێن • »

هەندێ جار دەقێکی دەدایێ لەبەری بکەین‌و بە خۆی  بۆ نوێژێ دەچووە مزگەوت • »

کـاتێ پیتە عارەبیەکانی پێ دەگوتین دارێـکی پێ بوو ، ئەگـــەر

نەمانزانیایە ، یا خەمساردیمان بکردایە ، بەو دارە لێی دەداین •

کـە هـاتە سـەر ئەلفوبێی ڕووسی ، دەستی دایە ڕاستەیەك ؟ بەم جۆرە ئێمـە بە دارو ڕاستە فێر بووین •

مـن لەبەر شتێکی‌تر گرفتم بۆ پەیدا بوو • ماڵمان لـە تەنیشت مزگەفتێ بوو • کۆلانێکی تەسکمان بەین بوو • تەنیـا یەك شاقاو دەبوو • ئەو بیرە لەسەری دام کـە لەسەر بانی خـانووی خۆمانەوە بازم دەدایە سەربانی مزگەفت • حەسەن لەسـەر ئەوە لێی دەدام• پاشان مزگەوتەکە داخراو وەکو یانەیەکی دێی لێهات • من لەسەر بازدانی خۆم ڕۆیشتم‌و حەسەنیش لەسـەر لێدانی مـن • باوکم زۆری پێ‌خۆش بوو ، گوتی : «کوڕم ، خۆ تۆ شێرەکلۆ نیت بە بازان بڕۆی • فێر بە بەسەر زەویـدا بڕۆی • »

کـە بوومـە حەفت ساڵان بازدانەکەم لە خۆوە وەستا • دەستم بـە هـات‌و چۆی قوتابخانە کرد بۆ قەڵای خونزاخ • هێشتا کەس خوێندنی تەواو نەکرد بوو کـە قوتابخانەی حەسەن داخرا • حەسەن خۆی چوو لـە گەلەکێلێکدا ئیشی دەکرد • لەگەڵ کەرەستەکانیدا ناردیانە مۆسکۆ بۆ پێشانگەی کشتوکاڵ‌و لەوێ مەدالیایەکی هێنایەوە • لەسەنگەریشـدا دووی دی درابوێ •

پاشی شەڕ ، هەمیشە دەیگوت : لە هەر شوێنێك بووبم ، سـەرم چوو بێ نوێژم نەچووە • وا نەبا چۆن بە سەلامەتی دەهاتمەوە ؟ »

بە شێوەیەکی دی ، حەسەن هەمیشە هەر حەسەنەکەی جاران بوو • ئێستا خەریکە کەرەستە بۆ مێژووی خان سوراکاتی ئاڤار کۆ دەکاتەوە • ئەگەرچی شازیشە ، بەلاّم هێشتا تەبیات بەرزو ئێسك‌پتەوە • هەموو جارێ کە دەچمەوە دێ سەری لێ‌دەدەم • چونکە یەکەمین مامۆستامەو چاکەی

لەسەرمەو ڕێزی لێ‌دەنێم •

دووەمین مامۆستام لــە یادە • ئـەم جــارە لـــە قوتابخانەیەکی ئاسایی بوو • هەمیشە چیــرۆکی درێژی لـــە بارەی خۆیــەوە بۆ دەگێڕاینەوە • ئێستا تێ‌دەگەم کە (مونچاوسین)ی ڕاستەقینەی ئافـاری بوو • هەموو وانەیەکی بەم قسانە دەست پێ‌دەکرد :

« باشە ، منداڵینە ! شتێکتان بۆ بگێڕمەوە کە بەسەر خۆم هاتوە ؟ »

ئێمەش هاوارمـــان دەکرد ، « بــەڵێ ، بۆمان بگێڕەوە ، بۆمـــان بگێڕەوە • »

« جارێکیان ، لــە پردە پەتەکەی قۆیسووی ئافاریدا دەپەڕیمەوە ، وورچێکی زەبەللاح لــەو بەرەوە دەهات ، ئەستەم بوو بتوانین لێك تێ‌بپەڕین • نە وورچەکە ویستی ڕێگەی من بداو نە منیش • بەهێزترین وورچ بوو دیبێتم ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا توانیم بژییە چڕەکەی بـگرم‌و فڕێی دەمە ناو رووبار • »

ئێمەش بەدەم بەشییەوە گوێمان لـــە چیرۆکـە خـەیاڵیەکـەی مامۆستامان گرت •

ـ « حەفتەی رابردوو چوومــە دەرەوە بۆ ســەر زەوی‌و دەســتم بە زەوی کێلان کرد • گاکانم جووتەگایەکی ملەوەز بوون • لە هێکەوە لــە هەوجارکێشان وەستان‌و لە شوێنی خۆیان چەقین • دەبێ چ قەومـا بێ ؟ تەماشام کردو بینیم مار خۆیان لە گاسنەکەم ئالاند بوو ، نۆ بوون ، دوویان بۆ کن دەستم هاتن • هیچ سێ‌و دووم لێ‌نەکرد • دەمانچەکـەم هەڵکێشاو هەمووم کوشتن • ئەوەندە خوێنە ڕژا هەموو زەویەکەی پاراو کردەوە • بە شێنەیی جووتی خۆم تەواو کردو گەڕامەوە ماڵێ • بــەڵام

شتێك نەختێ هەراسانی کردم ـ ئەگـەر زەویەکەم لە باتی گەنم مـاری لێشین بوو ، چ بکەم ؟! »

ـ « پێتان بلێم چۆن ژنەکەی خۆمم هەلگرت ؟ ئەو کاتە بوو کە لە دارستانی (تسونیتن)دا ڕاوی جەردەو ڕێگرانم تا خۆم بە مالی یەکێکیاندا کرد • ئەو جەردەیە لە هەموویان منۆختر بوو • خۆی پێ دەرباز بوو بەلام کچەکەی لەوێ بەجێهێشت • کچە ئەوەندە جوان بوو دەتـگوت مانگە • تەماشام کردو تەماشای کردم • ئەشقی یەك بووین • فڕاندم • لە پشتە خۆم سواری زینم کردو تێم تەقاند • لەناکاو بینیم چـل جـەردەی ترسنۆك بە تەقلەکوت کەوتوونەتە دوام • هەر یەکە خەنجەرێکی بـــە ددانی گرتبوو دەستێکی شمشێرو دەستێـکی دەمانچـــە بوو • ڕووم تێکردن‌و نیشانەم لێ هەلگرتن‌و هەمووم بەردانەوە • سەراپای داغستان ئەم چیرۆکە دەزانێ • »

ڕۆژێکیان ، من‌و باسیری هاوڕێم لە کاتی وانەدا قسەمان دەکرد • مامۆستا بە توندو تیژی پرسی :

« بۆچی باش دانانیشن • ئەوە سعاتەکە بە خۆو بە باسیری باســـی چیتان دەکرد ؟ »

« دەمەتەقێمان بوو • باسیر دەیگوت جارەکەی جەنابت لەسەر زەوی هەشت مارت کوشتوەو من دەمگوت نەء ، هەژدە • »

« بە باسیر بلێ کە تۆ ڕاست دەکەی‌و ئەو بە هەلەدا چوە »

لەو کاتە بە دواوە ، دایك‌و باوکم پێیان سەیر بوو ئەگەر دەرسیشم ئامادە نەکردایە هەر یەکەمین پلەم وەر دەگرت •

مامۆستا خۆی پیاوێکی چاك بوو،بەلام هەرگیز بۆ ماوەیەکی زۆر لەیەك

شوێندا تۆتکەی نەدەگرت • ڕەوانەی گوندە دوورەکان کرا • ناردیانە ( سیلوخ )و ( ئەرادەریخ ) بەڵام لەوێش نەحەوایەوە • کەمێك پێش ئێستا لە یەکێتی نووسەراندا هاتە لامو داوای لێکردم کارێکی بۆ بدۆزمە •

« دەتەوێ چ ئیش بکەی ؟ »

« یاداشتی شەڕم پێ دەنووسرێتەوە • هەموو مارشالەکان برادەرم بوون • هەندێکیان من لە مردن ڕزگارم کردن • »

زۆر مامۆستای جۆر بە جۆرم هەبوو ـ ئەوەی یەکەم ، ئەوەی دووەم ، ئەوەی سێیەم • بەڵام من هەمیشە خاتوو (فیرفاسیلیڤنا)ی ڕووس بە یەکەم مامۆستای ڕاستەقینەی خۆم دەزانم • ئەو بوو کە جوانیی زمانی ڕووسیو گەورەیی ئەدەبی ڕووسی بۆ دەرخستم •

زۆر مامۆستا لە ( ئامۆژگەی مامۆستایانی ئاڤاری )و زۆر پرۆفیسۆر لە مۆسکۆ لە ئامۆژگەی ئەدەبدا هەبوون • مەنسور گەیبەرکۆفو بۆسپلۆف ، محەمەد حەیدەرۆفو گالیسکی ، شامبیناگۆ ، رادنسك ، ئاسموس ، فۆخت ، بۆندی ، ریفۆرماتسکی ، فاسیلی سیمیۆفۆنیچ سیدورین کە تاقیان دەکردمەوە خراپم وەڵام دەداوە • چونکە بە گشتی ڕووسیم باش نەدەزانی • بەڵام وا هەست دەکەم تاقی کردنەوەم هێشتا تەواو نەبوە • هەندێ جار خەونێك دەبینم ـ لە تاقیکردنەوەیەکدا کەوتووم‌و دەبێ ساڵی یەکەمم دووپات بکەمەوە •

لە ساتی هوشیاریدا ، کە کتێبێکی نوێم دەردەچێ ، هەر دەم بەو ئومێدەم بەڵکو بشێ مامۆستایەکم بە سەری ڕابگاتو بیخوێنێتەوە جا لە هەموو تاقیکردنەوەیەکی زمان یان ئەدەبی گریکی زیاتر دەشلەژێم • چ

بکەم ئـەگەر ڕای لە کتێبەکەم نەبــێ ٠ ئەگەر بــە نیوەچڵی واز لــە خوێندنەوەی بێنێو بڵێ : « ڕەسوول خراپی نووسیوە ٠ دەبێ زۆر پەلەی کرد بێ ٠ ٠ » ئەمە سەختترین تاقی کردنەوەی منە ٠

داغستان ! تۆش هەموو جۆرە مامۆستایەکت هەبوو ٠ ( حەسەن )و ( مونجاوسین )ەکانی تایبەتی خۆت هەبوو ٠ هەندێك خۆیان بڕوایــان بەو شتە نەبوو فێریان کردی ٠ هەندێك تەفرەیان دای ، هەندێك خۆیان بە هەڵەدا چوو بوون ٠ بەڵام پاشان مامۆستایەکی گەورەو دادپەروەر ، ئازاو میهرەبان هات ٠ ئەو مامۆستایــە ڕووسیا بــوو ، یەکێتی سۆڤیێــت بوو ، شۆڕش بوو ٠ ژیانێکی نوێ ، قوتابخانەیەکی نــوێ ، کتێبێــکی نوێ ٠ لە ڕۆژگاری کۆندا تاکە کەسێکی لادێ بیتوانیایە شت بخوێنێتەوە مەلا بوو ٠ ئێستا مەلا نەبێ هەموو کەس کتێب دەخوێنێتەوە ٠

گەلێکی بچووك ژیانێکی گەورەی بە دەست هێناوە ٠ زۆر کتێبی دی لە بارەی داغستانەوە دەنووسرێن ٠ دوایان نابڕێ ٠ ئەگەر ئــەو کتێبە زێڕینو جاویدانە تەنیا یەك لاپەڕەی تێدا بێ کە من نووسیبم ، زۆرم هەوەس پێ دێ ٠ من گۆرانی خۆم دەڵێم ، داغستانەکەم ! قبوولی بکە !٠

**داغستان ! هەرچی پێیان بەخشیوم**
**با سەربەرزانە بەشی بکەین ٠**
**میدالیاکانم**
**بە ترۆپکەکانت هەڵدەواسم**
**سروودی مەزنو شیعرت**
**بۆ دەڵێم ٠**
**بەڵام تۆ تەنیا بەتیەی دارستانو**
**تەپلەی ترۆپکی بەفر پۆشم پێ ببەخشە ٠**

هەر ئەوەندە بوو • ئێستا وەختی لێك جودا بوونەوەمانە وەکو گۆتەکە دەڵێ : خوا پێکمان شاد بکاتەوە •

**کۆتایی کتێبی دوەم**

ئەم کتێبە لە زۆر شوێندا نووسراوە ـ لە گوندی تسادا ، لە مۆسکۆ ، لە مەحەچ قەڵا،لە دیلیژان‌و لە زۆر شاری دیش•کەی دەستم بە نووسینەوە کرد ؟ لە بیرم نەماوە • لە ٢٥/ی ئەیلولی ١٩٧٠دا تەواوم کرد •

والســــلام و الکلام •

# فەرهەنگۆك

( ئ )

ئاوقەران : ئاوقووف
ئۆین : فێڵ : حیله

( ب )

بادی : قاپ ، دەفر ، ترار ، جام
بالیف : سەرین ، بالـگ
بوێر : ئازا ، رەشید
بۆسه : کەمین
باقۆ : نەخۆش‌و لاوازو بـێ هێز
بەتیه : زەبوون ، کورك ، عەبای پیاوان
بـوزا : جۆره شەرابێـکی داغستانییه

( پ )

پەسنین : خۆهەڵـکـێشان
پـەز : مەڕ
پێخواس : پـێ خاوس ، پـێ‌پەتی
پت : سەری‌پـەنجه ، ئەوەندەی به دوو پەنجه هەڵـبگیرێ ٠
پەلکەنان : چنکەنان ، لەتەنان
پەرەم به پەرەم : پارچه پارچه
پـەنـگر : پەرەنـگ ، پشکۆ
پووت : سیس ، پـووچ ، بێ‌رووەت
پـەرەنگ : پەنگر ، پشکۆ
پـیل : شەپـۆل

( ت )

تخووب : سنوور
تیز : گاڵته ، قەشمەری
ترار : جام ، بادی : دەفر
تیتاڵ : گێچەڵ
تەزی : سارد : قەرمی
توولەڕێ : باریکه ڕێ

( ج )

جۆگەت : ئەو جۆگەئاوەی لە توانەوەی بەفر پەیدا دەبێ و بەشاخدا دێتە خوارێ ٠

( چ )

چرووك : بێهێزوفەژەن ، نەکامڵ
چوڕەئاو : قومەئاو ، پشکەئاو

( خ )

خاو : کاڵ ، نەگەییو
خەفیە : جاسووس ، دەوسگر ٠

( د )

داری قەڵاشکەری : گزرەدار ، داری سووتان
دووگاڕکی : دووپات

( ر )

ڕەشید : ئازا ، بوێر ، جەسوور
ڕسانەوە : هەڵگەڕانەوە ، یاخیبوون
ڕوومردنەوە : کوژانەوەی ئاگر
ڕۆندك : فرمێسك ، ئەسرین ٠

( ز )

زەغەڵ : تەمبەڵ : تەوەزەل ، تەپو سست

( س )

سەرتوو : سەرتوێژ

( ش )

شاخ : قۆچ
شمەك : جل‌وبەرگ : شت‌ومەك
شێ : نم
شووف : تەوژمی ئاو
شەوتی : سووتاو

( ع )

عەگید : مێرخاس ، گەڕناس ، جوامێر

( ف )

فیـات : نرخ

( ق )

قادرمە : پێبلیکانە

قان : پارچـە

قاوە : گیایەکی سخە کەوشكبوەوە زوو گڕ دەگرێ لەگــەل
ئەستێو بەردەشتێ بەکاردێ

قەمــە : سونــگی

قونپانی : پاشپانی ، پاژنە

قەلەزراو : ترسنۆك ، ترسۆ ·

قوڕقاپ : کڕوکپ بوون

قوڵتەباز : فێڵباز ، بەمەکرودولاب ·

( ك )

کادوو : دووکەڵ

کووکە : هەرا ، دکر ، بەزموکارەسات

کەستەك : خۆڵێك کەئاو لێیدابێو ڕەق بووبێ ·

کەترە : مەڕومالاتی پیروکەنەفتو بێ عدوور

کەرە : فەریکەڕۆن

کرێت : خراپ ، ناشیرین

کۆتەڵ : پەیکەر

کرتوکێل : کشتو کال

کەتن : ئیشی خراپ

کەور : بەردی مەزن

کڕبوون : بێ دەنگ بوون

کەرب : ڕقوقین

( گ )

گۆلم : پڕ بە یەك دەست

گۆلك : گوێرەکە

گیانەلا : ئاوزینگدان ·

گراوی : خۆشەویست
گۆینده گۆرانی‌بێژ
گنخاندن : خۆگنخاندن : خۆ دواخستن ، خۆخافلاندن به شتی
هیچو پووچ ·

( ل )

لەنکاوڕا : لەناکاوەوە ، لە هیکەوە : کتوپڕ
لەگـەن : قاپی‌گەورە

( م )

مەکرۆ : فێڵباز : زۆرزان ·
منۆخ : بێزاخ ، کێرنەهاتی
مشکی : خۆڵەمێش ، بوول ·
مەفتووق : فێڵبازوچەتوون ·

( ن )

نەوێرۆك : ترسنۆك ·

( و )

وندا : ون ، بزر

( هـ )

هنداو : کن · لە هنداودێ : لەکن گوندی ، لەنزیك ·
هەرکەو : ئەو
دەبێو باڵندە لێی دەخۆنەوە ·
هیربار : قاپو قاچاغ ، هەوڕ
هـەوڕ : هیربار ·
هەشتاو : بەهەشتاوی : بە تەنگاوی
هەترە : هەرەتە ، پەرگەندە
هەڵزنا : پێدا هەڵزنا : پێداهەڵگەڕا ·
هەڕفی : ڕووخا ، ڕفی ، هەرەسی‌هێنا ·
هەرێ : بەڵێن ، گفت ·
هێوە : ئەولا
**یەخسیر : دیل**

( ی )

یەخسیر : دیـل

## ڕاستو چــەوت

لە هەندێ شوێندا نیشانەی حەوت یان نوختە پەڕیوە : هەروەکو لە نووسینی ناوی ( نەجمەددین ) لە یەك دوو جێ بە ( نەجموددین ) و ( نەجمەدین ) هاتوەو وشەی ( ئەستەنبول ) لە یەکو دوو شوێندا بـــە (ئەستەمبول) هاتوە · بۆ ئەم هەڵانەو هەموو هەڵەکانی تر داوای بورد دەکەینو حەز دەکەین پێش خوێندنەوە ئەم هەلانەش چاك بکەنەوە :

| لاپەڕەی | دێری | هەڵەکە | ڕاستەکەی |
|---|---|---|---|
| ٨ | ٤ | نا | ناو |
| ١٢ | ٢ | کتبوپڕ | کتوپڕ |
| ٣٢ | ١ | نۆ | تۆ |
| ٤٠ | ٥ | کەف | کــەفو |
| ٤٠ | ٧ | د،وریان | دەوریان |
| ٤٤ | ١٧ | نێوەژەند | تێوەژەند |
| ٥٦ | ١٠ | نایایی | نایابی |
| ٦٦ | ١٨ | ناشگێتەوە | ناشکێتەوە |
| ٧٧ | ١ | ــە | لــە |
| ٨٥ | ٢٢ | دەورییە | دەوریە |
| ١٠٨ | ١٦ | دیدی | دی |
| ١٠٩ | ١٩ | خۆنیاویم | خوێناویم |
| ١١٩ | ١١ | چەوتیاند | چەوتیاندا |
| ١٢٧ | ١٩ | ئونتسول | ئونتسوکول |
| ١٥٠ | ١٤ | گەلیانی | گەلیبیانی |
| ١٦٠ | ٨ | لێپرسلاوی | لێپرسراوی |
| ١٦٠ | ١٢ | ئەخشالوموڤ | ئەفشالوموڤ |
| ١٦٤ | ١ | لەیلایەی | لایلایەی |
| ١٦٨ | ١٩ | جنیۆ | جنێو |
| ١٧١ | ٥ | وولامی | وەلامی |
| ١٧١ | ١٣ | دەشتە | دەشتی |
| ١٩٧ | ١ | دانی | دابی |

| لاپەڕەی | دێڕی | هەڵەکە | ڕاستەکەی |
|---|---|---|---|
| ٢١١ | ٦ | ئیمان | ئیمام |
| ٢٢٢ | ٤ | تۆ | بۆ |
| ٢٣٤ | ١٣ | دانان | دانا |
| ٢٣٦ | ١٥ | دەوریان | دەورەیان |
| ٢٣٨ | ٢٣ | ئێرو | تێرو |
| ٢٤٤ | ٥ | چەنگ | جەنگ |
| ٢٤٩ | ٥ | شەپڕێوەیان | شەپڕێویان |
| ٢٤٩ | ١٦ | ئستا | ئێستا |
| ٢٥٠ | ٢ | ونیوانەی | ونبوانەی |
| ٢٥٢ | ٢٤ | تۆڤاند | تۆقاند |
| ٢٥٣ | ٨ | بێچەوەکان | بێچوەکان |
| ٢٥٩ | ١٩ | کتیبێ | کتێبی |
| ٢٦٨ | ٩ | نیۆ | نێو |
| ٢٦٧ | ١٧ | Dagestan | dagestan |
| ٢٦٨ | ١٦ | ستالسکی | ستالسکی داوای |
| ٢٧٨ | ٢ | بیانووسێ | بیانووسێ |
| ٢٨٤ | ٩ | ئاسماینیەکان | ئاسمانییەکان |



## تێبینی

— ئەم بەرگی دووەمە ساڵی **١٩٧٦** لە گوندی بەحرکە کراوە بە کوردی•

— بەرگی یەکەم ساڵی **١٩٧٩** بڵاوکرایەوە •

— ڕەسووڵ لە نووسینی ئەم کتێبە بەردەوامە تا ئێستا هەندێ بەرگی تریشی لێنووسیوە ، هیوادارم بکەونە بەر دەستو بە کوردی بڵاوبکرێنەوە •

**لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدا**

**ژمارە ( ٦٩٨ )ی ساڵی ١٩٨٥ی دراوەتێ**